

# دیوان

مەلای گەورە
لە دۆسیەی (دیوان)دا



گۆڤارێکی مانگانەی ئەدەبی و ڕۆشنبیریی گشتییە، ناوەندی هەولێری مەکتەبی ڕاگەیاندنی ی.ن.ک دەریدەکات
ژمارە (٢٧) - نابی٢٠٢٣ی زایینی - گەلاوێژی ٢٧٢٣ی کوردی

- وتارەکەی مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی لە چلەی تۆفیق وەهبی
- دوای ئەوەی باش شافاکم ناسی
- مام جەلال هەمووجار دەیگوت تۆ دەبی بە ئەدیب
- چیرۆکی گۆرانی پەری چییە؟



## عومەر فەرهادی:

## زۆرجار فەرەیدوون عەبدولقادرم لەگەڵ خۆم دەبردە ناوەندی ڕۆشنبیریی سۆڤیەتی

# دڵشاد مەریوانی

## ١٩٨٩/٣/١٣ - ١٩٤٧/٣/٢٨



بۆ، بێ لەو چاوە کاڵانەت،
چی شک ئەبەم؟
لێم مەپرسە، بۆچی هاتووم
وەک کۆترێکی لانەواز، تەرە و ماندووم
هاتووم لەناو چاوەکانتا، تێر تێر بنووم
پەنجەکانم تینوویانە،
دەست مەنێ بەڕوویانەوە
با بیانگێڕم،
بە ڕەزی قژی خاوتا و نەڕۆنەوە
تا تێر عەتر ئەخۆنەوە
لەوەتەی تۆم خۆش ویستووە
خەوەکانم سەوز بووە
هەقمە بگریم،
لە چاوەکانما سەوز بووی
بۆ گریانی من نەبووایە
تۆ بەبێ ئاو گەورە ئەبووی؟

# دیوان

سەرنووسەر
سمكۆ عەبدولكەریم

گۆڤارێكی مانگانەی ئەدەبی و ڕۆشنبیریی گشتییە
ناوەندی هەولێری مەكتەبی ڕاگەیاندنی یەكێتیی نیشتمانیی كوردستان دەریدەكات

خاوەن ئیمتیاز
مەسعودی مەلا هەمزە

بەڕێوەبەری نووسین
محەمەد گۆران


## مەلای گەورە

ئێستە، كە ئاوڕ لە ڕابردوو دەدەمەوە، ئەو كاتوساتانەم بیر دێنەوە، كە باوكم بێ پسانەوە و بە یەک هەناسە ئەو شیعرەی مەلای گەورەی لەبەر، بۆ ئەو كەسانە دەخوێندەوە، كە لەچوار دەورییەوە بوون.

*هەتا دەمرم لەبۆ كوردان دەناڵم*
*عیلاجیان چۆن بكەم هاوار بە ماڵم*
*فەقیر و جاهیل و نەخوێندەوارن*
*لەلای نەوعی بەشەر بێ قەدر و خوارن*

هەست دەكەم باوكم، وەک زۆر كەسی دی، كەسێكی بیركراوە و ڕۆشەن فیكر بووە، ئەگەرنا مومكین نەبوو، ئاوەها سەرسام بێت بەو شیعرە و بە مەلای گەورە.

بەراوورد بە ڕابردوو، ئێستە مەلای گەورە زۆری لە بارەوە نووسراوە، بەهۆی ئەوەش، كە هەر لەسەرەتاوە كاسایەتییەكەی، بەهۆی زانست و مەعریفەكەی جێگەی ڕێزی زۆر لە چین و توێژەكان بووە، ناوبانگی بە هەموومان گەیشتووە و كەس نییە، هەر هیچ نەبێت ئاشنای ناوی نەبێت، بەو مانەیاش نا، كە پێمان وابێت كەس دەستی نەهێناوەتە ڕێ و هەمووشتێک لەبەر پێی تەخت بووە، بەڵام جیاوازیی مەلای گەورە لەگەڵ زانایانی دیكەی ئایینی، زیاتر لەوەوە سەرچاوەی گرتووە، كە هەموو ئەوانەی پشتیوانیان كردووە، كەسانی زانستخواز و پێشكەوتنخواز بوونە، بە پێچەوانەشەوە بەشێک لەوانەی خۆیان بە نەیاری زانیوە، كەسانی ئەهلی تەقوا بوونە.

باشترین بەڵگەش بۆ ئەمە، كتێبەكەی مومتاز حەیدەری-یە، كە ساڵی ١٩٧٥ لەسەر مەلای گەورەی نووسیوە، لەوەش واوەتر كەسێكی دیاری وەک دكتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ-یش پێشەكی بۆ نووسیوە و ئەو ڕاستییەی خستووەتەڕوو، كە دەڵێت: (لە باسی هەڵوێستی مەلای گەورە و ئایندا، تەنانەت لە باسی حاجی قادر و ئایندا زۆر كەس هەوڵی ئەوە دەدەن كە ئەم دوو شاعیرە بخەنە سەر هێڵێک كە هێڵی بەرامبەر بێ ئاینی بێت، یا ڕووەو مەتریالیزمی-یان دەبەن)

بەدەنگەوە هاتن و پشتیوانی كەسانی چەپ لە مەلای گەورە لەو سەردەمە، ڕەنگە هۆكارێک بووبێت بۆ ئەوانی دیكە، تا دونیای لێ وێكبێننەوە، بەڵام دواجار ڕاستیی و ڕاستگۆیی هەر سەركەوتن بەدەست دێنێ.

هەر ئەمەش هۆكارە بۆ ئەوەی دوای هەشتا ساڵ لە كۆچی دوایی بلیمەتی گەورە، مەلای گەورەی كۆیی، نەک هەر نەتوانین لە بیری بكەین، بەڵكوو دەبێ بۆ هەمیشەش یادی بكەینەوە و ئاوڕ لە بیر و هەڵوێستە جوانەكانی بدەینەوە، بۆ ئەوەی بیری نەوەی نوێشی بخەینەوە، كە ڕۆژگارێک كورد خاوەنی وەها مرۆڤێک بووە.

سەرنووسەر


ژمارە (٣٧) ساڵی ٢٠٢٣ زایینی - گەلاوێژی ٢٧٢٣ كوردی

هەولێر - شەقامی ١٠٠ مەتری نزیک كۆلێژی دەرمانسازی
govaridiwan@gmail.com
(گۆڤاری دیوان) لەتیلیگرام
تیراژ: (١٠٠٠) دانە

دیزاین: ئاسۆ حەسەن ئەحمەد (٠٧٥٠٤٤٧١٨٢١)
سەرپەرشتیاری چاپ: مەهدی ئەحمەد حوسێن (٠٧٥٠٤٥٥٠٢١٣)
چاپخانەی ڕۆژهەڵات - هەولێر (٠٧٥٠٤٤٩٥٦٥٤ - ٠٧٧٠٤٤٩٥٦٥٤)

**• دۆسیە: (مەلای گەورەی کۆیە)**



**• مێژوو:**



**• ئەدەب:**



**• ڕۆشنبیریی گشتیی:**



**• دیدار:**



**• هونەر:**



**• خوێندنەوەی کتێب:**



**• لەبیری بیرەوەری:**



**• وێستگەی دیوان:**



**• لاپەرە ١٤٤:**

# دۆسیە

# مەلای گەورەی کۆیە

## ١٨٧٦ - ١٩٤٣/١٠/١٢

به ڕیشی پان و پڕ لە ئەسپێ
بناغەی ئیشی کوردان چۆن دەچەسپێ
بە کەشکۆڵ و سواڵ و فەقر و زیللەت
محاڵە کاکی خۆم تشکیلی دەوڵەت
هەموو بێ هۆش و بێ گۆش و نەزانن
ئیدارەی موڵک و دەوڵەت چۆن ئەزانن
ئومێدو قەت نەبێ کورد کە ببێتە دەوڵەت
لەبەدبەختی ئەوێستا بۆتە سێ لەت



# مەلای گەورەی کۆیی

## لە نێوان نوێگەریی و پرسی چاکسازیی کۆمەڵایەتیدا

ناوی محەمەدی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی کاک ئەسعەدی جەلیی کۆییە، کونیەکەی ئەبوو مەسعوودە، نازناوی کەمالەدینە. لە سەرەتای ژیانیەوە بە کاک حەمەد ناوبانگی دەرکردبوو، دوای کۆچی دوایی باوکی، سەرۆکایەتیی زانایانی ناوچەکەی خۆیانی گرتووەتە ئەستۆ، بۆیە بە مەلای گەورە شۆرەتی پەیاکرد. تا وای لێهات بەم ناوبانگەی لەناوی خۆی زیاتر دەناسرایەوە، هەر وەک ناو و شۆرەتی بە جەنابی مەلاش بڵاوبوو.

لە سەرەتای مانگی ڕەجەبی ساڵی ١٢٩٣ی کۆچی، بەرانبەر ساڵی ١٨٧٦ ی زایینیی، لە شاری کۆیە لە دایک بووە. باووباپیرانی هەموو زانا و دانا و شارەزا و بنەماڵەیەکی ناوداری ناوچەکە بوونە و خزمەتێکی زۆری زانست و ڕۆشنبیری و ئایینیان کردووە.

### *دەرگەی لەزەتم لەسەر خۆ بەست*
### *چی عولووم هەبوو، بە دەستم خست*

مەلای گەورە لە ساڵی ١٣٠٣ی کۆچیی، واتە لە تەمەنی دە ساڵییدا دەستی بە خوێندن و فێربوون کردووە و سەرەتا بە خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز و چەند نامیلکەیەکی فارسی دەستی پێکردووە. پاش ئەوە دەستی بە خوێندنی زانستی (نحو، صرف و فقه) لای موستەعیدەکانی باوکی کردووە. لای چەندین مامۆستا خوێندوویەتی.

مامۆستایەک لە هەموو ئەوانی دی زیاتر کاریگەریی بەسەریەوە هەبووبێت، مامۆستا مەلا محەمەد ئەمینی کونەفلووسەییە، کە مەلای گەورە خۆی لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت: (ئەو دلمی کردەوە، تنی گەیاندم و وەک پێویست دەرسی دام)

گەلێ لە مەلای ناودار لەبەر دەستیدا پێگەیشتوون و ئیجازەی مەلایەتییان وەرگرتووە، لە هەرە گەورەکانیان (مەلا فەتحوڵڵای هەرتەل، مەلا سدیق نازەنینی، مەلا مەعصوم خدر هەورامی، مەلا ئەبوبەکر، مەلا سادقی مەلا ئەحمەد، مەلا سلێمان ئاوماڵی، مەلا قادری کانی دەربەندی، مەلا سەیید عەبدولڕەحمانی ئەتهەریی زەنگینەریی و مەلا حەمید عەسکەری .....هتد)

### بنەچەی بنەماڵەی جەلیزادە:

بنەماڵەی جەلیزادە لە بنەچەوە بۆ سور (شێخ ئیبراهیم)ی جەزیری دەگەڕێتەوە، کە ئەو خانەوادەیە لە جەزیر و بۆتانەوە لەبەر هۆیەکی نادیار ڕووە و کوردستانی عێراق گەشتیان کردووە. دواتر دێنە گوندی (بێگەلاس) لە ناوچەی پشدەر، دواتر بەشێکیان هاتوون بۆ گوندی (شیواشان) لە دەڤەری ڕانیە، باپیرە هەرە گەورەیان (محەمەد) کە بە مەلازادەی شیواشان بەناوبانگە، دەگێڕنەوە، زۆرینەی ژیانی خۆی لە ئەشکەوتێکی نزیکی شیواشان بە عیبادات بردووەتە سەر، گۆیا لە زۆر باردا بە شیری بزنە کێوی گوزەراندوویەتی. یازدە کوڕی هەبوو، کوڕی هەرە گەورەی (مەلا عەبدوڵڵا) بووە، دەچێتە گوندی (جەلی) کە دەکەوێتە دەڤەری خۆشناوەتی، لەوساوە ئەم بنەماڵەیە بە جەلیزادە ناودەبرێن. بەم چەشنە بڵاودەبنەوە تاکو لە سەردەمی (مەلا عەبدولڕەحمان)ی باپیرە گەورەیاندا کاتێک (عەبدولڕەحمان)ی پاشای بابان مزگەوت و مەدرەسەی لە قەبەڵ دەکات و بەراتی چەند گوندێکی بەو مزگەوتەوە دەبەستێتەوە، بۆیە وراتی (کۆیە) دەکەنە مەڵبەندی خۆیان و لێی جێگیر دەبن.

مەلا عەبدولڕەحمان لە ساڵی ١٢١٧ک ماڵاوایی لە ژیان دەکات. دوای مەلا عەبدولڕەحمان کوڕە گەورەکەی (واتق بیللا مەلا عەبدوڵڵا)ی جەلیزادە



دلزار حەسەن



دەبێتە جێگری باوکی، کە خەلیفەی مەولانا خالید بووە، لە ساڵی ١٢٤٦ک بە تاعوون گیان لەدەست دەدات. کورە گەورەکەی، کە ناوی (ئەسعەد)ە لە ساڵی ١٨١١ ز لە دایک بووە، دواتر بە حاجی مەلا ئەسعەدی جەلیزادە ناسراوە، محەمەد پاشای والی ڕواندز، کە ئەوکات لە (کۆیە) بووە لە شوێنی باوکی دای دەنێتەوە، حاجی مەلا ئەسعەد لە ساڵی ١٨٤٤ ز بۆ خوێندن دەچێتە شام و لای (شێخ عەبدولڕحمان کەزبەری) ئیجازەی (حەدیس و فقە و تەفسیر) وەردەگرێ و بۆ مەککە دەچێت و پاشان بۆ کۆیە دەگەڕێتەوە، دواتر لای (مەلا عەبدولڕەحمان)ی ڕۆژبەیانی لە بەغدا ئیجازەی گشتیی لە زانستەکانی ئیسلامی وەردەگرێ.

حاجی مەلا ئەسعەد لە ساڵی ١٢٨٨ ک بۆ جاری دووەم دەچێتەوە حەج، کورە گەورەکەی (عەبدوڵلا) کە لە ساڵی ١٨٣٥ ز لە دایک بووە، دواتر بە حاجی مەلا عەبدوڵلای جەلیزادە ناسراوبووە، لەگەڵیدا دەچێت بۆ حەج، دوای بەجێهێنانی مەراسیمی حەج، حاجی مەلا ئەسعەد هەر لە مەککە دەمێنێتەوە، لە ساڵی ١٢٨٩ ک - ١٨٧٢ ز هەر لە وێش کۆچی دوایی دەکات. حاجی مەلا عەبدوڵلا دوای مەرگی باوکی دێتەوە کۆیە و لە شوێنی باوکی دادەنیشێت. حاجی مەلا عەبدوڵلا سێ کوڕی دەبێت بە ناوەکانی (بەهادین، محەمەد، نورەدین) محەمەد کە بە مەلای گەورە ناسراوە دوای کۆچی دوایی باوکی حاجی مەلا عەبدوڵلا لە ساڵی ١٣٢٦ک/١٩٠٨ز جێگەی ئەو دەگرێتەوە

(مامۆستای کۆیی پیاوێکی زۆر پێتۆڵ و خوناس و خواناس گەلناس و وریا و ژیر و دڵسۆزێکی ڕاستەقینەی ئایینی پیرۆزی ئیسلام و خەمخۆرێکی گەلی کورد و ڕۆڵەیەکی هەڵکەوتووی کوردستان بووە).

ئەو، هونەرمەند، زانا، مەلا و رامیار بووە. وانەبێژ، پێشنوێژ، وتاربێژ، نووسەر، وێژەوان و دێژەوان «فقیە» بووە، ڕاڤەدەر «مفسر» بووە، ڕاست وێژ و دڵسۆز و خەمخۆر بووە، کوڕێکی مەرد و مەردێکی کورد و نەترس بووە، بزوێنەری هەستی دڵان و ڕاپەڕێنەری خەولێکەوتووان بووە)

لە تەمەنی بیست ساڵیدا ئیجازەی زانستی مەلایەتی لەباوکی وەرگرتووە و هەر لەو تەمەنەدا جگە لە(فتوا) ئەرکەکانی گوتاری هەینی و وانەی ئایینیی و سەرپەرشتی هەردوو مزگەوتی مەلا ئەسعەدی جەلیزادە و مزگەوتی گەورەی گرتوتە ئەستۆ، لەساڵانی ١٩١٢ تا ١٩٢٨ چەندین کاری ڕەسمی حکومی سەرکەوتووانە ڕاپەڕاندووە. لەساڵی ١٩١٢ کراوە بەموفتی کۆیە و لەساڵی ١٩١٩ کراوە بەقازی و لەساڵی ١٩٢٤ هەڵبژێردراوە بۆ ئەنجوومەنی دامەزراندنی عێراق و شێلگیرانە پێداگری لەسەرمافەکانی نەتەوەی کورد کردووە. دواتر جارێکی دی کراوە بەقازی وراتی کۆیە و لەساڵی ١٩٢٨ وازی لەکاری میری هێناوە و خۆی تەرخانکردووە بۆ هۆنینەوەی شیعر و وانەی ئایینیی و نووسینی کتێب، بەجۆرێک وەک دەڵێن لە شەو و ڕۆژێکدا بیست و یەک سەعات خەریکی نووسین و خوێندنەوە و وانە گوتنەوە بووە، لەو ماوەیەشدا خەرمانێک بەرهەمی بە پێز و پێویستی ئامادەکردووە، کە جگە لە چواردە کتێب و نامیلکە بەزمانی عەرەبیی، شەش بەرهەمیشی بەزمانی کوردیی داناوە، کە بریتین لە (عەقیدەی ئیسلام،



**«سەرەتای کاری نووسین لای مەلای گەورە، بۆ ساڵی ١٩٢٨ دەگەڕێتەوە، بەتایبەتی ئەو کاتەی، کە لە بەڕێوەبردنی کاری حکوومی دوور دەکەوێتەوە»**



مجدد، فرِی فرِی قەل فرِی، تەفسیری قورئانی پیرۆز و دیوانی شیعر) شیعرەکانی بەسەر چەندین لایەنی ئایینی، کوردایەتی، کۆمەڵایەتی، مافی ژنان و منداڵان دابەش دەبن

مەلای گەورە بەرهەم و کارەکانی دابەشی سەر (شەش) تەوەردەبن:

- خوێندن و مەلایەتی و نووسین .
- نیشتمانپەروەریی و بەرگریکردن لە کورد.
- ئەو کتێبانەی، کە کاریگەرییان لەسەر داناوە.
- چاکسازیی کۆمەڵایەتی بە ڕێگەی شیعر.
- مافەکانی ئافرەت.
- مەزهەب و فتوا و تێگەیشتنی بۆ ئاییندارێی.

> **ناتوانرێ کاریگەرییەکانی محەمەد عەبدە لەسەر تێڕوانینە دژەکانی بۆ ئینگلیز، لای مەلا گەورە بشاردرێتەوە**

## خوێندن و مەلایەتی و نووسین

مەلای گەورە وەک باقی مامۆستایانی ئایینی دیکە، سەرگوزەشتە و چیرۆکی تایبەت بە خۆی هەیە، بەتایبەتی لە بواری خوێندن و فەقییاتی، تا وەرگرتنی ئیجازەی مەلایەتی. هەر یەکێک لە بەسەرهاتەکانیشی بۆ ئێمە هۆیەکە تا لە نزیکەوە ئاشنای توانا، زیرەکی، خولیا و حەزی ئەو زاتە و شارەزای چۆنییەتی خوێندن و بەرزکردنەوەی ئاستی زانستیی و زانیاریی ببین. مامۆستایان و مەلایانی کورد ڕاهاتوون لە مزگەوتەکان و لە شار و شارۆچکەکانی کوردستان، بگەڕێن و زانستی شەرعی وەرگرن. تەنانەت هەیانبووە چووەتە وڵاتان و بە هەزاران میلی بڕیوە بۆ وەرگرتنی زانست و زانیاریی، تا ئیجازەیەک لە بوارێکی شەرعی و زانستی ئیسلامی وەرگرێت.



نموونەیەکی دەستنووسەکانی مەلای گەورە

بنەماڵەی جەلیزادە، یەکێک بووینە لەو بنەماڵە مێرخاسانەی، هەموو ژیانیان بۆ ئیسلام و وەرگرتنی زانست و خزمەتکردنی ئیسلام تەرخانکردووە. مەلای گەورە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: باوکم دەیفەرموو بە منداڵی زۆر مەیلی خوێندنم نەبووە، چەند موستەعیدیان پێکردم فائیدەی نەبوو ئاخیری مەلا محەمەدئەمین-ی کونەفلووسەیی گوتی: بیدەنە من وادەکەم بخوێنێت، کە چوومە کنی پێش دەرس دەیگوت: حەزت لە چییە کەلایانی، جگانی دەمگوت نا. وەرەز دەبوو ئەوجا دەیگوت: کاکە دەرسەکەی نەخوێنین؟ دەمگوت با.

(بەینەکی لە کن موستەعیدانی باوکی دەخوێنێ، ئاخیری دێتە خزمەتِ باوکی و دەڵێ ئەگەر جەنابت دەرسم پێ دەڵێی باشە، دەنا ناخوێنم، فەرمووی عەرزی بابم کرد ئەمن ناچمە فەقییاتی لە مزگەوتی گەورە دابنیشین نایەمەوە ماڵیش هەتا تەحصیل تەواو دەکەم بە گەریدەیی و نانی سواڵی نابمە مەلا)

دوای خوێندن و دەورکردن توانا و دانایی بۆ باوکی دەردەکەوێ، تا ئاستێک پلەی زانستی بەرز دەبێت باوکی ڕێزی تایبەتی بۆ دادەنێت، لەسەر دەستی باوکی ئیجازە وەردەگرێت و لەبەردەمی باوکیشی ئیجازەی داوەتە ئەو فەقییانەی، کە دەرسیان لەلا خوێندبییە. دوای وەفاتی باوکی لە ساڵی ١٣٢٦ ک، لە جێگەی ئەو دانیشت و لەقەبی مەلای گەورایەتی و ڕئیسی مەلایەتی وەرگرت (

دوابەدوای وەرگرتنی پلەی زانستیی و ئیجازەی مەلایەتی، مەلای گەورە لە مزگەوت گوتاری دەدا. لە بارەی گوتاربێژییەوە سەرگوزەشتەی زۆر هەن، کە دەلالەت لە زانایی و توانای گوتاردانی ئەو دەگەیەنێت. مامۆستا مەسعوود محەمەد لە بارەی گوتاردانی مەلای گەورەی باوکی دەنووسێت: باوکم خەتیب بوو. بەڵام خەتیبێک، کە بتوانی بە کوردی و عەرەبی و تورکی و

فارسی تا حەزبکات لەسەر بابەت بدوێ)

مـەلای گـەورە زیاتر لە بیست بەرهەمی وەک کتێب و نامیلکە و تـەفسیر، پێشکـەش بە کتێبخانەی کوردیی کردووە. بەداخەوە بەشێکی کەمیان نەبێت ئـەوانی دیکە چاپ نـەکراون و هەر بەدەستنووسی ماونەتەوە. دەتوانین بڵێین سەرەتای کاری نووسین لای مەلای گەورە، بۆ ساڵی ١٩٢٨ دەگەڕێتەوە، بەتایبەتی ئەو کاتەی، لە بەڕێوەبردنی کاری حکوومی دوور دەکەوێتەوە. هـەموو کاتی خـۆی بـۆ خـوێندنـەوە و دەرس گوتنـەوە و نووسین و دانـانی کتێب تەرخان دەکـات. بە جۆرێک لە شەو و ڕۆژێکدا شانزە کاتژمێر خەریکی ئەوە بووە.

لە بارەی پاراستنی ئەو ئەرشیفە دەوڵەمەندەی مـەلای گـەورە مەسعوود محەمەد دەنووسێت: (دەبێ ئەوە بڵێم ئەگەر ئەرکی دەیـان ساڵی بێ وچانی خوشکم، یا نەجیبە نەبا بەشی هـەرە گرنگی کەلەپووری کۆچکردووان کە لای ئێمە ماوە هەموو دەفەوتا(

## هەندێک لە دانراوەکانی مەلای گەورە:

تەفسیری قورئانی پیرۆز: بە زمانی کوردیی، عـەقیدەی ئیسلامی، موجـەدید، نـوێ کـەرەوە، حیکایەت خەون و کەرامەت.

## بە زمانی عەرەبیش ئەو کتێبانەی چاپکراوە:

لمقصول في علم الأصول، الكلام الجديد، القائيد في العقائد، رسالة في حقيقة الاسلام، رسالة في حقيقة الايمان، المعجزات والكراما، خراب العالم، الوسيلة، حواش على جمع الجو، غايتي وأملي في علمي وعملي، الحدس سلم الارتقاء، الاله والطبيعة والعقل والنـبوة، المشاهد على طـراز الموقف والمقاصد.

## نیشتمانپەروەریی و بەرگریکردن لە کورد

مەلای گەورە یەکێکە لەو زانا و دانایانەی کورد، کە بە شیعر و هەڵوێست و وتارەکانی داکۆکی لە ماف و داخوازییەکانی کورد کردووە وەک دەڵێت:

***هەتا دەمرم لە بۆ کوردان دەناڵم***
***عیلاجیان چۆن بکەم هاوار بە ماڵم***



***دەبێ من کەیفی چیم بە دنیا بێ***
***قەومی من وا ڕەزیل و ڕیسوا بێ***
***بێ کەس و بێ دەر و فەقیر و هەژار***
***بێ سەر و سەرفراز و بێ سەردار***
***ئەوێ ڕێگای لە کوردەکان گرتێ***
***لەعنەتی خوا لە ئەلحەد و گۆڕێ***

ئـەو هەستەیشی لـەژێر ڕۆشنـایی ئـەو ئایەتە پیرۆزەیە.

(يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا ۚ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ ۚ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ)

«ئەی خەڵکینە، ئێوەمان لە نێر و مێ دروست کـردووە، بـە چـەند نـەتـەوە و خێڵ و هۆزێک دەوردراون، بۆ ئەوەی یەکتر بناسن، ڕێزدارترتان لای خودا، خۆپارێزەکانن، خودا زانا و لێزانە».

مەلای گەورە و تەواوی زانایان و مامۆستایانی ئایینی داکـۆکیـان لـە نـەتـەوە و میللەتەکەیان کــردووە، کـوردیـش وەک نـەتـەوەیـەک، لەنێو ئـەو جیهانە پـان و بـەرینـەدا خـاوەن مـافـە، بۆ ئەو مەبەستەیش هەمیشە داکۆکیکاری ماف و داخوازییەکانی بـووە. ئـەو هـەستە نەتەوییەی مـەلای گـەورە دەگەڕێتەوە بۆ مامەڵەی خراپی




بەرگی یەکێک لە دەستنووسەکانی مەلای گەورە

> ***مەلای گەورە، بە ئاگاداریی و بەشداریی ئینگلیزەکان، بەشداریی دروستکردنی دەوڵەتی تازەی عێراق دەکات، ئەی لە پای چی دواتر دژایەتی ئینگلیز دەکات؟***



دەسەڵاتداری عوسمانیی لە ناوچەکە و بێبەش کردنی کورد لە مافە مرۆییەکانی، جگە لەوەیش بەرپەچدانەوەی سیاسەتە دوژمنکارەکانی بریتانی و فەرەنسییەکان بووە، کە خاکی کوردیان دابەشکردووە.

لێرەدا ناتوانرێ کاریگەرییەکانی محەمەد عەبدە لەسەر تێڕوانینە دژەکانی بۆ ئینگلیز لای مەلا گەورە بشاردرێتەوە، چونکە لە پەرتووکی (العروة الوثقی) عەبدە زۆر بە توندی دژی داگیرکردنی بریتانیا و ئینگلیز دەوەستێتەوە چەندان وتار لە دژیان لەو کتێبە بڵاودەکاتەوە، کە لای من بۆتە پرسیار، من باسی عەمەلییەی دژکارییەکانی مەلای گەورە ناکەم بەرانبەر بە عوسمانییەکان، کە خۆی لەگەڵیاندا ژیاوە و هەڵسووکەوتە خراپەکانی بینیوون، بەڵام مەلای گەورە بە ئاگاداریی و بەشداریی ئینگلیزەکان، بەشداری دروستکردنی دەوڵەتی تازەی عێراق دەکات، ئەی لە پای چی دواتر دژایەتی ئینگلیز دەکات؟

پێم وایە دژایەتی مەلای گەورە بۆ ئینگلیز، جگە لە هەستە نەتەوەییەکەی، بەشێکیشی بۆ هەڵویستی محەمەد عەبدە دەگەڕێتەوە، کە دژی سیاسەتەکانی ئینگلیز بووە لە ناوچەکەدا، بۆیە دەبێ ئەو پرسیارە لەخۆمان بکەین، مەلای گەورە خۆی بە بەشێک لە داکۆکیکارانی فیکری محەمەد عەبدە دەزانێت، لەگەڵ ئەوەیشدا سەرسامە بە شارستانییەتی خۆراوایی و بە ئاشکرا ناوی ئەورووپا و ئەمریکا و پێشکەوتنەکانیان دەهێنێت.

> **«دژایەتی مەلای گەورە بۆ ئینگلیز، جگە لە هەستە نەتەوەییەکەی، بەشێکیشی بۆ هەڵویستی محەمەد عەبدە دەگەڕێتەوە، کە دژی سیاسەتەکانی ئینگلیز بووە لە ناوچەکەدا»**

ئەی بۆچی دژی ئەو ڕەوتە دەوەستێتەوە لەکاتێکدا خۆراوا هیچ چارەیەکی دیکەی نەبووە بۆهاتنە نێو خاکی موسڵمانان، گەر بەو ڕێگەیە نەبووایە؟ لێرەدا تێگەیشتنمان بۆ هەڵوێستەکانی مەلای گەورە بۆ دەردەکەوێ، کە بەمانای وشە کوردانە و موسڵمانانە بیری کردووەتەوە، نەک وەک ناسیۆنالیستێکی ڕووت، ویستوویەتی لەو ڕێگەیەوە هەم ئامۆژکاریی کورد بکات لەسەر ئەوەی بۆ پێش ناکەوێت، لەهەمان کاتدا زیگرییشی لە داگیرکردن و دووژمنان کردووە و ڕەخنەی لێگرتوون، ئەوەیشی وەک ئەرکێکی ئینسانی و نەتەوەیی و ئایینیی سەیرکردووە.

کە مەجلیسی تەئسیسی داندرا جەنابی مەلای گەورە لە ساڵی ١٩٢٤ بووە ئەندام و لەسەر میللەتی کورد زۆر بەجواب بوو، فەرمووی ڕۆژەکی لە مەجلیس قسەم دەکرد، جەعفەر پاشای عەسکەری ڕەئیس وزەرا بوو، بە کوردی بانگی کردم گوتی: توخوا ئەگەر دەستەکانتم نەدەیتێ ماچی بکەم بەخوای قسەکانتم پێخۆش بوو. مەلای گەورە یەک لەو نائیبانە بوو، کە معاهدەی عێراقی و بریتانی مۆر نەکرد، ڕۆژەکی پیاوێکی بەغدایی عەرزی دەکات سبەینێ بەسەر مەجلیس دادەدەین ئاگات لە خۆبی، فەرمووی سبەینێ چوومە مەجلیسی (عەبدول موحسین سەعدون) ڕەئیس مەجلیس بوو دەستی گرتم، گوتی: لێ قەت چارەکی نایە هۆدەی ڕیئاسەت، گوتم: چی؟ فەرموو بابچین چووینە ژووری دانیشتین شێخ حەبیبی تاڵەبانی نائیبی کەرکووک و چەند کوردێکیش هاتن، هەرهەندەمان زانی میللەت دەورەی بینایەی مەجلیسی دا عەسکەریش هات دەورەی میللەتی دا، تەقە و هەرا پەیدا بوو.

بە کوردی بە کوردەکانم گوت: لە جێی خۆتان مەبزون و مەرد بن، لەو پەنچەرانە گوللە نامان گرێتەوە، مەڕۆنە دەرێ با شەقی میللەتتان پێ نەکەوێ، بچنە دەرێ حەیاتان دەچێ. چونکی هەندەک نائیب چووبوونە دەرێ میللەت زۆری تێ هەڵدابوون، هاتبوونەوە نێو بینایەی مەجلیس گوێیان لە دەنگوباس و قیژەی بووبوو. جەنابی مەلا لەگەڵ موحسین سەعدون گفتوگۆ دەکات هیچ تێک ناچێت. موحسین هەڵدەستێ دەست دەداتە دەستی جەنابی مەلای و دەڵێ: بەخوای بەغیرەتی، جەنابی مەلای دەفەرمووی، کەسێ کوردبێ، موسڵمان بێ، دەبێ بە غیرەت بێ.

ماوەی کۆتایی ژیانیشی وەک دەگێڕنەوە بێ ئومێدی زۆری پێوە دیار بووە، گوتوویەتی: هیچ سوودی نییە. دیارە بێ ئومێدیەکەشی لە کورد و ئەو دەوڵەتە نوێیە بووە، کە لە عێراق دروست کرابوو، ئەو لە مەجلیسی دامەزراندن دابوو، بەڵام دواتر بێ ئومێد بوو لەوەی، کە هیچ مافی بە کورد نەدا.

لەبارەی مەلای گەورە زۆر نووسراوە و زۆر



گوتراوە، بەڵام ئایا هەموو ئەم شتانەی لەسەر مەلای گەورە گوتراون شایستەی مەلای گەورەن؟ یاخود تەنیا باسێکە و بەس؟ یاخود ورێنەیە و هەر لێی تێنەگەییوین؟ ئەو نوێگەری و ئیجتیهاداتانە چین، کە مەلای گەورە بێ ترس رای خۆی لەسەر گوتوون؟ ئایا مەلای گەورە خۆی دروستکرد، یاخود زەمانە و دەورووبەر کاریگەر بوون بۆ هاتنە کایەی؟ تۆ بڵێیت هۆکار چی بووبێت کە مەلای گەورە جیاواز بێت لە مەلاکانی سەردەمی خۆی؟

(سەردەمی مەلای گەورە سەردەمی رووخانی دەوڵەتی عوسمانیی بوو، واتە کۆتایی دەوڵەتی عوسمانیی بوو، تێکەڵبوون لەگەڵ شارستانیەتی ئەوروپا، وڵاتە ئیسلامییەکان بە خۆیاندا دەهاتنەوە، زەمەنێکی وا بووە مەلا و زانا گەورەکانی ئیسلامی بەخۆیاندا بچنەوە، کە سەردەمی عەبدولرەحمان کەواکیبی و محەمەد عەبدە و جەمالەدینی ئەفغانی بوو، لە گۆمەڵگەی کوردەواریدا ئەوکات لە هەموویان زیاتر، کە بەدەرکەوتووە مەلای گەورە بووە. مەلای گەورەش هەمان ئەو رەوتەی گرتە بەر، من ناڵێم لە ژێر کاریگەریی ئەو زانایانە بووە. کاتی خۆی دەیانگوت عوسمانییەکان تا رۆژی قیامەت حوکم دەکەن و خەلافەتی پێغەمبەرن، دەرچوو ئەمانە هیچ وانەبوون و بەرە و رووخان دەرۆیشتن و خۆیان روویان لە تورکایەتی و فیکری رۆژاوایی بوو، ئیدی گەلانی ژێر دەستی عوسمانیش بەخۆیاندا هاتنەوە. کەسایەتی مەلای گەورەش لێرەدا وەک کەسێکی زۆر تایبەت لە کوردستان هەڵکەوت.

مەلای گەورە تەواو لە عوسمانییەکان نائومێد ببوو، بەلادەر لە ئایین وەسفی کردوون، بەڵام زۆریش دڵخۆش نەبووە، بە بەدیلەکەی، کە بریتانیایە. مەلای گەورە سەرەتا با، بەڵام دواتر چارەی ئینگلیزی نەویستووە. لە نامەکەیدا بۆ یاریدەدەری ئەفسەری سیاسیی بریتانیا بە ئومێدەوە دەنوارێتە حوکمی بریتانی لە ناوچەکە، پێیوایە خۆشگوزەرانی دەوێت بۆ خەڵک. داوایان لێ دەکات دادگەربن و هەموو خواستەکانی کورد بهێننە دی. داوای دانانی حاکمێک دەکات لە ناوخۆی کورد، یان حاکمێکی ئینگلیز، یان بێگانە بەسەر کوردا بچەسپێنن. دەشڵێت ئەگەر حکوومەتی بریتانی دەستی یارمەتی بۆ ئەو گەلە درێژ نەکات هەتا هەتایە دەچەوسێتەوە.

دوای ئەو یاریدەدەری ئەفسەری سیاسیی بریتانی، نامەیەک بۆ ئەفسەری سیاسیی بریتانی لە هەولێر دەنێرێت و باس لەوە دەکات، کە سەردانی مەلا محەمەدی کۆیی کردووە، سەبارەت بە گەرانەوەی دەسەلاتی عوسمانییەکان بۆ کوردستان زۆر نیگەرانە، ئایشارێتەوە، کە ئاکاری تورکەکان دژ بەو ئاکارانەیە، کە لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە.

بۆ حکومداری کوردستانیش پێشنیازی (حەمدی بەگ)ی بابانی کردووە، کە کوردێکی رۆشنبیر و کوردپەروەرە.

مەلای گەورە هەر بەتەنیا لە بوارێکدا کۆششی نەکردووە و لەیەک مەیداندا خزمەتی نەتەوەکەی نەکردووە، بەڵکو مەلایەکی زانا و شاعیرێکی نیشتمانپەروەر بووە، لە سەرجەم بوارەکانی کوردایەتی، کۆمەلایەتی، داکۆکیکردن لە مافی ئافرەت، هەژاران، هاوکاریکردنی خوێندنی زانستی و دادپەروەریدا جێ پەنجەی دیاربووە. کەسێک بووە لە دونیا، لە سەردەم و دەووروبەرەکەی بە ئاگابووە.

> **مەلای گەورە خۆی بە بەشێک لە داکۆکیکارانی فیکری محەمەد عەبدە دەزانێت، لەگەڵ ئەوەیشدا سەرسامە بە شارستانییەتی خۆراوایی**

### ئەو کتێبانەی، کە کاریگەرییان لەسەر مەلای گەورە داناوە

پەیوەندی کتێب بە بنەماڵەی جەلیزادە، پەیوەندییەکی لە مێژینەیە. لە هەموو ئەو کتێبانەی، کە هەولدەدەین لەو بەشەدا یاداشتی بکەین تاکە کاریگەر لەسەر فیکر و ئەندێشەی مەلای گەورە باوکی بووە، مەلا عەبدوڵلا ئەبو محەمەد الحاج الغازی، ناسراوە بە مەلا عەبدوڵلا ئەفەندی جەلیزادە.

مەلای گەورەی بەتەواوی بەخۆی سەرسام کردبوو. جگە لەوە لەسەر وەسییەتی باوکی هیچ نووسینێکی بە سووک سەیر نەکردووە. دەڵێت: بابم ئەیفەرموو رۆڵە قەت نووسراوت لا سووک نەبێ، هەرچی بێ موتالەعەی بکە، ئیستفادەی لێ ئەکەی. لەم وەسیەتە بە قیمەتەی بابم زۆرم ئیستیفادەم کرد.





سەبارەت بە بلیمەتی باوکی دەڵێت: باوکم موجەددیدی قەرنی چوارەمینی هیجری بوو، بەڵام لە زاویەی کۆیە بە زایەع چوو، ئەگەر لە جێیەکی وەکو (میصر) بووایە، نەفعی ئەو بۆ ئیسلام لە محەمەد عەبدە زیاتر بوو.

یەکێک لەو کتێبانەی، کە سەر و سەودای باشی لەگەڵدا هەبوو، شارەزاییەکی گەلەک باشیشی لەسەر پەیداکردبوو، پەرتووکی گوڵستانی سەعدی شیرازییە. رۆژێک مەلا عەبدولحەکیم دێتە مزگەوت، تا دەرسی گوڵستان لای مەلا عەبدوڵڵای باوکی مەلای گەورە بخوێنێ، مەلای گەورەیش ئیجازە لە باوکی وەردەگرێت، تا خۆی دەرسەکەی بۆ شەرح بکات، باوکی هەرچەندە دوودڵ بوو، بەڵام گوتی: سەرەتا لەبەر چاوی من هەندێک دەرسەکەی بۆ شەرح بکە، ئەگەر رام لێبوو، ئینجا بەردەوام بە. پێیی گوتم جارێ هەندێ موتالایی بکە؟ وتم نا پێویست ناکا. مەلای گەورە دەگێڕێتەوە، کە لە حوزووری مەلای باوکم دەرسەکی چاکم پێگوت.

لە یەکێ لە گەشتەکانی بۆ شاری بەغدا لە میوانخانەیەک تووشی کەسێکی ئایینداری هیندوسی دەبێ، رۆژی دووجاران بۆ نوێژکردن روو لە مەشریق و مەغریب دەکات و دەڵێت: پێم گوت بۆ روو ئەکەیتە مەشریق و مەغریب؟ لە وەڵامدا گوتی: ئێمە خۆر ناپەرستین، بەڵام لە کاتی هەڵاتن و ئاوابووندا رووی تێدەکەین. ئەو نوێژە بۆ ئەوەیە تا لە خزمەت خودا شاهیدیمان بۆ بدات. گوتم: عەجەبە ئێوە بەچی ئەزانن؟ خۆر عیلمی هەیە و ئاگاداری حاڵی ئێوەیە. سەنەدتان لێ وەرگرتووە، کە ئەدای شاهادەت لە خزمەت خودا بکا و ئەگەر ئەدای شەهادەتی نەکرد، ئەوکات چی؟ عەجەب خودا نازانێ، کە ئێوە عیبادەتی ئەو ئەکەن؟ کە وام گوت تەماشای کردم ئاوی لە چاو هات، گوتی: چی بکەین وایان پێ گوتووین.

پەرتووکی «فصوص» یەکێکی دیکەیە لەو کتێبانەی، کە مەلای گەورە زۆر بە وردی خوێندوویەتییەوە و بە باشی تێگەیشتووە. کتێبی «اظهار الحق» مەلای گەورە زۆر سەرسامی بووە. دەڵێت: ئەو نووسەرە تەصنیفەکی کردیە دائیر بە ئیسپاتی تەحریفی تەورات و ئینجیل، ئیسپاتی نەسخی تەحقیقی موبەششیرات. حەققەن شایەنی موتالەعەیە.

مەلای گەورە جگە لەو کتێبانەی، کە نووسەرەکانی موسڵمانن، هەوڵی داوە بەباشی ئەو نووسەر و کتێبانەی غەیرە موسڵمانیش بخوێنێتەوە و سەرنجی خۆیانی لەسەر بنووسێت. لە بارەی نووسەری ئیرلەندایی جۆرج بەرنادشۆ دەڵێت: کاتبی شەهیری ئینگلیزی لە هیند نوتقێکی دابوو، خیتاب بۆ شوببانی تەلامیزی مەداریس، وتبووی: زۆر ئاگاداری عەقڵی خۆتان بن! رۆئەسای مەداریس بە غەیری ئەمە عەقڵی فیتریتان لێ نەزع نەکەن. عەقڵێکی دی بە ئارەزووی خۆیان بهاوێتە دەماغتان، هیچ مەقسەدی تریان نییە. لە بواری پزیشکییش شارەزایی هەبووە.

## مەلای گەورە و چاکسازی کۆمەڵایەتی لە رێگەی شیعرەوە

لە قوناغی ژیانی مەلای گەورە، شاری کۆیە نێوەندێکی پڕ بایەخی ئەدەبی و رۆشنبیریی بووە. بنەماڵەی مەلای گەورە بە تایبەت مەرحووم مەلا عەبدوڵای باوکی ئەدەب دۆست و شاعیر بووە، نزیکایەتی لەگەڵ شاعیرانی سەردەم و بەتایبەتی لەگەڵ حاجی قادری کۆیی هەبووە. ئەو دۆخە بۆ مەلای گەورە دەبێتە وێستگەیەکی دەوڵەمەند و ئاشنایەتییان لەگەڵ شاعیران، حاجی قادری کۆیی دەرگای ئەدەب و شیعر بۆ مەلای گەورە ئاواڵا دەکات. حاجی بە شاعیری نەتەوەیی و نیشتمانی ناسراوە، بەڵام مەلای گەورە دوو دەروازە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ دۆخی کۆمەڵایەتی ئەو ساکەی کورد بەکار دەهێنێت، زمانی ئایین و ئەدەب. مەلای گەورە لە رێگەی توانجە شیعرەکانییەوە نەقدی خووە خراپەکانی کۆمەڵگە دەکات و لەسەریان دەوستێت و رەخنەیان لێ دەگرێ و ئامۆژگارییان دەکات. لەگەڵ ئەوەیشدا هەوڵی چاکسازی کۆمەڵایەتیش دەدات. سڵ لە هیچ دیاردەیەکی دزێوی کۆمەڵگەی کوردیی ناکاتەوە، ورد ورد لەسەر جومگە و تەوەرەکانی دەوەستێت و بە شیعر، وتار، چیرۆک و پەند ئامۆژگارییان دەکات. رێگە خراپەکانیان پێ

> **«لێرەدا تێگەیشتنمان بۆ هەڵوێستەکانی مەلای گەورە بۆ دەردەکەوێ، کە بەمانای وشە کوردانە و موسڵمانانە بیری کردووەتەوە»**

نیشان دەدات و چارەسەریش دەدۆزێتەوە. بەرهەمی شیعری مەلای گەورە هەمووی دەچێتە ناو شیعری میللییەوە. لە رووی رووخسار و ناوەرۆکەوە ئەدگار و شەقڵی شیعری میللیی حاجی قادریان پێوەیە. لە خوێندنەوەی شیعریدا ئەگەر کەسێک نەزانێت شیعرەکە مەلا محەمەد دایناوە، بە شیعری میللی فۆلکلۆری بێ خاوەن حسێبی دەکا. زمانی شیعریی مەلا محەمەد ئاسان و ساکارە، وشەکانی لە زمانی قسەکردنی نێو خەڵک وەرگیراون. رستە و تەعبیری زیاتر دەشکێتەوە سەر دیالێکتی ناوچەیی کۆیە

لە یەکێ لە ئامۆژگارییەکانیدا دەڵێ:

***قسێکت بۆ دەکەم چاکی بزانە***
***قوبووڵی کە بەبێ عوزرو بەهانە***
***لەسەر زار و زمانان گەرچی سووکە***
***لە میزانی حەقیقەت زۆر گرانە***

بە زمانێکی ئاسان و ئاسایی لەگەڵ رەنجبەر و جووتیاری دەشت و خەڵکی کرێکار و هەژارانی شار قسە دەکا و بەسەرهاتی نالەباری خۆیانیان بۆ دەگێڕێتەوە. لە کار و کردەوەی کۆلکە مەلا دەدوێ و توانج لە شێخی فێڵباز دەگرێت و دەروێش و موریدانی شێخ بە ئاگا دێنێتەوە.

زۆربەی هۆنراوەکانی مەلای گەورە کۆمەڵایەتیین و داوای لە خەڵک کردووە، کە خەریکی خوێندن بن و دەست لە سۆفییەتی و دەروێشی و دەمارگیریی و نەخوێندەواریی هەڵگرن و گوێی ئەم و ئەو نەخۆن و هەتا دەتوانن بۆ بەهرە وەرگرتن لە زانست هەوڵدەن و فێری پیشەسازیی و هونەر بن. بە گوێرەی زەمان ژیان بەرنە سەر

مەلای گەورە بۆ کوردان دەڵێ:

***هەتا دەمرم لەبۆ کوردان دەناڵم***
***عیلاجیان چلۆن بکەم هاوار بەماڵم***
***بەزۆری جاهل و نەخوێندەوارن***
***لەلای نەوعی بەشەریی قەدرو خوارن***

مەلای گەورەی شاعیر، وەک زانایەکی ئایینیی چاکەخواز و شاعیرێکی نیشتمانپەروەری بە جەرگ و سیاسەتمەدارێکی ئەوسای کورد. رۆژانــە لەسەر ئامۆژگاریکردنی رۆڵەکانی میللەتەکەی دەرۆیشت و ئەنجوومەنی تایبەتی خۆی و مینبەری مزگەوتی گەورەی کۆیەی کردبوو بە قوتابخانەیەکی زانستی و رووناکبیریی و دەستە بە دەستەی خەڵکی شار و مەڵبەندەکانی دەوروپشتی، وانەی چاکسازی و نیشتمانپەروەریی لێوە فێر دەبوون.



شاعیرییەتی مەلای گەورە بۆ ئەوە ناگەرێتەوە، کە شاعیرە یان هونەریانە مامەڵە لەگەڵ ئەدەب و شیعر و زمان و تەکنیک و وێنەدا دەکات. شاعیرییەتی مەلای گەورە بۆ کێشە کۆمەڵایەتیی و سیاسیی و ئایینیی و نەتەوایەتی دەگەرێتەوە. ئەگەر ئەو کێشانە نەبوونایە رەنگە پەنای بۆ شیعر نەدەبرد. هەرچەندە نایشارێتەوە، کە لەسەرەتای هەرزەکارییەوە خولیایەکی زۆری بۆ شاعیر بوون هەبووە، بەڵام نەیتوانیوە بەسەر ئەو زمانە شیعرییەدا زاڵ بێت، کە شاعیرەکانی دیکە هەیانبووە. ئەوەیشی درکاندووە، کە شاعیرێکی خراپ بووە، ئەوە لە رووی هونەری شیعرییەوە. لەلایەکی دیکە تێنەگەیشتن و کەمتەرخەمی قەومی کورد بە هۆکارێکی دیکە دەزانێ، کە وایکردووە لە شیعر نووسین بێزار بێت و خۆزگە بەوە بخوازێت، کە هەر شیعری نەنووسیایە. مەلای گەورە بۆ شیعر نووسین بەدوای زمانێکی سادەدا گەراوە تا لێیەوە ئامۆژگاریی میللەتەکەی بکات و لە نەهامەتی و دواکەوتن و خراپەکارییەکان ئاگاداریان بکاتەوە، شیعر لای مەلای گەورە وەسیلەیە نەک ئامانج و بوون بە شاعیر، وەک ئەوەی لای نالی و مەحوی و گۆران و هتد.... دا هەبووە. یانی ئەگەر ئەو هەست و مەهام و بروایانەی مەلای گەورە نەبووایە بۆ چاکسازیی و پەروەشی ئەو بۆ چاککردنی کۆمەڵگە، رەنگە ئێمەیش تاقەتی ئەوەمان نەبووایە شیعرەکانی بخوێنینەوە، کە هیچ هونەر و تەکنیک و وێنەسازیی و جەمالیەتێکی تێدا نییە، بەڵام کاتێک پەرۆشی ئەو بۆ خاک و نەتەوە و خەڵک و ئایین و رزگارکردنی کۆمەڵگەی کوردیی دەبینین، ئێمەیش بە رێزەوە سەیری شیعرەکانی دەکەین. لێرەدا وەنەبی مەلای گەورە شارەزایی لە ئەدەب و شیعر و شیعری شاعیرانی کورد و دونیا نەبووبێت، بە پێچەوانەوە بەڵگەی زۆر هەن، کە زۆر شارەزای

> **مەلای گەورە تەواو لە عوسمانییەکان نائومێد ببوو، بەلادەر لە ئایین وەسفی کردوون، بەڵام زۆریش دڵخۆش نەبووە، بە بەدیلەکەی، کە بریتانیایە**



ئەدەب و شیعر و شاعیرانی جیهانیی و کورد بووە، زۆریانی خوێندووەتەوە و قسەی لەسەر کردوون، یان ناوی هێناون، هەرچەندە بەهۆی کردەوە خراپەکانیانەوە، وەک ئەفلاتوون ئەویش ڕەخنەیان لێدەگرێ، کە بووەنەتە دەربار و شایەر. بەشێکیان، هەمیشە لەبەر دەرگای میر و سەرۆک و دەسەلاتداران وەستاون و خۆیان و شیعریان بۆ پارە، فرۆشتووە.

### تێڕوانینی مەلای گەورە بۆ چەمکی موجەدید (نوێگەر):

مەلای گەورە زۆر بە وردی لەسەر چەمکی نوێگەریی و ئەوانەی هەڵگری ئەو ناسنامەیەن قسە دەکات و پێی وایە بەشی زۆری مەلای ئەو سەردەمە، بەتایبەتی مەلایانی کورد شایەن بەو ناوونیشانە نین، چونکە دۆخی بیرکردنەوەی مەلای کورد هێشتە لەنێو مەنزومەی فقه و شەرع نەهاتووەتە دەرەوە، مەلای گەورە پێی وایە بوون بە موجەدید، نوێگەر هەروا ئاسان نییە، کەسی تایبەت و زانای چاک چاکی دەوێت. لەبارەی موجەدیدەوە تێڕوانینی تایبەت بە خۆی هەیە، پێشیوایە کورد، چونکە لە فەلسەفە و فیکری تازەی دونیا شارەزا نییە و ئامادەش نییە ئەو فیکرانە بخوێنێتەوە، بۆیە توانای بوون بە موجەدیدی زەمانەی نییە، ئەو لەبارەی پرۆسەی نوێگەرییەوە ئاخۆ کێ هەڵگری ئەو ناوەیە، نموونە بە فەیلەسوفانی یۆنان و بەتایبەت بە ئەفلاتون دەهێنێتەوە و لەسەر تێڕوانینەکانیان بۆ ژیان دەوەستێت، پێدەچێت مەلای گەورە زۆر بە وردی کتێبی کۆماری ئەفلاتونی خوێندبێتەوە، چونکە لەسەر قۆناغ بەندی و مەدینە فازیلەکەی باش باش دەوەستێت و وەک سامپڵ باسیان دەکات، بۆ نموونە دێتە سەر دانانی قانوون، بۆ ژیان و بیرکردنەوە و گۆڕینی کۆمەڵگە. ئەو پێی وایە بۆ ئەوەی بگۆڕێت پێویستە لە دەرەوەی بابەتە فقییەکان بچێتە دەرەوە، چونکە موجەدید دۆخی کۆمەڵگە بەو ئەندازەیە سەیر دەکات، کە ئاراستەیان بگۆڕێت، شتێک بێتە هۆی چەقبەستن و وەستانیان. ئیدی مومکین نییە ئەو گۆڕانە لای مەلای گەورە و گرنگیی دانی مەلایانی کورد بە زانستی فقهو نەحو و تەجوید بمانگەیێنە

> **مەلای گەورە جگە لەو کتێبانەی، کە ووسەرەکانی موسڵمانن، هەوڵی داوە بەباشی ئەو نووسەر و کتێبانەی غەیرە موسڵمانیش بخوێنێتەوە و سەرنجی ژیانی لەسەر بنووسێت**

شارستانییەت.

لە دیدی مەلای گەورەوە گەیشتن بە شارستانییەت بە داهێنان و بیرکردنەوە و بەرهەمی زانستیی دەبێت. ئایشارێتەوە ئەوەی ئێستە لە ئەورووپا، ئەمریکا و بریتانیا بەدەست هاتووە بەرهەمی بێ دینەکانە نەک ئاییندارەکان، دەشڵێت دەبووا ئێمەی ئاییندار و موسڵمان ئەو ڕچەشکێنییەمان کردبا و تۆپ و تەیارە و سەیارەمان دروست کردبا. کاتێک ئەوان دروستی دەکەن موسلمان و ئەهەلی دین لە جیهان شەرمەزار دەبن و کەسانی لا دین پێمان دەڵێن: ئەگەر ئایینەکەی ئێوە زانست و زانیاریی تێدابایە، وەک ئێمە پێش دەکەوتن. مەلای گەورە ئەسەفێکی زۆر بۆ ئەو ڕەوشە دەخوات و دەڵێت: ئەگەر ئێمەی موسڵمانان، ئەو کارەمان کردبا و زانست و زانیاریمان بۆ پێشکەوتنی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی تەرخان بکردایە، ئێستە خەڵکی بە پەرۆشەوە دەهاتنە نێو ئایینی ئیسلام، باوەشی خەڵکی بۆ ئایین تەنیا بە خزمەتکردن و پێشکەوتن دەبێت.

کاتێکیش دێتە سەر ناوی موجەدیدینی سەردەم شێخ محەممەد عەبدە و جەمالەدینی ئەفغانی دەڵێت: لە جیاتی ئەوەی ئەو موفەکیر و تێگەیشتووانە لەلایەن جەمعی موسڵمانان دەعم بکرانایە، دین تەکفیریان دەکەن و بە کافر ناویان دەهێنن. ئەسەفێکی زۆر بۆ ئەو بارودۆخەی زانایانی موسڵمانان دەخوات و دەڵێت: سێ موجەدیدی گەورە ئێستا لە عالەمی ئیسلامی هەن، کە شایانی ئەوەن پێیان بگوترێت موجەدید. مەلا عەبدولڕەحمانی جەلی باپیرە گەورەم، موفتی زەهاوی، شێخ محەمەد عەبدە.

مەلای گەورە دەڵێت: خودا صانعە کەسی صانعیشی خۆشدەوێت. مەلای گەورە هاواردەکات و دەڵێت: میللەت لە گوێی گادا نووستووە، بەخەبەر نایە. زانایەکی وەک تەنتاوی ئومێدی وابوو، لە سایەی تەفسیری وی عالەمی ئیسلامییەت بەخەبەر بێن، دەشڵێت لەو زەمان و ڕۆژگارە یەک مەلا بە خەبەر هات لە مەغریب، ئەویش بە هەموو قووەتی خۆی هجومی کردە سەر تەنتاوی و تەکفیری کرد.

## سەرچاوەکان:

### سەرچاوەی کوردی:


١- ڕەنگدانەوە شارستانییەتی یۆنانی لە ناو شارستانییەتی ئیسلامیدا - لە سەردەمی عەبباسی یەکەمدا (٧٤٩- ٨٤٧ ز) نوسەر: زریان حاجی. ژمارەی لاپەر: ٢٨١ سالی چاپ: ٢٠١٢.

٢- کاروانی ژیانم د. مستەفا زەلمی. نووسینگەی تەفسیر بۆ بلاوکردنەوە و ڕاگەیاندن. چاپی دووەم: هەولێر- ٢٠١٦.

٣- تاقگەیەکی نەسرەوت نووسینی: ڕێدارئەحمەد. چاپخانەی ڕۆژهەلات- هەولێر. چاپی یەکەم: ٢٠١٦.

٤- توێژینەوەیەکی جەنابی دکتور مستەفا زەلمی. بە ناوی (لا رجم في القران) سەرچاوە ئەنتەرنێت.

٥- دیدی مـەلای گـەورە بۆ قـەرمـوودە (شیعرەکانی بە نموونە) توێژینەوەی پ.جەواد فەقێ عەلی (یوتیوپ).

٦- مەلای گەورەی کۆیە وتەفسیرەکەی و چەند سەرنجێک) نووسەر: عەلی باپیر. ٦٩ لاپەر. بلاوکردنەوەی: نووسینگەی تەفسیر. سالی چاپ: چاپی یەکەم: ٢٠١١.

٧- تەفسیری قورئانی پیرۆز بە کوردی - نووسەر: مەلای گـەورە. ٦٠٠٠ لاپـەر. لە (١٠ بـەرگ) و لەسالی (٢٠٠٩ز) لەسەر ئەرکی مام جەلال لەچاپدرا.

٨- مـەلای گـەورە - زانـا و ئـەدیب و شاعیر نـووسـەر: عەبدولخالق عەلائەدین. چاپی دووەم: ٢٠٠٩.

٩- ژن لە تەفسیری مـەلای گـەورەدا نـووسـەر: حەیدەر عەبدوللا. مالپەری خوێندگە.

١٠- کولی دلی مـەلای گـەورەی کۆیی/نووسینی: مەلا حوسێن گورژی سالی چاپ، ٢٠٠٨

١١- مەلای گەورە/ نووسینی: مومتاز حەیدەری – چاپی دووەم – ٢٠٠٩

١٢- مـەلای گـەورە - کوێخای دیوەخانی هزر و میوانی دیوانی شیعر- نووسینی: قانع خورشید، سالی چاپ – ٢٠١٤

١٣- فری فری قەل فری –نووسەر: مەلای کەورە ، پێشەکی و پەراوێز بۆ نووسینی/ قانع خورشید، سالی چاپ – ٢٠١٧

١٤- دەرد و دەرمانی زانایان/ لەبەر ڕۆشنایی تەفسیرەکەی مەلا گەورەی کۆیی/ نووسینی: هێمن عومەر خۆشناو- لە بلاوکراوەکانی نووسینگەی تەفسیر- سالی چاپ ، ٢٠٢٠

١٥- ئافرەت لە دیدی مەلای گەورەوە/ نووسینی: ئالا دارا عەبدولمەجید – نووسینگەی تەفسیر، سالی چاپ – ٢٠٢١

١٦- دین و جیهانبینی مەلای گـەورە - هەلبژاردەیەک لە بەهێزترین بابەتەکانی تەفسیری مەلای گەورە - نووسینی: هاوکار عەبدوللا شێخ وەسانی - نووسینگەی تەفسیر، سالی چاپ- ٢٠١٧

١٧- ژیان و ئەزموونی مەلای گەورە/ نووسینی: هاوکار عەبدوللا شێخ وەسانی، نووسینگەی تەفسیر، سالی چاپ- ٢٠١٧

١٨- بیرەوەری و ڕوانینەکانی مەلای گەورە/ کۆکردنەوە و ڕێکخستن و پەراوێزی: هێمن عومەر خۆشناو- دەزگای قام- چاپی دووەم ٢٠٢٣


### سەرچاوەی عەرەبی:


١- لإسلام بين العلم والمدنية تأليف: الإمام محمد عبده. ١٣٨ ص. جميع الحقوق محفوظة للناشر مؤسسة هنداوي للتعليم والثقافة: ٢٠١٢.

٢- العروة الوثقى تأليف: جمال الدين الأفغاني ومحمد عبده. ٤٩٠ ص. جميع الحقوق محفوظة للناشر مؤسسة هنداوي للتعليم والثقافة: ٢٠١٢.

٣- التراث والتجديد - موقفنا من التراث القديم: تأليف د. حسن حنفي. ١٨٦ ص. الناشر مؤسسة هنداوي سي آي س: ٢٠١٧.

٤- الوحي والواقع - تحليل املضمون تأليف: د. حسن حنفي. ٢٥٣ ص. صدرت هذه النسخة عن مؤسسة هنداوي عام: ٢٠٢١.

٥- رسالة في اللاهوت والسياسة تأليف: باروخ سبينوزا. ترجمة: د. حسن حنفي. مراجعة: فـؤاد زكريـا. ٤٦٢ ص. صدرت هذه الترجمة عن مؤسسة هنداوي عام: ٢٠٢٠.

٦- نحن والتراث - قراءة معاصرة في تراثنا الفلسفي تأليف: محمد عابد الجابري. ٣٢٩ ص. تاريخ الإنشاء: ٢٠٠٧.

٧- محمد عبدالله الجلي (مـەلای گـەورە) وجهوده العلمية: تأليف: د. جواد فقي علي الهوم حيدري – سلسلة رسائل جامعية : الطبعة الاولى – اربيل ٢٠٠٦.

٨- التكميل في وجوب الفرق بين الواجب والمستحيل: تأليف العلامة محمد عبدالله جليزاده – تحقيق: أ.د. جمال محمد فقي رسول باجلان – الطبعة الاولى ٢٠١٥.

٩- نقد أسلوب الزلمي ونقض اعتراضاته/ تأليف – د. حسن خالد مصطفى محمود الفتي، من منشورات أهل السنة الجماعة – أتباع النقشبندية / أربيل، سنة ٢٠١٠م.

١٠- مفهوم الاصلاح أو نحو اصلاح الفهم المصطلح: تأليف / د. محمد بريش- خبير في الدراسات المستقبلية والاستراتيجية عضو « معهد الدراسات المصطلحية.

١١- المفردات في غريب القران: تأليف/ راغب الاصفهاني.

١٢- اصـول النظام الاجتماعي في الاسـلام/ تأليف: الشيخ محمد الطاهير بن عاشور سنة ٢٠٠٥م

١٣- التراث والتجديد/ تأليف: د. حسن حنفي، سنة ٢٠١٧ مؤسسة هنداوی للنشر.

١٤- الفكر الإسلامي - نقد واجتهاد/ تأليف: محمد اركون ترجمة وتعليف: هاشم صالح - الطبعة السادسة - ٢٠١٢

١٥- مستقبل الثقافة في مصر/ تأليف: طه حسين - صدر هذا الكتاب عام ١٩٣٨ و صدرت هذه النسخة عن مؤسسة هنداوي عام ٢٠١٤ .

١٦- من الاجتهاد إلى نقد العقل الإسلامي/ تأليف: محمد اركون – ١٩٩٣

١٧- اليمين واليسار في الفكر الديني/ تأليف: الدكتور حسن حنفي: منشورات دار علاءالدين- ديمشق، ودار الثقافة الجديد – القاهرة ص ٦-٧

١٨-كيف يفكر الناجحون/ تأليف: جون سي ماكسويل، ترجمة: فايقة جرجس، مراجعة: مروة عبدالفتاح شحاتة، الناشر: كلمات عربية للترجمة والنشر، الطبعة الاولى ٢٠١٢م القاهرة.






# مەلای گەورە و ئینگلیز!

ئامادەکردنی: محەمەد گوران

حاکمی سیاسی ئینگلیز لەهەولێر (دبلیو ئار هی) کە لەنێو کوردان بە (کاپتن های) دەناسرێتەوە، لەکتێبەکەی خۆیدا (دووساڵ لەکوردستان) بەڕوونی دیارە، کە خۆشی نەهاتووە لە مەلای گەورەی کۆیە هاوکات مەلای گەورە ئەمیش هیچکات بڕوای بەئینگلیز نەبووە و دەڵێ: سووری موو زەردی چاوشین نەکەی بە ئومێدی بێ.

دوای بڕانەوەی جەنگی یەکەمی جیهانی (کاپتن های) ڕاستەوخۆ دێتە هەولێر و دەبێتە حاکمی سیاسیی ئینگلیز لەو شارە و بۆ ماوەی دووساڵ ١٩١٨ – ١٩٢٠ لەهەولێر دەمێنێتەوە. لەماوەی ئەو دوو ساڵەدا (کاپتن های) هەر جارەک چووبێتە کۆیە، چاوی بەمەلای گەورە کەوتووە. هەر چەندە وەک ڕێزەک وشەی (مەتران)ی لەبەرانبەر مەلای گەورە بەکارهێناوە، بەڵام لەتەواوی ئەو باسکردن و وەسفانەی لەدیتنی مەلای گەورە هێناویەتە سەرزار، هەمیشە وشەیەک، یان دەستەواژەکی وای بەکارهێناوە، کە واتای خۆشنەهاتن» و «حۆشحاڵ نەبوون بگەیەنێ!

مەتران، کە پێگەیەکە و لەبەرانبەر پیاوانی ئایینی مەسیحی بەکاردێ و بەو کەسە دەگوترێت، کە سەرپەرشتی چەند کڵیسا و چەند قەشەیەک بکات، کە لەئایینی ئیسلامدا ئەو پێگە و پلەیە نییە مەلایەک سەرپەرشتی چەندین مەلا و مزگەوت بکات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا (کاپتن های) وەسف و پێگەی مەلای گەورەی هەر بە (مەتران) هێناوەتە سەرزار.

لەیەکەم سەردانی بۆ شاری کۆیە لەساڵی ١٩١٨ کاپتن های ئاوا وەسفی پێشوازی لێکردنەکەیی و مەلای گەورە دەکات: «سەرەتا بردمیانە سەرای کە ژوورێک بۆ پێشوازی کردنی من ئامادە کرابوو. هەموو پیاوماقووڵانی شار، وەک مەلاکان کۆببوونەوە، دوای پێشکەش کردنی چا و قاوە، موفتی شار محەمەد مەلافەندی، کە کەسایەتییەکی ئایینی بوو، وتارێکی بەخێرهێنانی درێژی، بەفارسییەکی مەرایبکەرانە پێشکەش کرد، ئەوەندەی لەتوانامدا بوو بەشێوەیەکی باش وەڵامم دایەوە«. لا ١٢٦

لەسەردان و بەرکەوتنی دووەمی لەگەڵ مەلای گەورەدا، ئەوجارە لەگەڵ جۆرێک لەستایش بەڵام دیسانەوە (کاپتن های) بەتوانجەوە قسە دەکات و دەڵێت: «بەگشتی لەکۆیە مەلا زۆربوون کە عەمامەیەکی سپیان لەسەر دەنا، لەپێش هەمووشیان مەلا محەمەد ئەفەندی کە ناوی (مەتران)مان لێنا. ئەو لەناوەڕاستی تەمەندا بوو، باڵایەکی بەرزی هەبوو، خاوەن زانست و مەعریفەیەکی باش بوو. بەهرەیەکی چاکی هەبوو لە زۆر قسەکردندا، لەهەر شوێنێکیدا بووایە قسەکردنی پاوان دەکرد. خۆشبەختانە ئەو خۆرسک بەهرەیەکی وای هەبوو کە وای لێ دەکرد لەکەسە هەرە بەردڵەکان بێ، هەمیشە شانازی بەوەوە دەکرد، کە زاناترین زانایانی کوردستانە، ئەمەش یەک لەسیفەتەکانی توێژەکەی ئەو بوو، لەژێر سایەی بەڕێوەبردنی ئێمەدا بووە (حاکمی شەرع) لەکۆیە. لەگەڵ ئەوەی کە زانستی ئەو لەسەرووی گومانەوە بوو، بەڵام دروستی

> **کاپتن های:**
>
> **بەگشتی لەکۆیە مەلا زۆربوون کە عەمامەیەکی سپیان لەسەر دەنا، لەپێش هەمووشیان مەلا محەمەد ئەفەندی کە ناوی (مەتران)مان لێنا.**

حوکمەکانی زۆرجار دەکەوتنە بەرپرسیار، ئەو ڕوحانییەکی دنیایی بوو، پەرۆشی کۆمەڵگە و کەلاوەی دونیا بوو. لا ١٢٩

کاپتن های، لەماوەی ئەو دوو ساڵەی حاکمی هەولێر بوو، چەند جارێک بەهۆکاری کاروباری ئیداریی و چارەسەرکردنی گرفت و پەشێویی، سەردانی کۆیەی کردووە و زۆریش دڵخۆش بووە بەبینینی کۆیە، لەیەکێ لەو سەردانانەیدا ماوەی دوو مانگ لەکۆیە دەمێنێتەوە و دوای جێهێشتنی شارەکەش دەڵێت: «کە پشتم لەکۆیە کرد خەمێکی قووڵ دایگرتم، چونکە خۆشەویستی ئەو شارە دوورەدەستە بچووکە دڵگرە و خەڵکەکەی، لەدڵمدا چەکەرەی کردبوو. کاری ئەوان سەیر بوو، ڕەفتاری ئەوان بۆ ماوەیەکی درێژ بووە هەمان ڕەفتاری من، ئەو شتەی کە شەیدای بوون هەمان ئەو شتە بوو، کە من شەیدای بووم، وەک چۆن هەڵچوونەکانیان هەمان هەڵچوونی من بوو. بەهەستی دڵتەنگی و حەسرەتەوە جارێکی دیکە خۆم لەجیهانی دەرەوە دیتەوە. من ئەو دوو مانگەی لەکۆیە بەسەرم برد، بە خۆشەویستترین ئەو کاتانەی دادەنێم، کە لەکوردستان بەسەرمدا تێپەڕین (لا ١٥٦)

یەکێ لەو پەشێوییانەی، کە لەسەردەمی ئینگلیز لەشارەکە ڕوویدا، مردنی فەرمانڕەوای کۆیە (حەماغای گەورە) بوو، کاپتن های باس لەدۆخی ئەو ڕۆژانە و هەڵوێستی مەلای گەورە دەکات



و دەڵێت: تاکە کێشەی کە ئێستا لەئارادا بوو، کێشەی خزمەکانی (حەماغا) بوو و پەیوەندی بە موڵکەکانییەوە هەبوو (ڕەسووڵ ئاغا)ی برازای، کە پیرەمێردێک بوو دوو تەمەنی کردبوو، هەشتا ساڵ بوو، لوتێکی سورهەڵگەڕاو، جەستەیەکی لەرزۆکی هەبوو، شەیتان لەچاوەوەی فریشتە بوو، لەناوچەی ڕانیەوە هاتبوو و سووربوو لەسەر ئەوەی لەپرسەی کۆچی دوایی ئەو پیرەمێردە ئامادە بێت. دوای ئەوەی بەهێمنی لەگۆڕەکەیدا ڕاکشا، تەنیا داوای سەرۆکایەتی خانەوادەی غەفووری نەدەکرد، کە خانەوادەیەکە پەیوەندی پێیەوە هەیە، بەڵکو داوای بەشێکی زۆری سەروسامانی حەماغای دەکرد، دەیگوت، کە بەدرێژایی چەندین ساڵ بەزۆرداری و دوژمنکاری لێی بێبەش کراوە. داوای چەند دوکانێکی دەکرد لەگەڵ دیوەخانەکەی خودی ئاغا پیرەکە و دەیگوت: دەبووایە دوای مردنی باپیرەی بدرێتە باوکی. ئەو باپیرەش بەر




**کاپتن های:**

***مەتران، لەو دوو ساڵەی دواییدا بەشێوەیەکی مەزن دەرکەوت، لووتبەرزی و ڕێوشوێنە ڕەقەکارەکەی وایانکرد لای خەڵک خۆشەویست نەبێ***



لەیەک سەدە و بگرە زیاتریش دەبوو، مردبوو. گوێم لەهەردوو لایەنی کێشەکە ڕاگرت، دیتم مەتران (مەبەستی مەلای گەورەیە) هەموو پیاوماقووڵان لەسەر ئەوە کۆکن، کە بە پەلە کۆیە لەو پیاوە ناحەزە دەرباز بکرێ. ئەوان توانیان لەدیوەخانەکەی حەماغا دەریکەن (لا ٢٩١).

ئەگەرچی لەدوای حەماغای گەورە، هەمووان لەسەر ئەوە ڕێککەوتن کە جەمیل ئاغا بکرێتە فەرمانڕەوای شارەکە، بەڵام ڕووداوەکانی دواتر ئەوەی سەلماند، کە باڵە هەژموونگەراکانی دەسەڵات لەنێو کۆیە، هەمیشە لەدەرفەتەک دەگەڕان بۆ یەکلاکردنەوەی دەسەڵات لەقازانجی خۆیاندا، هەر ئەمەش بووە هۆکار، کە لەنێوە شەودا هێزێکی زۆر بەسەر بارەگای یاریدەدەری حاکمی سیاسیی ئینگلیزدا بدات و ناچاری بکەن بۆ ماوەیەک شارەکە بەجێ بێڵێ، لەم ئانوساتەدا (کاپتن های) بەتەلەفۆن لەلایەن جەمیل ئاغا-وە پەیوەندی پێوە دەکرێت. هەر سەبارەت بەم ڕووداوەش دیسانەوە بەشێوازێکی زۆر توند باس لەپێگە و هەڵوێستی مەلای گەورە پەیوەست بەو ڕووداوە دەکات و دەڵێت: جەمیل ئاغا بەتەلەفۆن قسەی لەگەڵدا کردم و پەژارەی خۆی بۆ ڕۆیشتنی (یاریدەدەری حاکمی سیاسی) دەربڕی و پێشنیازی ئەوەی کرد، کە ڕێگە بە (مستەر بات) بدرێ لەشارەکە بمێنێتەوە تا دەریخا کە لەگەڵ هاوڕێکانی بە پشتیوانی حکوومەت کاردەکەن. بەوە ڕازی بووم و (مستەر بات)م وەک نوێنەری حکوومەت لە کۆیە دانا، تا گەڕانەوەی یاریدەدەری حاکمی سیاسیی و لەبنکەی خۆی جێگیربوو، جەمیل ئاغاش پاسەوانی بۆ دانا و ئیدی خەریکی پیادەکردنی کارە قورسەکانی بوو». کاپتن های دەشڵێ: «هەرچی مەترانە، یان مەلا محەمەد ئەفەندی، کە لەو دوو ساڵەی

دواییدا بەشێوەیەکی مەزن دەرکەوت، لووتبەرزی و ڕێوشوێنە ڕەقەکارەکەی وایانکرد لای خەڵک خۆشەویست نەبێ. دوای ڕۆیشتنی یاریدەدەری حاکمی سیاسیی، بڕیاریدا بکشێتەوە گوندەکەی و تا ماوەیەک واز لەسیاسەت بهێنێ (لا ٣١١ - ٣١٢).

ئەمە بۆچوونی حاکمی سیاسی ئینگلیز بوو لەسەر مەلای گەورە، بەڵام هاوکات مەلای گەورەی کۆیە، ئەمیش بۆچوونی لەسەر ئینگلیز باش نەبوو، لەدیوانی (دیاری کوردستان) مەلای گەورە لەهۆنراوەی (ئەم خاکە)دا دەڵێت:

***ئەم خاکە دایکی تۆیە کەوتە دەستی ئەجنەبی***

***ئەی کوردی ساحێب غیرەت تۆ چلۆن ڕازی دەبی***

***بۆ خۆت ئەوا دەبینی دوژمن ئەرزت دەکێڵی***

***پاشی چەند ساڵێکی دی هیچت بە دەست نامێنێ***

(مەلا محمدی کۆیی، ١٩٦٩ لا ٥٧)

هەر لەبەشێکی دیکەی ئەم هۆنراوەیەدا مەلای گەورە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ دێتە سەر باسی ئینگلیز و داوا دەکا کە گەلی کورد بڕوایان پێ نەکەن و دەڵێ:

***ئێوەن بێ قەدر و قیمەت بێ عەسکەر و بێ عەلەم***

***بێ تاج و تەخت و دەوڵەت ژێر دەستی کوللی عالەم***

***چێنکە نانخۆری خەڵکی لەسەر موڵک و ماڵی خۆت***

***خاکت هەموو مەعدەنە خۆت فەقیر و ڕووت و قووت***

***تاکەی وەکوو گاجووتی لە ژێر نیری زیللەتی***

***سەد حەیف و سەد مخابن لای خۆت ئەتۆش میللەتی***

***سووری موو زەردی چاوشین نەکەی بە ئومێدی بی***

***ئەوەل بە قووەتی خۆت دووەم بە عەونی ڕەبی***

(مەلا محمدی کۆیی، ١٩٦٩، لا ٥٧)

**سەرچاوەکان:**


١- دبلیو ئار هی، دووساڵ لەکوردستان، وەرگێڕانی لەعەرەبییەوە لوقمان باپیر، چاپی یەکەم، ٢٠١٦

٢- مەلا محمدی کۆیی، دیوانی دیاری کوردستان، چاپی یەکەم، ١٩٦٩


***مەلای گەورەی کۆیە:***

***سووری موو زەردی چاوشین نەکەی بە ئومێدی بی***

# ژیریی لە تێگەیشتنی مەلای گەورەدا



مەلای گەورەی کۆیە یەکێکە لەو کەسایەتییە ئایینییە کوردییانەی کە هاوکاتبوونی هاتنە دنیای، لەگەڵ کەسانی وەک محەمەد عەبدە و عەبدولڕەحمانی کەواکیبی و بەدیعوززەمان سەعیدی کوردی، گەورەترین شۆڕشی هزری نوێی ئایینییان هێنایە ئاراوە. مەلای گەورە کە لە ١٩٤٣/١٠/١٢ (دوازدەی تشرینی یەکەمی سالی هەزارو نۆسەدو چل و سێ) کۆچی دوایی کرد، زۆر نووسراو و نامیلکە و پەڕتووکی ناوازەی بۆ بەجێهێشتین، لە سەرووی هەمووشیانەوە تەفسیری کوردی کە خۆی لە دە بەرگدا دەبینێتەوە. زەحمەتە بتوانین لەم باسەدا لە کۆی سیفاتە بڵندەکانی مەلای گەورە بدوێین، زەحمەتیشە تەنیا سیفەتێکی باس بکەین و ئەوانی دی فەرامۆش بکەین. بەڵام لە بەر سرووشتی نووسینی گۆشە، هەر ناچار دەبین تیشک بخەینە سەر یەکێک لەو خالانەی کە مەلای گەورە لە ڕووی ئایینییەوە لەو سەردەمەوە بە پێویستییەکی کۆمەڵگەی کوردەواری زانیوە، کە ئەویش بایەخدانە بە پێگەی ژیری لە تێگەیشتنی دەقە ئایینییەکاندا، بۆیە لە بەرگی یەکەمی تەفسیرەکەیدا دەڵێت: (کە ژیری نەما، قسە لەگەڵ کێ بکەین؟ بیلئەخەس کە کەرامات هاتە گۆڕێ، بە جارێ ژیری و عیلم و حیکمەت دەفڕێ، نیزامی کائینات ژێر بەرەو ژوور دەبێ، حەق و حەقیقەت گوم دەبێ...خودایە تۆ شاهیدی، هەر دینێک هەر مەزهەبێک، هەر مەشرەبێک لەگەڵ ژیری موخالیف بێ، .. من لێی بەریم). هەروەها دەڵێت: (دینێکم دەوێ، بە مەزهەبێک ڕازیم، کە بە ئیمتیزاجی ژیری و نبووەت ڕۆحێکی خالیسی تیا پەیدا بووبێ. زۆریش سەعی دەکەم کە عەوامیش بە ڕاستی لە حەق و حەقیقەت بگا.. با لایشیان مەنفور و بێحورمەت بم)

ئەم بیرکردنەوە بالایە لە پێگەی ژیری بۆ ئەوسا و بۆ ئەو سەردەمە هەر لە کەسانی نوێکاری وەک خۆی جوانە، چونکە ئەوسا و تا ڕادەیەکیش لە ئێستادا، یەکێک لە ڕواڵەتە دیارەکانی ئەم سەردەمەی کوردەواری و جیهانی ئیسلامی بریتییە لە تێکەڵکردنی ئایین بە ئەفسانە و دەمارگیری، کە ئەمەش زۆر هۆکاری هەیە، وەک: هۆکاری دەروونی: کە ئەمەش لە هەستکردن بە لاوازییەوە سەرچاوە دەگرێت، چونکە کاتێک باوەڕداران تێگەیشتنیان بۆ ئایین ڕێک بووبێت، هەمیشە هەستیان بە بەهێزیی خۆیان کردووەو، تێگەیشتنەکانیشیان ڕێک و جوانتر بووەو، خوداپەرستێکی گەشبین بوون لە ژیانداو، خاوەن پەیامێکی ئینسانییش بوون بۆ خەڵکی، بەڵام کاتێک باوەڕداران دواکەوتوو بوون و بەرگەی پێشکەوتنەکانی بەرانبەریان نەگرتووە، هەستیان بە لاوازی کردووە، ئەوسا پەنایان بردۆتە بەر ئەفسانە. یان بە هۆکاری سیاسی، کە تێکەڵکردنی ئەفسانە و دەمارگیریی بە ئایین لەوێوە سەرچاوەی گرتووە، کە زۆربەی نەتەوەکانی دەوروبەر بە فارس و ڕۆم و عەرەبەوە، پاڵپشتیی مەرامە سیاسییەکانیان کردووە، لە ڕێگەی بەکارهێنانی ئایینەوە، تەنانەت ئەگەر ناچاری هۆنینەوەی ئەفسانەش بووبن، بەمەش زۆرێک لە ئەفسانەی گەلان تێکەڵ بە خودی ئایین بووە و، بۆتە مایەی ئەوەی ڕێبازێکی ئایینی دیاریکراو لە بەرانبەر ڕێبازێکی دیکەی ئایینی دیاریکراودا ئەفسانە بۆ خۆی دروست بکات و بیخاتە ناو ئایینەوە، دواتریش کردوویانەتە مەسەلەیەکی ئایینی و خراوەتە نێو ئایینەوە. بۆیە کە ئایین بە شێوەیەکی ئاسۆیی پەرەی سەندووە، زیاتریش بایەخی بە ڕوخسار و شکڵی دەرەوە داوە و، پانتایی و ڕووبەرێکی ئاسۆیی گرتووە لە ژیانی تاکەکان و لە کۆمەڵگەدا، بەڵام لە ڕووی ستوونی و لە ڕووی تێگەیشتن و وردبوونەوە و تێگەیشتنی ورد لە دەقی ئایینیدا تووشی وەستان بۆتەوە. بۆیە شێوازی دەرەکی ئایین و شتە ڕووکەشییەکانی ئایین و دەستگرتن بە شێواز و سرووتە ئایینییەکان، بە شێوەیکی ئاسۆیی زیاتر بووە، لە کاتێکدا دەبوایە تێگەیشتنی وردتر و قووڵتر دەربارەی دەقە ئایینییەکان هەبوایە. بۆیە مەلای گەورە لە بەرگی نۆیەمی تەفسیرەکەیدا جارێکی دیکە دێتەوە سەر باسی گرنگیی زانست و داهێنان وەک بەرهەمێکی ناوازەی بەکارهێنانی ژیری و دوورکەوتنەوە لە خورافات، بۆیە گلەیی لەو بەناو ئاییندارانە دەکات کە دژایەتیی زانست و عەقڵیان دەکرد، لەو بارەوە دەڵێت: (ئاگایان لە عیلم نەما، کەسێک لە علوومی تەبیعییە بدوایا، ئەیانوت کافرە.. پیاوی وەک ئیبن سینایان تەکفیر دەکرد، خەڵکی ترسان و ڕوویان کردە حیکایات و خوڕافات). لە بارەی زانایانی ڕۆژاواشەوە دەڵێت: (عولەمای تەبیعەت کەوتنە سەعی، ئەسراری تەبیعەتیان گەلێ دەرخست، ئیختراعاتی مودهیشیان کرد، لە هەموو جیهەتەوە بە سەر موسڵماناندا غالب بوون)



عەبدولڕەحمان
سدیق



# بۆچی مەلای گەورە جیاواز بوو؟

هاوکار عەبدوللا شێخ وەسانی

بەسەرنجدان لەچەند گۆشەیەکی ژیانی مەلای گەورە هەوڵدەدەم وەلامی ئەو پرسیارە بدەمەوە، کە ئایا مەلای گەورە جیاواز بووە؟ جیاوازیی مەلا محەمەدی جەلیزادە لەگەڵ مەلایانی هاوعەسری چی بووە؟ بۆ وەلامدانەوەی ئەم پرسیارە، بەگشتیی پێویستمان بەکنە و پشکنینی بەرهەمەکانی دەبێت، بۆ ئەوەی وەک نموونەی بەردەست بۆ سەلماندنی بۆچوونەکەمان، کە بەڵێ مەلای گەورە نەک هەر جیاواز بووە، بەڵکو دەیان ساڵ پێش سەردەمی خۆشی کەوتووەتەوە.

کاتێک سەرنجی نووسینەکانی جەلیزادە دەدەین بۆمان دەردەکەوێت، کە ژیانی پڕە لەڕووداو و کێشمەکێشمی دەوروبەر، چونکە کەسایەتی مەلای گەورە بەجۆرێک بووە هەردەم لەگۆڕانکاریی و بەرەوپێشچوونەکاندا، ئەگەر کارەکتەری یەکەم نەبووبێت، ئەوا دووەم بووە. بۆیە دەبینین کاتی خۆی ئینگلیزەکان و حکوومەتە یەک لەدوا یەکەکانی عێراق گرنگییەکی تایبەتیان پێداوە و بەردەوام وەک ڕێبەرێکی کورد سەیریان کردووە.

مەلای گەورە بەهۆی ئەوەی کە هەڵقوڵاوی نێو کۆمەڵگەی کوردیی بووە، زۆر بەباشی لە واقیعی ئەم کۆمەڵگەیە و بەگوێرەی پێویستی سەردەم تێگەیشتووە و بەردەوام لەگەڵ کۆمەڵگەکەی ژیاوە، وێنەیەکی زۆر جوانی ئیسلامی پیشانی گەلەکەی داوە و ویستوویەتی هەم ئیسلامییەتێکی پاک و هەمیش کوردایەتییەکی بێگەرد لەدڵی تاکەکان بروێنێت.

لای من جیاوازیی مەلای گەورە لەگەڵ زاناکانی دیکە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی، کە مەلای گەورە نە تەنیا مەلا بووە، بەڵکو کەسایەتییەکی سیاسیی و کۆمەلایەتیش بووە، بەردەوام وەک نوێنەر و خەمخۆرێک بۆ گەلەکەی دەرکەوتووە، هەمیشە بڕوای وابووە دەبێت مامۆستای ئایینیی لەژیاندا سەربەخۆ بێت، نابێت چاوی لەحکوومەت و بەرپرسان بێت، دەبێت خۆی هەوڵ بدات ئابوورییەکی سەربەخۆی هەبێت بۆ ئەوەی نەکەوێتە ژێر فەتوادانێکی هەڵە و ناشەرعی. مامۆستا لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت: ئەوی مەلای موسڵمان بێت بچێت قوڕکاری بکات چاکترە، با هەزارجار لەبرسان بمرێت، بۆی نییە بەپێچەوانەی حەق و حەقیقەت فەتوا بدات»١ بۆیە پێموایە مەلای گەورە تەنیا کەسایەتییەکی ئایینیی نەبووە، بەڵکو لەیەک کاتدا بەرجەستەی چەند کارەکتەرێکی گەورەی نێو کۆمەڵگەی کردووە.

پێی وا بووە دەبێت دین وا لە مرۆڤ بکات هەردەم بۆ بەرزی و گەورەیی هەوڵ بدات، هەرگیز خۆی بەبچووک و ژێردەست سەیر نەکات، دەبێت دین پاک بکرێتەوە لەهەموو ئەو ئەفسانە و نەنگی و زیادەیەی، کە پێوەی لکاوە، زۆر بە بوێری هەندێک جار ڕەخنەی لەو دەقانە گرتووە، کە بەناوی فەرموودەی پێغەمبەرەوە (د.خ) خەڵک هان دەدەن بۆ ژێردەستی و دواکەوتن.

ئەو مرۆڤی لەسەر ئەوە ڕاهێنا، کە سەربەست بژێت و بەردەوام بۆ ئازادیی هەوڵ بدات، بەغەیری خودا دەست بۆ هیچ کەس پان نەکاتەوە، بە خەڵکی ڕاگەیاند، کە مەلا و شێخ کەسێکە وەک ئێوە، ئەگەر تێبکۆشن و هەوڵ بدەن لای خودا زۆر لە شێخ و مەلا گەورەتر دەبن. ئەو بەگوێی هەموو جیهاندا چرپاندی، کە ژنیش وەک پیاو مافی هەیە، بەڵکو لە هەندێک ئەرک و مافدا لەسەرووی پیاویشەوەیە، بۆیە هەرگیز ڕێی تێناچێت بەچاوی سووک و بچووک سەیری ژن بکرێ.

مەلای گەورە لەمنداڵییەوە خۆی لەسەر کردار و ئاکاری باش و جوان ڕاهێناوە و وەک گەورەیەک هەستی بە بەرپرسیاری کردووە، ئەوەتا لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت: «ئەمن بەمنداڵی، گەلێ ئیش، برادەرەکانم ئەیان کرد، ئەمن نەم دەکرد، خەیاڵم ئەکرد، ئەمڕۆ ئەو نەوعە ئیشە بکەم، کە بوومە (مەلا) لەسەر مینبەر لەسەر کورسی (وەعز) چ بڵێم؟ چم پێ ئەڵێن؟٢

گرنگترین و پڕ بایەخترین بەرهەمی مەلای گەورە تەفسیرەکەیەتی، پێم وانییە بەبێ خوێندنەوەی ئەم تەفسیرە لەفیکر و زانست و زانایەتی مەلای گەورە بگەین. تەفسیری مەلای گەورە یەکێکە لەشاکارە هەرە گەورە و درەشاوەکانی کتێبخانەی کوردیی، بەجۆرێک بەشایەتی

زۆربەی شەرعزان و موفەسیرەکان ئەگەر ئەم تەفسیرە بەزمانی عەرەبیی کرابووایە دەچووە ریزی تەفسیرە بەناوبانگەکانی جیهانی ئیسلامی (لە ساڵی ٢٠٢٠ لەلایەن مامۆستا عەبدولقادر بەحرکەیی کراوەتە عەرەبیی- دیوان)

کاتێک ئەم تەفسیرە دەخوێنیتەوە هەستدەکەیت ئەم دارشتە لەبیرێکی فەیلەسووفیانە دارێژراوە، کە پابەندی هیچ مەنهەج و مەزهەب و بیردۆزێک نەبووە. بۆیە ئەم تەفسیرە بەلامەوە داهێنانێکی مەزنی مەلای گەورەیە.

لەزۆرێک لەتەفسیری ئایەتەکان، مامۆستا مەلا محەمەدی جەلیزادە هەوڵی داوە زیاتر رەئی خۆی بۆ ماناکەی بەکاربێنێت، واتا زیاتر بەشێوەی عەقڵی تەفسیری کردووە و کەمتر نەقڵی بەکارهێناوە، کەمتر پەنای بردووەتە بەر هێنانەوەی فەرموودە و ئامرازەکانی دیکە. لەمەشدا جۆرێک لەنوێگەری و ئیجتیهادی بەتەفسیرەکە بەخشیوە، چونکە لە تەفسیرکردنی زۆربەی ئایەتەکان هەوڵی داوە زیاتر بە بیر و بۆچوونی خۆی تەفسیری ئایەتەکان بکات. ئەگەرچی هەندێک جار سوودی لەتەفسیرەکانی پێش خۆی بینیوە، بەڵام زیاتر





پشتی بەبیروبۆچوونی خۆی بەستووە، لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت، کە بەهەموو شێوەیەک خۆی پاراستووە لە لاسایکردنەوە (تقلید)ی موفەسیرەکانی پێش خۆی.

مەلای گەورە لەبارەی نووسینی تەفسیری قورئاندا دەڵێت: «لەئەوائیلی حەیاتی عیلمیم، مەیلی موتاڵەعەی تەفسیرم هەبوو؛ جلدی دووەم لەتەفسیری (بەیزاوی) زۆرم لا خۆش بوو تەماشای بکەم؛ لەبەینی زانین و نەزانین بەسەرمان ئەبرد؛ گاه گاه تووشی بەعزێ مەعنای ئەبووم؛ دەماغم قبووڵی نەدەکرد؛ ئیلاهی کەلامی توو، بۆ (حەزرەتی محەمەد)ە و ئەو مەعنایە بێتامە نابێ، قووەتیشم نەبوو شتەکی لێ بڵێم؛ خوایە با بمێنێ وردە وردە (تەرەقی)مان کرد، تاکو لەگەڵێ ئایات مەعنای باشم بۆ ئەهات خیلافی مەعنای جمهوور؛ کەیفم پێ ئەهات؛ نیهایەت هاتە خەیاڵم ئەو چەند مەعنایە بەعینوانی (سائیحات)ی جەلی، تەحریر کەم؛ من گەلێ جار، یەک هەفتە، دوو هەفتە، رادەوەستام، دائیم لەموراجەعە و فیکر و تەصەوڕ بووم؛ بە مەعنای قەوم رازی نەبووم؛ حەتا وا ئەبوو (مەئیووس) ئەبووم؛ بەو حاڵە تەفسیرم پێ ناکرێ، (بعد) جەنابی حەق ئینعامی ئەکرد، مەعنایە مەقبولی خۆم بۆم ئەهات»٣

بوێری و نەترسی خاڵێکی زۆر تایبەت بووە، کە لەمامۆستای گەورە هەبووە، چونکە ئەو هەرگیز قسەیەک، یان فەتوایەکی نەداوە، کە قەتاعەتی تەواوی پێ نەبووبێت و لەگەڵ شەرع و عەقڵ ناکۆک بێت، هەر شتێک بەراستی زانبێت بەئاشکرا گوتوویەتی و هەرچی بەهەڵەشی زانبێت بێ پێچ و پەنا راستەوخۆ رەخنەی لێگرتووە.



**رەنگە لە دوای تەفسیری قورئانی پیرۆز، نامیلکەی (فرێ فرێ قەڵ فرێ) بە بەهێزترینی نووسینەکانی جەلیزادە دابندرێت**



بە سەرنجدان لەرووداو و بەسەرهاتەکانی نێو تەفسیری مەلای گەورە، بۆمان دەردەکەوێت کە مامۆستای گەورە ئاگاداری هەموو رووداو و پێشهاتەکانی سەردەم، سیاسیی، کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری، بووە. ئەو، ئەگەرچی لەشارێکی بچووکی وەک کۆیە ژیاوە، بەڵام بەخوێندنەوەی نووسینەکانی وا هەست دەکەیت لە گۆشەیەکی بەرفراواندا هەموو جیهانی لێ دیاربووە، ئاخر ئەو شەو و رۆژ بەدوای خوێندنەوەی کتێب و زانینەوە بووە، بۆیەش کاتێک باسی شتێک دەکات، هەموو



ئەو بەڵگانەی، کە پێویستن بۆ تێگەیشتنی خوێنەر دەیخاتە ڕوو.

بەشێک لەو قسانەی مەلای گەورە کردوونی هەر مەلایەکی دیکە کردبانی لێی قبووڵ نەدەکرا، بەڵام مەلای گەورە، چونکە بەبێ زانیاری قسەی نەکردووە و بۆ هەر قسە و باسێک دەیان بەڵگەی پێ بووە، بۆیە کەس جورئەتی ئەوەی نەکردووە ڕووبەڕوو ڕەخنەی لێ بگرێت. ئەو جگە لەمەلایەتییەکەی بەردەوام خۆی وەک سەرکردە و ڕێبەری گەلەکەی دەرخستووە، هەوڵی داوە لەهەموو کایەکانی ژیان جێ دەستی دیار بێت.

مەلای گەورە ئەگەرچی لەتەفسیری بەشێک لە ئایەتەکان هەندێک جار لە باسی سەرەکی لایداوە و بەرەو چارەسەرکردنی کێشەیەک چووە، یاخود باسی یەکێک لەئێش و ئازارەکانی میللەتەکەی کردووە، چونکە وەک دەردەکەوێت دڵی پڕ لە حەسرەت بووە بۆ حاڵی موسڵمانان و میللەتی کورد، بۆیە ویستوویەتی لە ڕێگەی تەفسیرکردنی هەندێک ئایەت کەمێک کوڵی دڵی هەڵڕێژێت و ڕاستەوخۆ قورئان ببەستێتەوە بەژیانی واقیعی موسڵمان.

مەلا محەمەدی جەلیزادە ئەگەر بۆچوونی زانایانی پێ باش بووبێت و بە دڵنیاییەوە نووسابێت لەگەڵ تەفسیری ئایەتەکە دایناوە، وەلێ هەندێک جاریش بەتوندی ڕەخنە لەبەشێک لە موفەسیرەکان گرتووە، کە نەیانتوانیوە مانایەکی جوان بۆ ئایەتەکە بکەن و مەبەست بپێکن. بۆ نموونە لەهەندێک شوێندا بەئالووسی دەڵێت «سەییدی ئالووسی مەلایەکی باشە» بەڵام لەهەندێک شوێنیش ڕەخنەی توندی لێگرتووە، کە مانای تەواوی بۆ ئایەتەکە نەکردووە. لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت، مەلای گەورە ئەگەر ڕاستی و جوانییەکی لەزانایەک بینیبێت لەگەڵی بووە و ستایشی کردووە، بەڵام ئەگەر هەڵە و نارێکییەکی لێ بینیبێت (هەڵبەتە بە بۆچوونی ئەو) ئەگەر زانایەکە هەرچەندە گەورە و بەناوبانگ بێت، مامۆستای گەورە بەوپەڕی جورئەتەوە ڕەخنەی لێ گرتووە و هەڵەکەی بۆ ڕاستکردووەتەوە، بێ ئەوەی گوێ بداتە لۆمەی نەیارانی.

هەربۆیە دەبینین ئەگەرچی زەمەنێکی زۆر بەسەر نووسینەکانی مامۆستای گەورە تێپەڕیوە، وەلێ گیانی نەمرییان بەبەر کراوە و وا هەست دەکەیت بۆ ئێستای خوێنەری کورد نووسراون، چونکە مەلای گەورە کەسێک بووە کاتێک شتێکی گوتووە جگە لەحەق کەسی نەناسیوە، بوێری و زانستی ئەوەندە زۆربووە لەهیچ مەسەلەیەک دۆش دا نەماوە.

«

بەشێک لەو قسانەی مەلای گەورە کردوونی هەر مەلایەکی دیکە کردبانی لێی قبووڵ نەدەکرا، بەڵام مەلای گەورە، چونکە بەبێ زانیاری قسەی نەکردووە، بۆیە کەس جورئەتی ئەوەی نەکردووە ڕووبەڕوو ڕەخنەی لێ بگرێت

»

مەلای گەورە لەسەر چەند جومگەیەکی سەرەکی کۆمەڵگە کاری کردووە، کە کاتی خۆی تەقینەوەیەکی گەورەی ڕۆشنبیریی بەدوای خۆیدا هێنا تائێستەش کاریگەری ماوە. چونکە ئەو قسەی لەشتانێک کردووە پێش ئەو ئاماژەکردن بۆیان یاساغ بووە، ئەو دژی هەموو ئەو مەلایانە بووە، کە دژی پێشکەوتن و هەوڵی چاندنی خورافە لە دەماغی خەڵکی دەدەن. هەروەها بەردەوام بەربەرەکانێی ئاغا و شێخی تەڵەکەبازی کردووە، کە بەناوی دین خەڵک دەچەوسێننەوە. چاکسازیی هەرە گەورەی لەبواری دینەوە بووە، هەمیشە ئەم قسەیەی دووپاتکردووەتەوە کە عەقڵی باش لەگەڵ دینی ڕاست زۆر گونجاون، بۆیە نابێت مرۆڤ دین لە ناقیل و قاڵ و قیل وەربگرێت، بەڵکو دەبێت بگەڕێنینەوە سەر چاوگی سەرەکی.

لێرەدا هەوڵدەدەم چەند نموونەیەکی کورت لەتەفسیرەکەیدا بۆ بەرچاوی ڕوونی خوێنەران بخەمە ڕوو:

- «لە مێژە، هاوار ئەکەم: ئەی بەنی ئادەم خوا ئەیزانێ، نە ڕوئەسای دین، نە ڕوئەسای دنیا، نە دیموقراتی، نە ئیستیقراتی، نە دکتاتۆری، نە شیوعی، نە نازی، هیچ کەس بۆ صەلاحی حاڵی ئێوە سەعی ناکا؛ هەرکەس بەناوێ، هەڵخەتێنە، دوای مەقصەدی خۆی ئەکەوی»(٤).

- مەلای گەورە هەوڵی داوە تەفسیری هەندێک ئایەت بەشیعر بکات، وەک لەتەفسیری بەشێکی ئایەتی (٣٤)ی سورەتی لوقمان دا [وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًا] دەنووسێت: سبەی چی ئەکا؟ وەک (حاجی) ئەڵێ:

ئەمین مەبە لەسبەینێ کە چت بەسەر دێنێ

حەوادیساتی زەمانە کە نایەتە تەخمینێ

- هەندێک جار دوای ئەوەی مانایەکی تێر و تەسەل بۆ ئایەتەکان دەکات دووبارە بەشیعریش جۆرێک لەمانا بە ئایەتەکە دەبەخشێت، بۆ نموونە

دوای ئەوەی تەفسیری ئایەتی (٢٧)ی سورەتی فاتر دەکات، بەم شێوەیە گلەیی لەمەلایان دەکات، کە کەم ڕوو دەکەنە زانستی تەبیعەت:

***مەلای نادان بەعنوانی شەریعەت***
***حەرامی کرد لەتۆ عیلمی تەبیعەت***
***لەبێیە هەرچی لەو عەرەبە بەدەرکەوت***
***لەژێر و زیو پۆلا و پاقلا و نەوت***
***بەکوللی کەوتە ژێر دەستی فەرەنگان***
***چیاو چۆلان دەتۆپن وەک پلنگان***
***بیان تۆپێ چیایان چۆن ئەکولن***
***هەتا کەی ئێوە هەر بەرمال بەکۆلن؟***

مامۆستا لەدێرە شعرێکی دیکەدا دەڵێت:

***(عیلم)ی (تەبیعەت)، (عیلم)ی خودایە؛***
***(قال)ە و (قەول)ە گشتی (هەبا) یە٦***

- لەتەفسیری ئایەتی (١٨)ی سورەتی تەکویردا [وَالصُّبْحِ إِذَا تَنَفَّسَ] دەنووسێت: هەناسەی هەڵکێشان و داکێشان، ئۆخەی نازانم کوێ بنووسم؟ (کأنهُ) لەژێر باری گران هاتبێتە دەرێ، حەقیقەتەن سەر لەسبەینان (نەسیم)ێ فێنک دێ، زۆر خۆشە -- خاصەتەن لەهاویندا

(نالی) ئەڵێ:

***هەناسەم زولفەکەی لادا و مەیلێکی نەکرد چاوی***
***نەسیم ئەنگوت وشەو ڕابردونەرگس هەرلەخەودایە٧***

مامۆستا مەسعوود محەمەد بەهۆی زۆر پەیوەستبوونی بەهەڵوێست و بۆچوون و قسە و کردارەکانی باوکی هەرگیز نەیتوانیوە بۆ ساتێکیش لەژێر کاریگەری گەورەیی باوکی دەربچێت، هەستی خۆ بەکەمزانین بەردەوام لەئاست گەورەیی باوکیدا پەنگی خواردووەتەوە. بۆیە ئەگەر سەیری کتێبەکانی مامۆستا مەسعود بکەین هەمیشە خۆی بەبچووک دادەنێت لەبەرانبەر باوکێکی گەورە، کە بە (مەلای گەورە) مەشهوور بووە. مامۆستا مەسعوود وەک کوڕی مەلایەکی زانا و ناسراوی کوردستان بیروبۆچوونەکانی باوکی تیادا بەتەواوی ڕەنگی داوەتەوە بەجۆرێک لەنووسین و بۆچوونەکانی سەرسامییەکی زۆر دەبینرێت.

کاریگەریی و ڕێز و خۆشەویستی مەلای گەورە ئەوەندە زۆر بووە تەنانەت لەدوای مردنیشی وەک



مانگی چواردە دەربکەوێت لەسەری، وەک دەڵێت: «باوکم تاکە مرۆڤێکە تەفسیری بێسنووری لێم کردبێ»٨ «من قەرزداری باوکمم لە ئیمان هێنان بەحەق و ڕاستی»٩ «مەرگی باوکم گەورەترین کۆست کەوتن بووە لەهەموو ژیانمدا»١٠

لەسەردانێکم بۆ لای (مامۆستا فارووق)ی کوڕی مەلای گەورە بۆی باس کردم، کە «شنەی بای ژیاری خۆراوا و بیر و باوڕی پێشکەوتنخوازی شۆڕشی فەرەنسی و ئۆکتۆبەری ڕووسی، کاریگەری زۆریان هەبووە لەسەر مەلای گەورە».

زانای گەورەی کورد (مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەریس)یش سەرسامی خۆی بەگەورەیی و دانایی مەلای گەورە دەربڕیوە لەکتێبەکەیدا (عُلماؤنا في خدمة العِلم والدین) دەڵێت: «زانای فرەزان، تاقانەی چاخ و سەردەم، ڕۆڵێکی گەورەی هەبووە لەبزووتنەوەی زانستیی و ئاراستەکردنی فەقێکانی و موسڵمانان بەگشتیی بۆ بێداربوونەوە و پشت بەخۆ بەستن و ئاراستەکردنیان بۆ کارە ئەستەمەکان. ڕاستییەکەی ئەو کاریگەرییەکی باڵای هەبوو، تاک و تەنیا بوو لەزانست و گەورەیی و بوێری و شەهامەت و جەسووری و بەب ڕشتی قەڵەم، دەربڕینێکی وازعانە و زمانێکی ڕەوان، ئەگەر هەندێک بەبڕشتی نەبوونایە خەڵکێکی زۆرتر سوودیان لێ وەردەگرت، دەیویست زانایان سەربەخۆ و جوامێرانە کاربکەن بۆ ئاراستەکردنی موسڵمانان و ڕێکێفی کارە گرنگەکانی گرتبۆوە دەست»١١

## پەراوێزەکان:

١- تەفسیری کوردی لە کەلامی خوداوەندی مەلا محەمەدی جەلیزادە، بەرگی ١، ل: ١٩٢

٢- هەمان سەرچاوە، بەرگی ١٠، ل: ٥٥٢

٣- هەمان سەرچاوە، بەرگی ١٠، ل:٧٢٣ - ٧٢٦

٤- هەمان سەرچاوە، بەرگی ٩، ل: ٢٣١

٥- هەمان سەرچاوە، بەرگی ٧، ل: ٢٣٥

٦- هەمان سەرچاوە، بەرگی ٥ ل: ٤٦ و بەرگی ٨ ل: ٨٣

٧- هەمان سەرچاوە، بەرگی ١٠، ل: ٤٠٢

٨- گەشتی ژیانم، مەسعوود محەمەد، ل: ٢٢

٩- ژیان و ئەزموونی مەلای گەورە، هاوکار عبدوللا شێخ وەسانی، ل: ٨٧

١٠-گەشتی ژیانم، مەسعوود محەمەد ، ل: ٢٤١

١١-عُلماؤنا في خدمة العِلم والدین، عبدالکریم المدرس، ل: ٥٣٤



# مەلای گەورە
# لەزاری مەسعوود محەمەدی کوڕیەوە

ئامادەکردنی: نیوان

ناحەزەکانی بریتی بوون لەمانە: زۆردار، ئەفسانە پەرست، مێشک وشک و دوژمنی کوردایەتی، بەڵام لەژیانی خۆیدا کەسێک لە ناحەزانی زاتی نەکرد بەنووسین ناوی بەخراپە بهێنێ، وەیا ڕووبەڕووی دەنگ هەڵبێنێ.

ئەم مرۆیە لەسەرەتای ژیانی، هەر لە منداڵیەوە، ئاکاری زەکا و لێهاتوویی پێوە دیار بووە، لەمەشدا سەیر پێ هاتن جێی نابێتەوە چونکە بەعادەت منداڵی ساوا بەخۆی و خەسڵەتەکانیەوە قراژی دەبێت. یەکێک لە بەڵگەکانی ئەم لایەنەدا لەوەدا دەدیترێ کە ئەو دەمەی (خاتو زەینەب حەزینە) بۆ حاجی مەلا عەبدوڵڵا دەگوێزرێتەوە هەرچی دیارییەکی بۆ باوکمی هێنابوو بۆی گەورە بوون، باوکم ٦ – ٧ ساڵی بووە، دیارییەکانیش بۆ مێردمنداڵەی ١٠ – ١٢ ساڵی هاتبوون (حەزینە) گوتبووی: ئەو قسە و ڕەفتارەی لەکاک حەمەدیان دەگێڕایەوە تەمەنی ئەو دیارییانەی ڕادەگەیاند. (مەسعود محەمەد، ٢٠٠٩، ٩- ١٠).

خوێندنی باوکم لەچاو دەوروبەری خۆی و باری ئەو سەردەمەدا هەروەک لەڕووی بەسەر بردنەوە لەهی خەڵقی دیکە جودا بووە، هەروەها لەلایەن چەند و چۆنیشەوە کەممانەند بووە. خەست خەست لەگەڵ مامۆستاکانی، دواتریش لەگەڵ باوکی، خەریکی ساغکردنەوەی کتێبە زانستییەکانی مزگەوت بووە و هەموو دڵ و مێشکی خۆی بەو کارە بەخشیوە. لەتەمەنی ١٧ ساڵەیدا بۆ ماوەی یەک ساڵی تەواو لەمزگەوتی گەورە دەرنەچووە. دەیگێڕایەوە، چۆن لەو ساڵانەی خوێندندا عیشقێکی زانست و کەشفی غەیب دەروون و هەست و هۆشی داگیر کردبوو، چەند بەئاسانی گرێی شوێنە ئاستەنگەکانی کتێبە سەرسەختەکانی مزگەوتی بۆ دەکرانەوە، دەیگوت: لەو ساڵەدا کە هەنگاوم ئاودیوی دەرگەی مزگەوتی گەورە نەبوو، شەوانە بە درەنگە کاتی نزیک بەیانییەوە دەچوومە حەرەمی مزگەوت، لەتاریکایی و خامۆشیدا دەکەوتمە باوەشی زکر و فکری ئەوتۆوە کە هەر لەو تەرزە باری نەفسی ئارامدا، بەدڵ و دەروونەدا تێ دەپەڕێ لەو هەنگاوە تازەیەی عومردا شەو لەدوا شەو لەحەرەمی مزگەوت هەستم دەکرد نوورێکی سەوز ئەو ناوەی دادەگرت و وەهای پێ ئارام دەبووم لەدەروونمدا ورتەی ناڕەزامەندی یەکجارەکی خامۆش دەبوو... لەژێر سایەبانی ئایەتی (رضي الله عنهم ورضوا عنه)دا خۆم لەحاڵەتی ڕەزامەندی نێوان بەندە و خالقدا دەدیت. گەش گەش لەبیرمە گوتی: ئەو ڕوونی و شەفافیەتەی تەمەنی ١٧ – ١٨ ساڵەییم بەیەک لوقمەی حەرام دۆڕاند، بەڵام نەیگوت لوقمەکە چی بوو، لەکوێوە هات. منیش لەو تەمەنەی ١٠ – ١٢ ساڵیمدا نەمپرسی چ لوقمەیەک، چۆنا و چۆنی؟ دواتریش بۆی نەگەڕامەوە، شەرم و شکۆ ڕێی پێ نەدام بپرسمەوە. بەڵام دیارە دەبێ لوقمەکە لەدەرەوەی مزگەوتەکە بۆی هاتبێت چونکە ئەوسا لەمزگەوت دەرنەدەچوو جا بزانە دیارییەک لەدۆستێکەوە یان جەمە نانێک لەخزمێکەوە بۆی چۆتە مزگەوت ئەو تەئسیرەی بووە (مەسعود محەمەد، ٢٠٠٩، ١٠ – ١١)

باوکم لە ١٨ ساڵی ئیجازەی لەباوکی (حاجی مەلا عەبدوڵڵا) وەرگرت و لەجێی ئەو دەرسی دەگوتەوە، هەر لەسەردەمی ئەویشدا زۆربەی ئەرکی مەلایەتیی دوو مزگەوتی حاجی مەلا ئەسعەد و هی مزگەوتی گەورە کەوتە سەرشانی. لەتافی هێز و تاقەتیدا ڕۆژی ٢١ دەرسی گوتۆتەوە. حاجی مەلا عەبدوڵڵا گەیاندبوویە ٢٤ دەرسی ڕۆژانە. هەندێک لەمامۆستایانی خۆی ئیجازەیان لێ وەرگرت. لە ٢٥ ساڵی کچە مامێکی خۆی لێ مارە کرا (نەعیمەی مەلا حەبیبی حاجی

> باوکم (خطیب) بوو، بەڵام (خطیب)ێک کە بتوانێ بە کوردی و عەرەبی و تورکی و فارسی تا حەز بکات لە سەر بابەت بدوێ بێ حازرکردن و بێ کاغەز و بێ ئەوەی پێشتر ئاگادار بووبێ لە چ دەدوێ



# مەلای گەورە
# لەزاری مەسعوود محەمەدی کوڕیەوە

ئامادەکردنی: نیوان

ناحەزەکانی بریتی بوون لەمانە: زۆردار، ئەفسانە پەرست، مێشک وشک و دوژمنی کوردایەتی، بەڵام لەژیانی خۆیدا کەسێک لە ناحەزانی زاتی نەکرد بەنووسین ناوی بەخراپە بهێنێ، وەیا ڕووبەڕووی دەنگ هەڵێنێ.

ئەم مرۆیە لەسەرەتای ژیانی، هەر لە منداڵیەوە، ئاکاری زەکا و لێهاتوویی پێوە دیار بووە، لەمەشدا سەیر پێ هاتن جێی نابێتەوە چونکە بەعادەت منداڵی ساوا بەخۆی و خەسڵەتەکانیەوە فراژی دەبێت. یەکێک لە بەڵگەکانی ئەم لایەنەدا لەوەدا دەدیترێ کە ئەو دەمەی (خاتو زەینەب حەزینە) بۆ حاجی مەلا عەبدوڵڵا دەگوێزرێتەوە هەرچی دیارییەکی بۆ باوکمی هێنابوو بۆی گەورە بوون، باوکم ٦ – ٧ ساڵی بووە، دیارییەکانیش بۆ مێردمنداڵەی ١٠ – ١٢ ساڵی هاتبوون (حەزینە) گوتبووی: ئەو قسە و ڕەفتارەی لەکاک حەمەدیان دەگێڕایەوە تەمەنی ئەو دیارییانەی ڕادەگەیاند. (مەسعود محەمەد، ٢٠٠٩، ٩- ١٠).

> **باوکم (خطیب) بوو، بەڵام (خطیب)ێک کە بتوانێ بە کوردی و عەرەبی و تورکی و فارسی تا حەز بکات لە سەر بابەت بدوێ بێ حازرکردن و بێ کاغەز و بێ ئەوەی پێشتر ئاگادار بووبێ لە چ دەدوێ**

خوێندنی باوکم لەچاو دەوروبەری خۆی و باری ئەو سەردەمەدا هەروەک لەڕووی بەسەر بردنەوە لەهی خەڵقی دیکە جودا بووە، هەروەها لەلایەن چەند و چۆنیشەوە کەممانەند بووە. خەست خەست لەگەڵ مامۆستاکانی، دواتریش لەگەڵ باوکی، خەریکی ساغکردنەوەی کتێبە زانستییەکانی مزگەوت بووە و هەموو دڵ و مێشکی خۆی بەو کارە بەخشیوە. لەتەمەنی ١٧ ساڵەیدا بۆ ماوەی یەک ساڵی تەواو لەمزگەوتی گەورە دەرنەچووە. دەیگێڕایەوە، چۆن لەو ساڵانەی خوێندندا عیشقێکی زانست و کەشفی غەیب دەروون و هەست و هۆشی داگیر کردبوو، چەند بەئاسانی گرتی شوێنە ئاستەنگەکانی کتێبە سەرسەختەکانی مزگەوتی بۆ دەکرانەوە، دەیگوت: لەو ساڵەدا کە هەنگاوم ئاودیوی دەرگەی مزگەوتی گەورە نەبوو، شەوانە بە درەنگە کاتی نزیک بەیانییەوە دەچووم حەرەمی مزگەوت، لەتاریکایی و خامۆشیدا دەکەوتمە باوەشی زکر و فکری ئەوتووە کە هەر لەو تەرزە باری نەفسی ئارامدا، بەدڵ و دەرووندا تێ دەپەڕێ لەو هەنگاوە تازەیەی عومردا شەو لەدوا شەو لەحەرەمی مزگەوت هەستم دەکرد نوورێکی سەوز ئەو ناوەی دادەگرت و وەهای پێ ئارام دەبووم لەدەروونمدا ورتەی ناڕەزامەندی یەکجارەکی خامۆش دەبوو... لەژێر سایەبانی ئایەتی (رضي الله عنهم ورضوا عنه)دا خۆم لەحاڵەتی ڕەزامەندی نێوان بەندە و خاڵقدا دەدیت. گەش گەش لەبیرمە گوتی: ئەو ڕوونی و شەفافیەتەی تەمەنی ١٧ – ١٨ ساڵەییم بەیەک لوقمەی حەرام دۆڕاند، بەڵام نەیگوت لوقمەکە چی بوو، لەکوێوە هات. منیش لەو تەمەنەی ١٠ – ١٢ ساڵیمدا نەمپرسی چ لوقمەیەک، چۆنا و چۆنی؟ دواتریش بۆی نەگەڕامەوە، شەرم و شکۆ ڕێی پێ نەدام بپرسمەوە. بەڵام دیارە دەبێ لوقمەکە لەدەرەوەی مزگەوتەکە بۆی هاتبێت چونکە ئەوسا لەمزگەوت دەرنەدەچوو جا بزانە دیارییەک لەدۆستێکەوە یان جەمە نانێک لەخزمێکەوە بۆی چۆتە مزگەوت ئەو تەئسیرەی بووە (مەسعود محەمەد، ٢٠٠٩، ١٠ – ١١)

باوکم لە ١٨ ساڵی ئیجازەی لەباوکی (حاجی مەلا عەبدوڵڵا) وەرگرت و لەجێی ئەو دەرسی دەگوتەوە، هەر لەسەردەمی ئەویشدا زۆربەی ئەرکی مەلایەتیی دوو مزگەوتی حاجی مەلا ئەسعەد و هی مزگەوتی گەورە کەوتە سەرشانی. لەتافی هێز و تاقەتیدا ڕۆژی ٢١ دەرسی گوتوتەوە. حاجی مەلا عەبدوڵڵا گەیاندبوویە ٢٤ دەرسی ڕۆژانە. هەندێک لەمامۆستایانی خۆی ئیجازەیان لێ وەرگرت. لە ٢٥ ساڵی کچە مامێکی خۆی لێ مارە کرا (نەعیمەی مەلا حەبیبی حاجی



مەلا ئەسعەد) لەو ئافرەتە چەند منداڵێکی بەرهەم هاتن بەڵام لە کچێکی بەو لاوە ئەوانی دیکە هەموویان بەر لەخۆی و زۆربەشیان بەمنداڵی مردن... دەنگوباسی زیرەکی و بلیمەتیی کوڕێکی (عەبدولحەمید) کە لەتەمەنی ٧-٨ساڵیدا دەمرێ دەمـاودەم دەگێردرایەوە و جێی سەرسوڕمان بوو، بەڵام باوکم خۆی باسی زەکای کوڕێکی دیکەی دەکرد کەوا بەر لە عەبدولحەمید هاتبوو بەمنداڵیش مردبوو، دەیگوت ئەگەر ئەو منداڵەم بۆ ژیابایە ژنم نەدەهێنایەوە. بەهەرحاڵ وەچەی یەکەم خێزانی سـەر لـەبـەریـان بـێ ئـاسـەوار برانەوە. خۆم گوێ بیستی باوکم و مامم (شێخ نوورەددین) بووم کە دوای چەند ساڵێک لەمردنی خێزانی یەکەمی بەئیلحاحی خزم و دۆستانی، باوکم ڕازی بووە بۆ دووەم جار ژن بهێنێتەوە. هەر لە گەنجایەتییەوە دووچاری زگ ئێشەیەکی بەئازار بووە (لەساڵانی دوایی ژیانیدا بەدیکرا کە – قرحه المعده- یە) دەیگوت زۆر جاران کە ژانەکە شیددەتی دەستاند لەخۆم بێئومێد دەبووم ئیتر چۆن زات بکەم ژن بهێنم؟ ساوایەکی هاتبێتە کایەوە بەسەر کێیدا بەجێ بهێڵم؟ بەڵام ڕێکەوت وەها بوو، بەدەم ڕاگرتنی پارێز و خۆپاراستنەوە بۆ ماوەی چەندین ساڵ دەردەکەی کزتر بوو تا ئەوەی خەڵق هەستی نەدەکرد چ ناساغیی پێوە دیار بێ. ئەو کوانەی مەعیدە نەبووایە لەلایەن تەنسازیەوە چ نوقسانی نەبوو، هەتا ژیا پێویستی بەچاویلکە نەبوو، داروەکازیشی بەکارنەهێنا. ئەو نەساغیەی باوکم بەپێی گێرانەوەی خۆی لەزێدە مەیلی وەلای سرکە و شفتە، سرکە و کەبابەوە تووشی بووە. زۆر جاران کە منداڵ بووم، لوقمەی چەوری پێ دادەنامەوە و دڵی ڕەوای نەدەدا بچێتە هەناومەوە. ئەگەر خۆم پێ نەگیرایە وەهای دەکرد شتێکی مەزەداری بەدوادا بخۆم کە یارمەتی هەزم بدات. خێزانی دووەمی کە دایکی منە (حەبیبەی کچی شێخ ڕەزای کوڕی شێخ قادری سندۆڵانە – کە مەشوور بوو بە قادر سەرڕووت) لەبنەماڵەی ساداتی بەرزنجە بوو (سەندۆڵان) دێیەکە بەسەر زێی بچووکەوە نیو سەعاتە ڕێیەک بەسواری وڵاغ دەکەوێتە لای قیبلەی قەلادزەوە (مەسعود محەمەد، ٢٠٠٩، ١٢ – ١٣).



باوکم کچێکی خۆی لەشێخ حەسەنی حاجی سەیید گوڵ مارە کرد. تاقە کچێک لەو ژن و مێردییە بەرهەم هات ئەویش لەتەمەنی ١٠ – ١٢ ساڵی جوانەمەرگ بوو. لە ١٩٥٤ ئەو خوشکەم، کە لەدایکی من نەبوو، دنیای جێهێشت. لەمەوە دەردەکـــەوێ خزمـایـەتـیی ئـێمـەی جـەلـیـزادە، بەتێکڕایی، لەگەڵ پژدەر لـەوەوە دێت کە چەند پشتێکمان لەبێگەلاسی پژدەردا ژیاون. دواتریش بەهۆی پەیوەندی خزمایەتی نێوان باوکم و شێخانی سندۆڵانەوە دۆستایەتییەکە نوێتر و بەهێزتر بـووە. لـەلایـەن خـۆمـەوە پێوەندیم بەسندۆڵانەوە هێندەی پەیوەندیم بەجەلیزادانەوە مەحکەمە (مەسعود محەمەد، ٢٠٠٩، ١٤).

مەلیک فەیسەلی یەکەم لە هەولێر پێشوازیی لێ دەکرا، ئێوارە بەلەدیە لەیانەی فەرمانبەران داوەتێکی گێڕا لەسەر شەرەفی مەلیک، مەلا ئەفەندی و باوکم بۆ داوەتەکە لە (باداوە)وە هاتن بۆ هەولێر من منداڵێکی ١٠ – ١٢ ساڵی بووم لەخزمەتیاندا هاتم. لەبەر دەرگەی نادی ئۆتۆمۆبیلەکەی مەلا ئەفەندی و هی موتەسەڕیفی هەولێر لەیەک کاتدا وەستان و خەڵقەکەیان لێ دابەزی. موتەسەڕیف سڵاوێکی کرد و پێش مـەلا ئەفەندی و باوکم کەوتەوە بەرەو شوێنی داوەتەکە، باوکم هەنگاوی هەڵێنا و دەستی موتەسەڕیفی گرت و پێی گوت: جارێ نۆرەی ئێمەیە. موتەسەڕیف، ماڵم حەقە، بەسەرەخۆی نەهێنا و گوتی، مـرازم ئـەوە بوو ڕێبەڵەدی بکەم نەکا ئێوە شـارەزای شوێنەکە نەبن، باوکم پێی گوتەوە، باش شـارەزایـن و )

> لەبیرمە گوتی: ئەو ڕوونی و شەفافیەتەی تەمەنی ١٧ – ١٨ ساڵەییم بەیەک لوقمەی حەرام دۆڕاند، بەڵام نەیگوت لوقمەکە چی بوو، لەکوێوە هات



> باوکم لە ١٨ساڵی ئیجازەی لە باوکی (حاجی مەلا عەبدوڵڵا) وەرگرت و لە جێی ئەو دەرسی دەگوتەوە

نشکرکم( ئیتر مەلا ئەفەندی و باوکم لەپێشەوە و موتەسەڕیف بەدوایانەوە بەرەو کومەڵەی داوەت کراوانـەوە ڕۆیشتن، خەلقیش کە جەمبوورەی بەستبوو بـەدەوری نادییەوە چاو ئەبڵەق بوون. هەر لەو داوەتـەدا باوکم هێندێ قسەی بەمەلیک گوت گەلێک بەولای ڕاگرتنی موتەسەڕیفەوە بوو. خوێنەر دەبێ وردبێتەوە لەڕاگەیاندنی ئەو جۆرە هەڵوەستە، لەهەزار مەلا یەکێکی زات ناکا قوڵی مودیر ناحیە بگرێت و بەدوای خۆیەوە بدا، هەر نەبێ لەبەر ئەوەی کە دەزانێ بۆی ناچێتە سەر لەوە هەر بگەڕێ کە نان بڕانی تێدایە کە مەلاش زات نەکات کەسی دیکە زات ناکات. ئەدی چۆن مەلای کۆیێ موتەسەڕیفی دواخست و دواتریش قسەی بەمەلیک فەیسەڵ بڕیـەوە؟ لـەبـەر ئەم هۆیانە:

- خۆی لەسەر هەق دەزانی.

- بـڕوای بێسنووری بـەخـۆی و کەسایەتیی خۆیەوە هەبوو، تا ئـەوەی ڕەفتارەکە بەلایەوە وەک ئاو خواردنەوە بوو.

- ترس و تەمای لەدڵدا نەمابوو.

- بەخۆیدا ڕادەپـەڕموو زاڵ بێت بـەسـەر هەر ئەنجامێکی لەو هەڵوەستانەدا بکەوێتەوە.

- شەرمی لەخۆی دەهاتەوە لەئاست داخوازی هەڵکەوت خامۆش بێت.

- کەرەستەی هەموو هەڵوەستێک و هەڵکەوتێکی، لەوانەی بێنە بەر هەنگاوی مرۆی وەک خۆیەوە، بەزیادەوە هەبوو: هەر لەزمانی پاراو تا ڕەوانبێژی تا زانستی سـەردەم تا مێژووی گـەلان تا دڵی هۆشیار تا جورئەتی بێسنوور.

- بەگژ نارەواییدا دەچۆوە نەک ڕەوایی.

- مەلایەتی بـەلای ئـەوەوە ژووررووی هەموو پایەیێکەوە دەهات (مەسعود محەمەد، ٢٠٠٩، ١٩)

ئـەم حـەفت هـەشت خـاڵـەی سـەرەوە، کە بەشێکی کەسایەتیی باوکم دەگرنەوە، لەهەموو هەڵوەستەکانیدا بەدەر دەدەنـەوە، لەزۆرێکیشەوە ئەو خەسڵەتانەی چەسپاو بوون. بگەڕێوە بۆ ڕۆژگارێک، کە تازە بەتازە ببووە جێگری باوکی، لـەیاداشتـەکـەی ڕەحـمـەتـی مـەلای چۆڕستانی

دانیشتووان لە چەپەوە: ساڵح بەکر ساحێبقڕان (قائیمقامی کۆیە)، مەلای گەورە، عەبدولڕەحمان خدر (بەڕێوەبەری ناحیەی تەق تەق)، ؟
وەستاوەکان: منداڵەکە کوڕی قائیمقام، مەجید نورەدین، محەمەد خەلیفە - ساڵی ١٩٣٠



حبینیت، کە چۆن باوکم دوای ساڵێک لە وەفاتی حاجی مەلا عەبدوڵڵای باوکی خوتبەی جومعەی بێ کاغەز خوێندۆتەوە و بە تێهەڵکێش قسەی بردۆتەوە بۆ تێپەڕینی ساڵێک بەسەر مەرگی باوکیدا و .. و .. هەر ئەم قابیلیەتە بوو لەموناسەبەیەکی ڕەسمیدا بەهانای هات بتوانێ گوتارێکی یەک دوو سەعاتی سەرپێیی بدات ڕووبەڕووی ئاپۆڕەی خەڵقی شاری موسڵ و هەرچی دەستەودایەرەی حکومەت هەیە بەمەدەنی و عەسکەرییەوە و هەموو گەورە پیاو و مەلا و مەشایێخی موسڵ و هەرێمی ئەو ناوە... بەدوا ئەو گوتارەدا (سلێمان نظیف) والی موسڵ ئەو پایەی لێ نا کە پێشتر بۆ حاجی مەلا عەبدوڵڵای ڕەچاو دەکرد... مناسبی جێگەیە بڵێم، باوکم دەیگێڕایەوە کە (سلێمان نظیف) پێی گوتووە: دەزانم عالەم ڕووت لێ دەنێن بۆ کارگوزاری خۆیان لای من. تۆش هەر ئیشێکی بەلاتەوە مەبەست بوو، لەو نامەیە کە پێوە دەینێری بۆم، یەک بەیتی شێخ ڕەزای تاڵەبانی تێچینی قسەکان بکە تا جێبەجێ کردنی لەگوماندا نەبێ، ئەو نامەیەی بەیتی شێخ ڕەزای تێدا نەبێ دەبێتە کاری دوو بەختی...

باوکم مەلا بوو بەڵام مەلایەک کە بتوانێ لەهەموو زانستەکانی ئیسلامدا کتێب دابنێ، تەنانەت لەگەڵێک مەسەلەدا (اجتهاد)ی خۆی بەکار دەهێنا. بەدرێژایی عومری مەلایەتی خۆی دەرسی گوتبێتەوە یەکسەر بێ ئامادەکردن دەرسی گوتۆتەوە. دەمدیت کە دەکەوتە سەر شەرح و تەقریری دەرسەکان وەک تاڤگە قسەی لێ هەڵدەڕژان. ناوناوە لەگەرمەی تەقریدا هەڵوەستێکی دەکرد و چاوی دەبڕیە شتێکی نادیار. دەیگوت لەو تەرزەحاڵەتەدا چەند ڕێبازێکی شەرح بۆم دەکرێنەوە، لەو هەڵوەستەدا یەکێکیان پەسەند دەکەم. واش دەبوو کە پێویست بەشەرح نەبووبێت بەچەند قسە و هێمایەک لەدەرسەکە دەبۆوە (مەسعود محەمەد، ٢٠٠٩، ٢٠).

باوکم (خطیب) بوو، بەڵام (خطیب)ێک کە بتوانێ بەکوردی و عەرەبی و تورکی و فارسی تا حەز بکات لەسەر بابەت بدوێ بێ حازرکردن و بێ کاغەز و بێ ئەوەی پێشتر ئاگادار بووبێ لەچ دەدوێ. باوکم لەدەروونـدا ئیمانی بە (حەق) هێنابوو. لەو ئیمانەدا تێکڕای بوونەوەر لەبەرچاو و لەبار تەبعی جۆرێک لەنگەری بەستبوو کە ئیتر گۆڕانی باری بوونەوەر نەتوانێ لەنگەر بەستنەکە تێک بدات، بۆیە بوو هەرگیز لەبارێکەوە بۆ بارێک نەدەگۆڕا. لەماڵەوە و لەمزگەوت و لەنێوان ئاپۆڕەی خەڵق و لای دەستەڵاتدار و بێدەستەڵات یەک زەڕڕە فەرق بەقسە و بەڕەفتاری نەدەکرا، چ لەژووری خۆی تەنها بایە و کتێبێکی خوێندبایەوە و چ لەدیوەخان یان لەمزگەوت لەگەڵ خەڵق دانیشتایە یان لەهەر هەڵکەوت و هەڵوەستی دیکەدا بایە هەمان ڕەفتاری دەکرد، واتە تەنها بایە و خەڵق دیار بایە بایی سەری موویەک حەرەکە و سەکەنەی نەدەگۆڕا، هەر بەقەدەر ئەوەی شەرم لەسێبەری خۆی بکات شەرمی لەخەڵق دەکردەوە. من بەلای کەمەوە دە ساڵێک، بەر لەوەفاتی، گەیشتبوومە تەمەنێک مانای شتان تێبگەم (٢٤ ساڵی بووم کە وەفاتی کرد) لەو دە ساڵەدا بەو لای هەموو سنوورێکەوە ئەم دیاردەیەی لەنگەربەستن و نەگۆڕانم لەو مرۆڤەدا بەدی دەکرد تا ئەوەی هەندێجار بەلای خۆشمەوە



❝
لە هەزار مەلا یەکێکی زات ناکا قۆڵی مودیر ناحیە بگرێت و بەدوای خۆیەوە بدا، ئەدی چۆن مەلای کۆیێ موتەسەریفی دواخست و دواتریش قسەی بە مەلیک فەیسەڵ بڕیەوە؟
❞



دیاردەکە ئاشنا خۆی دەنواند، هەر دەتگوت بەسەر مەتەڵێکدا دەنوڕم کە باشی تێناگەم. وا بزانم ئەو قاڵبوونەوەی بۆ حەق، کە گوفتار و ڕەفتاری یەکچوون کردبوو، یەکێک بوو لەهۆی ئەو هەیبەتەی کە لەو مەجلیسە دەنیشت ئەوی تێدا بایە، لەمەجلیسی دانیشتن بگەڕێین و سەیری ئەو ڕێگەیە بکەین کە پێیدا دەڕۆیشت (مەسعود محەمەد، ۲۰۰۹، ۲۱).

لەماڵەوە بۆ مزگەوتی گەورە دوو ڕێگە هەبوو، یەکێکیان بەناو بازاڕدا دەچوو، کە بەناچاری ئەو ڕێگەیەی دەگرتە بەر. هەر لەزارکی بازاڕەوە کە بۆ ئەهلی بازاڕ دەردەکەوت تێکڕایان هەڵدەستانە سەر پێیان تا لێیان ڕەت دەبوو، تەنانەت گاور و جوولەکەش وەک مسڵمانەکان بۆی ڕاست دەبوونەوە، واز لەئەهلی بازاڕ بهێنین بۆ منداڵی کۆڵانەی گەڕەکەکەی خۆی، عەسری ڕۆژانی بەهار و سەری هاوین کە لەماڵەوە دەردەچوو بەرەو مزگەوتی حاجی مەلا ئەسعەد منداڵی گەڕەک کە سەرگەرمی قەپوقیری جگێنە و تۆپێنە بوون هەرکە چاویان پێی دەکەوت کەلاوجگ و تۆپیان لەدەستان بەردەبۆوە و خۆیان بەدیواری ئەمبەر ئەوبەری کۆڵانەوە دەگرت تاکو لەچاوانیان بزر دەبوو. ئنجا وردە وردە دەگەڕانەوە بۆ گەمەکانیان. من ئەمانە و سەدان شتی دیکەم دەدیت لەم بابەتە کە لەکەسی دیکەم نەدەدیت ڕۆژ لە ڕۆژ هەیبەتی لەدڵمدا کاریگەرتر دەبوو (مەسعود محەمەد، ۲۰۰۹، ۲۱).

جارێکیان ماڵمان لەچنارۆک بوو، عەسران باوکم لەماڵەوە بەرەژێر دەچوو بۆ ناو باغەکان، ئەو جارەش بەعادەتی خۆی لە باغچە بوو. من لەژێر کەپری ماڵمان ڕاوەستا بووم، چەند کەسێک هاتن سەلامیان کرد و لە باوکمیان پرسی، گوتیشیان لەدیوی ئێرانەوە هاتوون بۆ پرسیارێکی شەرعی ... من بردمن بۆ سەراوردی باغەکە و ئەو شوێنەشم نیشاندان کە باوکمی لێ بوو. هەر لەبیرمە باوکم کەوایەکی ئاودامەنی لەبەر بوو، یەک هەمیانەی لەکەمەری بەسەر کەواکەوە بەستبوو. چاوم لێبوو پیاوەکان گەیشتنە لای و سەلامیان کرد و گوێم لێبوو گوتیان لەجەنابی مەلا دەگەڕێین. باوکم گوتی جەنابی مەلا؟ گوتیان بەڵێ. دوو پەنجەی دەستی ڕاستەی بردە سەر سینگی و گوتی، جەنابی مەلا ئەمەتە ... کابراکان وەک داریان لە لووتی بدەی بەرەو پاش گەڕانەوە و وەها شڵەژان بۆ چەند لەحزەیەک نەیانزانی چ بکەن تا هاتنەوە سەرەخۆ و چوون دەستیان ماچ کرد ... ئەم دیمەنە بچووکە لەبەر چاومدا جیهانێکی ئەفسووناویی لەباوەشی خۆیدا دەگرت، هەیبەت و شکۆی باغێکی چۆڵ بەدەوری پیاوێکی تەنهای کەوا لەبەری هەمیان لەکەمەری دارعەسا بەدەست نەک هەر لەدڵی مندا بەڵکو لەدڵی ئەو دوو سێ پیاوە غەریبەشدا هێندە سامناک بوو دەتگوت سێبەری بەسەر هەموو مەڵبەندەکەدا کێشابوو. ئەو سێ کەسە ئەگەر لە ناکاو بەسەر دەستەیەکی چەکداری زرێپۆشدا کەوتبانایە هەر هێندە دەشڵەژان (مەسعود محەمەد، ۲۰۰۹، ۲۱ - ۲۲).

لەسییەکاندا شەوێکی هاوین، کە خەڵق هەموو لەسەربانان دەنووستن، دوای بەسەرچوونی دەمی دیوەخانە و داهاتنی کاتی خەوتن، لەنوێنەکەمدا هێشتان نەبۆرژا بووم باوکم لەنێو تەخت و چێغی خۆیەوە بانگی مامی کرد (بانەکانمان بەسەر یەکەوە بوون و شوورەیان لەبەینداً نەبوو) گوتی: نوورەددین سەیری فڵانە شوێنی ئاسمان بکە وا فڵانە ئەستێرەی (سیار) خەریکە فڵانە ئەستێرە دادەپۆشی. لەو عومرەی ۱۳ - ۱٤ ساڵیمدا بەدڵمدا هات کەوا ڕەنگە باوکم تاکە مرۆڤێک بێ لەهەموو کوردستانی عێراقدا سەرنجی بۆ دیمەنی ئاسمانی ئەوتۆیی بکشێت و ئەستێرەکان بناسێتەوە بە وەستاو گەڕۆکیانەوە. هەروەهاش لەبیرمە کە نەوتی بابەگوڕگوڕ کەوتە سەر باری ئێشی تەواو و ئاگرەکانی شەو و ڕۆژ بڵێسە و دووکەڵیان بەرز دەبۆوە باوکم تێبینیی ئەوەی کرد کە ڕەنگە زۆر نەبات ئەو هەموو دووکەڵەی پڕ لەغازی هەمەجۆر بەهەوادا بڵاودەبێتەوە کاری بەد لەدەغڵ و درەخت بکات و ژەنگیان پێ هەڵبێنێ. وابزانم حکومەتیش بیری لەم لایەنە نەکردبۆوە دوای دەیان ساڵیش ئنجا حیکایەتی (پیسبوونی هەوا) کەوتە سەرزار و زمانی خوێندووەکان... (مەسعود محەمەد، ۲۰۰۹، ۲۲).

**سەرچاوە:**

مەسعوود محەمەد، گەشتی ژیانم، چاپی سێیەم، ۲۰۰۹



# حکوومەتە کاتییەکەی مەلای گەورە

ـەهاوینی ١٩٢٢ بزووتنەوەیەکی سیاسی
ـەومژاوی مەبەستدار و سیخناخ بەفیکری
تۆرانیزم لە ڕواندزو ڕانیە و دەوروبەری کۆیە
و چەندین ناوچەی تری سەر بەهەولێر پەیدابوو.
ـەژێر گوشاری ئەو بزووتنەوەیە و تیژبوونەوەی
هەستی ئایینی، حاکمی بریتانی لەکۆیە بۆ هەولێر
کشایەوە، ئەمەش بۆشاییەکی ئیداری و سیاسیی
ـە کویە دروست کرد، ئەوە بوو دەستەبژێری
ئایینی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیریی و سیاسیی
کوبوونەوە، بەمەبەستی پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییە
ئیدارییە لیژنەیەکی باڵای کاتی بەسەرۆکایەتی
مەلای گەورەی کۆیە بەناوی حکومەتی کاتی لە
کۆیە پێکهات، بەڵام خەونێکی کوردستانی هەبوو
پێکهاتەی کابینەی حکومەتیش بریتی بوو لە:-

١- مەلای گەورەی کۆیە/سەرۆکی حکومەتی کاتی
٢- جەمیل ئاغای حەویزی / ئەندام
٣- عەولاغای حەوێزی / ئەندام
٤- کەریم ئاغای حەویزی / ئەندام
٥- مەلا ئەحمەد ئاغای سمایل ئاغای غەفوری/ئەندام
٦- ڕەسول ئاغای غەفوری / ئەندام

مەلای گەورە وەکو سەرۆکی حکومەت ئیش و



کارەکانی ئیدارەی ناوچەکەی ڕایی دەکرد و هەر
بەناوی (جەلی زادە) ئیمزای لەسەر نووسراو
بڕیارەکان دەکرد، هەڵبەت جێگەی داخە، کە
ئەویش وەکو سەدان وەرچەرخان و ڕووداوی
گرنگی سیاسیی کوردستان کەمترین نووسین و
قسە و توێژینەوەی لەسەر کراوە، بگرە هەر وەکو
نەبوو لە مێژووی ئێمەدا فۆرم و ناوەڕۆک و کۆی
وردەکارییەکانی لەسەر ڕەفەی ژوورە تاریکەکانی
مێژووی خۆ بەکەم زانینی نەتەوەییمان تۆزی
فەرامۆشکردنی لەسەر نیشتووە.

مەلای گەورە ویستی ئایین لە هەموو کۆت و بەند
و تەوقە کۆمەڵایەتییە تەقلیدییەکان ڕزگار بکات،
کە بەدرێژایی مێژوو هەناسە و توانا و بڕستی
لەمیللەتەکەمان بڕیبوو.

هەر بۆیەش ئەگەر بمانەوێت کاریگەری و هەیبەت
و پێگەی ئەو پیاوە ڕۆشنگرە لەمێژووی سیاسیی،
ئەدەبیی، ڕۆشنبیریی و مەعریفی کورد بخەینەڕوو،
نابێت بەتەنیا لەنێو ژیاننامە و بەسەرهات و تەفسیر
و دەقە ئایینییەکان بۆ مەلای گەورە بگەڕێین، بەڵکو
پێویستە ئەو پیاوە بەوە پێناسە بکەین، کە وەکو
چۆن تورک ئیسلامی تورکاند، فارس فارساندی،
عەرەب عەرەباندی، ئەویش ئاوا ویستی ئیسلام
بکوردێنێ، بەڵام داخەکەم ڕق و کینەی دووبەرەکی
و دەردی سەختی خۆ بەکەم زانین و پەتاو نەخۆشی
خۆ وێناکردن وەکو کائینێکی لاواز و هەژار و
دەست کورتی کلتوریی بەیەکەوە ژیانی مەدەنیانە
و حەزکردن بە خزمەتکردنی کلتورو فەرهەنگی
بێگانە، وەکو چۆن هات و هاوار و نەڕەنەڕی دەست
درێژ و عەقڵ کورتەکانی سەر شاشەی تیڤییەکان
و دونیای سیاسەت خەریکە نیشتمان، نەتەوە، ئاڵا،
ئەی ڕەقیب و شکۆی نەتەوەییمان لەژێر سمی
ئەسپی سەرمایە و گەندەڵی دەپلیتێنێتەوە، ئاواش
خەریکە خەونی مەولانا خالیدی نەقشبەندی و
مەلای گەورە لەسەر بەردی عەقڵی خۆ بەکەم
زانین وردوخاش دەبێت.



زیرەک کەمال



# گەورەیی مەلای گەورەی کۆیە

سالم سلمان کۆیەیی

حاجی قادری نەمر دەفەرموێ...

***کتێب و دەفتەر و تەئریخ و کاغەز***
***بە کوردی گەر بنووسرایە زوبانی***
***مەلا و شێخ و میر و پاشامان***
***هەتا مەحشەر دەما ناوونیشانی***

یەکەم دادوەری کوردە، کە ئەوکات قازی شەرعی سنجاقی کۆیە بووە، لە ساڵی ١٩١٩ تاوەکو ساڵی ١٩٢٨زمانی دادگای کردووە بە کوردیی، کە پێشتر زمانی دادگا بە تورکی عوسمانلی بووە .

لە ساڵی ١٩١٥ کە دەکاتە ساڵی ١٣٣٤ کۆچی مەلای گەورە ئەندام بووە لە ئەنجومەنی ویلایەتی مووسڵ، لەو ماوەیەشدا کە لە مووسڵ بووە، لە لایەن سوڵتانی عوسمانی (محمد رشاد) میداڵی مجیدی وەرگرتووە لە دەرەجەی سێیەم.

لە ساڵی ١٩١٩ ز کە دەکاتە ساڵی ١٣٣٧ک بووە بە قازی شەرعی و لە ڕێکەوتی ١٩١٩/١/٤یەکەم بڕیار دەردەکات، بڕیارەکەش تایبەت بووە بە گۆڕینی ڕەگەزی زەوییەک لە وەقف بۆ نرخی هاوتا

دوا بڕیاریش، کە دەریکردووە بە ژمارە ٢٦ لە ساڵی ٧/١٢/ ١٩٢٨،بابەتەکەش دابەشکردنی میراتی کەسێک بووە کە کۆچی دوایی کردووە.

شاعیری گەورەی کورد حاجی قادری کۆیی لە پارچە شیعرێکدا لە ئیستانبوڵ بۆ مەلا عەبدوڵڵا جەلیزادە نوسیویەتی وە وەسفی بنەماڵەکەیان دەکات و دەڵێت.

***بەغەیری جەددی ئێوە کێیە دانا***
***لە کوردستان ئەساسی عیلمی دانا .***

گەورەیی ئەو پیاوە گەورەیە لە گشت کایەکانی ژیاندا بە ڕوونی دیار و بەرچاوە و ئەسپی خۆی تاوداوە ڕۆڵی دیاری هەبووە .

ئێمە لەم وتارە تەنها باسی یەک لایەنی ژیانی مەلای گەورە دەکەین ئەویش کاتێک لە ساڵی ١٩١٩ دەبێت بە حاکمی شەرعی و چەند بڕیارێک دەخەینە بەر دیدی خوێنەران .

١- یەکێک لەو بڕیارانە کچێک بە ناوی (شمانە ئەبرەهە) بە مەبەستی موسڵمان بوونی پەنا بۆ دادگا دەبات ئەگەرچی بابەتی موسڵمان بوونەکەی پەیوەندی بە دادگا نەبووە، بابەتەکی زیاتر شەرعی بووە، بەڵام لەبەر گەورەیی مەلای گەورە ئەو کچە پەنای بۆ دادگا هێناوە، مەلای گەورەش نامەیەک دەنێرێت بۆ ئەنجومەنی یەهودییەکان بە مەبەستی وەرگرتنی ڕایان، دوای وەرگرتنی ڕەزامەندی و لاری نەبوونی ئەنجومەنەکە دەکات. لە دادگای کۆیە پاش موسڵمان بوونی بڕیاری داوە بە گۆڕینی ناوەکەی بۆ (فەقی ڕەحمە) .

٢- پیاوێکی جوو بژێوی خێزانەکەی نادات و خێزانەکەی پەنا بۆ دادگا دەبات و سکاڵا دەنووسێت، قازیش کە مەلای گەورە بووە دیسان پێش بڕیار دان نامەی بۆ ئەنجوومەنی جوو ناردووە و ڕای ئەوانی وەرگرتووە، بۆ ئەوەی لە ژێر ڕۆشنایی ئایینی یەهودی دادگا بڕیاری خۆی بدات .

لە ژیانی دادوەری ئەو پیاوە مەزنەدا بەو شێوەیە لە ژێر ئەم ناوە بڕیارەکانی دەرکردووە .

حاکم شرع. ملا محمد أفندی أبن ملاعبدالله الجلی (مەلای گەورە)

- تەنیا لە ساڵی ١٩١٩ / ٢١٥ حوجەی شەرعی نووسیوە، ٣٨ دانەیان بە کوردیی نوسراون .

١٧٧ دانەشیان بە تورکی نووسراون. لە ئەرشیفی دادگای کۆیە لە تۆماری ژمارە ٢١

لە ساڵی ١٩٢٠/ تاوەکو ١٩٢٦

ژمارەی داوا شەرعیەکان و حوجەکان ١٦٧ دانەیە لە ژمارە ١-٧٢ بە زمانی فارسی نوسراوە

٤٢ دانە حوجە بە زمانی فارسی نووسراون

لە ساڵی ١٩٢٥ زایینی لە ژمارە ٤٢ -٥٦ گشتی بە کوردیی نوسراون تەنیا ژمارە (٥٢) و (٥٤) بە زمانی تورکی نوسراون. ئەرشیفی دادگای کۆیە تۆماری ژمارە ٢٢

**• بە سوپاسەوە ئەو زانیارییە ئەرشیفییەم لە دادوەری دادگای یەکەمی بەرایی کۆیە بەڕێز حاکم هیمداد بە دەست کەوتووە.**



# فتواکەی مەلای گەورە

صلاح شێخ شەرەف

کۆیە شارێکی دێرینی کوردستانە، لە قوڵایی مێژوودا ئاوێتەبوونێکی شارستانیی تێدا ڕوویداوە، سیمای شارستانیەتیبوونی پیشەگەری، بازرگانیی و بەرەوپێش چوونی زانیاریی، کە تێیدا خوڵقاوە، کاریگەریی هەبووە لەسەر پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی ئایدیا و ڕەوتی کۆمەڵایەتی گەشەکردنی هزری خەڵک، هەربۆیە دەبینین پێکهاتەی کەمایەتی نەتەوەکان لێرە ژیاون و تا سنوورێکی زۆر ئازادانەش مەراسیمی دینی خۆیان جێبەجێ کردووە.

هەربۆیە لە کۆیە مزگەوتی ئیسلام و کەنیسەی دیانان و کەنیشتەی جوولەکان لە یەک نزیک بوونە، بەشێوەیەک لە یەک گەڕەک بوونە.

لە کاتی ڕوودانـی هـەراکـەی ڕەشـید عالی گەیلانی، کە لە بەغدا و شارەکانی دی پەلاماری جووەکانیان داوە دەسەڵاتدار و ئاغاکانی کۆیە، ئەو گەنجانەی بن جووبوون پارێزگاریان لێ کـردوون، لـە هـەمـووی گرنگتر مـەلای گەورەی کۆیە (مەلا محمد جەلی زادە) بە فتوا پەلاماردانی جووەکانی حەرام کردووە، داوای لە خەڵک کردووە، کەس غەدریان لێ نەکات و دەست بۆ ماڵ و موڵکیان نەبات.

دیارە ئەم دەرکەوتە هەر لە هزری کراوە و زانستی ئەم پیاوە ڕۆشنبیرەی کۆیە، کە لە هـەموو هەنگاوەکانی ڕەوتـی پێشکەوتن و خوێندن و فێربونی زمانی بێگانە تێکەڵاوی دونیا، پێشەنگ بووە.

ئەم فتوای مـەلای گـەورە ڕێگەی لـەم ڕەوتـە قێزەونە گرتووە، کە خەڵکی بیر تەسک و تاریک ڕەنگ، دەیان ویست دژی جووەکان بیکەن.

کۆیە چەند بنەماڵەیەکی زانستیی گەورەی لێ بووە، وەک جەلی زادەکان، خادم سەجادەکان، شێخ مصطفى قوتبی شام، بنەماڵەی قازی و موفتی دایە خەجێ، کە مەلایەکی ژن بووە.

ئەم کەش و هەوا زانستی و پێشکەوتنخوازە بۆ بناغەی ئەم ڕێبازە زانستیی و نەتەوایەتی سیاسیە پێشکەوتنخوازەیە، کە دواتر لە کۆیە گەشایەوە جوڵانەوەی نوێ هەوڵ و خەباتی هاوچەرخی لێ هاتە کایەوە.

بە خۆرایی نیە شاعیری گەورەی نەتەوایەتی حاجی قادر لێرە هەڵکەوتووە. هەرسێ شیعری ئەی ڕەقیب-ی دڵدار ئەی شەهیدانی تۆفیق وردی و پێشمەرگەی هەڵمەت خالد دلێر خەڵکی کۆیەن.





# فڕی فڕی قەل فڕی

یەکێک لە نووسینە جوان و بەپێزەکانی مەلای گەورە نامیلکەی (فڕی فڕی قەل فڕی)یە، ئەگەرچی لەرووی قەبارەوە ژمارەی لاپەڕەکانی کەمە و لەچەند لاپەڕەیەک تێناپەڕێت، بەلام لەرووی بەهێزییەوە یەکێکە لەشاکارە مەزنەکانی مەلای گەورە. ڕەنگە لەدوای تەفسیری قورئانی پیرۆز، نامیلکەی (فڕی فڕی قەل فڕی) بە بەهێزترینی نووسینەکانی مەلای گەورە دابندرێت. ئاشکرایە ئەوەی پالی پێوەناوە، کە ئەم چەند لاپەڕەیە بنووسێت لەسالی (١٩٢٧) زۆربوونی خورافە و شەخسپەرستی و دوورکەوتنەوەیە لەحەق و حەقیقەت و وەلانانی عەقل، بەلام ئەگەر سەیرێکی سەردەمی ئەوکات بکەین کە نزیکەی سەدەیەکە مامۆستای گەورە لەم بێ عەقلییە ڕاپەڕیوە و بەهەموو توانایەکییەوە دژی وەستاوەتەوە، بەراوردی بکەین بەئێستای سالی ٢٠٢٣ بەڕوونی بۆمان دەردەکەوێت کە سەرەڕای پێشکەوتنی زانست و تەکنەلۆژیا، کەچی ئەو دواکەوتنە و خورافیاتەی، کە سەدەیەک پێش ئەمڕۆ هەبووە ئێستە لە بەرگێکی نوێ و مۆدێرن بە جۆرێکی دیکە خۆی نمایش دەکات، ڕەنگە هەندێک شتیش لەبنچینەوە هەر نەگۆڕابێت، بەهەمان تاس و حەمامدا بڕوات.

**هاوکار عەبدوللا شێخ وەسانی**

ئینسان ئەگەر بە گەورەیی ئەحوالی مندالی لە یاد بێ قیاس لە ئەحوالی گەورەیی بکات فەرقێکی زۆر سەیر دەبینێ و ئەگەر بە چاوی دل تەماشا کا دەزانێ ئەو فکرەی کە لە ساتی مندالیدا هەیبوو زۆر پاک و زۆرچاک بوو، ئەمما بە تەربیەی دایک و باوک و کەسوکاری فکری لێ گۆڕا و لێیان تێک دا.

لە یادمە بە مندالی گەمە (یاری)یەکمان دەکرد «فڕی فڕی قەل فڕی» چەند مندالێ دەوریان لێک دەدا، یەکێ ناوی چەند بالندەیەکی دەهێنا، لەگەل ناوی بالندەکە منالەکان دەستیان بەرز دەکردەوە و لەو میانەدا ناوی چشتێکی دەهێنا کە نەفڕێ، ئەوەی دەستی هەلبڕیبا تێدەکەوت. نـاوی ئـەو شتە نەختێک وێـچـوو بـوو لـەگـەل نـاوی بالندەیەکی، بۆیە ئەو مندالە لێی تێک دەچوو، دەیگوت فڕی فڕی، فڕی فڕی کۆتر فڕی، فڕی فڕی کۆتک فڕی. ئەوەی دەستی بلند کردبا تێدەکەوت و مندالەکان تێر پێی پێدەکەنین و گەمەیان پێ دەکرد، فڕی فڕی قازی بازی فڕی، فڕی فڕی قاز فڕی، فڕی فڕی قازی فڕی. دیسان تێدەکەوت، چەپلەیان بۆ لێ دەدا. قەشمەری (گالتە)یان پێ دەکرد. یەعنی ئەو مندالانە بە فکری فتریی خۆیان جیاوازی و تەمیزێکی باشیان هەبوو چی دەفڕێ و چی نافڕێ، چۆن دەفڕێ و چۆن نافڕێ، بە چی دەفڕێ، بە چاکی دەیانزانی.

لەپاش گەورە بوون و هۆشی قەوم وەرگرتن... دەبینین فەرقێکی زۆر هەیە، بەجارێ ئێش سەرەو بن بووە. ئیمان بە کەرامەت فکری بەتەواوی گۆڕیوە: بەهیممەتی شێخ فڕی فڕی کەر فڕی، دەبێ دەست بەرزکەی. فڕی فڕی شێخ بەخۆی فڕی، دەست بەرزکەی. هەی هـاوار... بۆ خاتری خوا... بۆ خاتری پێغەمبەر! چۆن دەست هەلبڕم؟ ئەو کەرە گوێ درێژە... ئەو شێخە سەر زلەی ورگ پانی مل ئەستوورە چۆن دەفڕێ؟!

هەی مالوێران تۆ... ئیمانت نییە، کافری، زەندیقی، لە دین دەرچـووی، نـازانی شێخ خۆشەویستی خودایە، ئەمە کەرامەتی ئەولیایە. تۆ نەت بیستووە لە مەلایانی موتەبەحیر کەرامەتی ئەولیا حەقە؟ هەرچێکی لە خوا بخوازێ بۆی دەکا، تۆبە بکە دەست هەلبڕە.

برام لازم نییە ئەوەی خۆشەویستی خودا بێ بفڕێ، فڕین قاعیدەی هەیە... پێغەمبەر، ئەبوبەکر، عومەر، عوسمان، عەلی خۆشەویستی خودا بوون و نەفڕین، بەلان چوێلەکە دەفڕێ و خۆشەویستی خوداش نییە. کوڕە مالڕماو! ئەوە چشتێکی ترە، وەرە ئیمان بێنە، دەنا شێخ غەزەبت لێ دەگرێ، خوداش لێت خۆش نابێ. پێغەمبەریش شەفاعەتت بۆ ناکات... خولاسە بە سەد دەسیسە و فڕوفێل مندالەکە وەردەگێڕن و لە سەر فکری فتری حەقی لادەدەن.

ـیسان: فڕی فڕی فڕۆکەی (تەیارە)ی ئینگلیزی
ـری. هاتە سەر شاری کۆیە بۆردومانی دەکات.
منالە پاکەکە خێرا دەست هەڵدەبڕێ، گەورەکان
ـەست هەڵنابڕن.

منالەکە دەپرسێ: بۆچ دەست هەڵنابڕن؟ دەڵێن:
ـرۆ کەرە... چ حەددی هەیە! فڕۆکە چییە.. چۆن
ـەفڕێ؟ ئەوان کافرن چۆن بە حەوا (ئاسمان)
ـەکەون؟ خۆ شێخ و ئەولیا نین بفڕن.

منالەکە: وەرن بۆ خاتری خودا دەست هەڵبڕن
ـەنا زەرەر دەکەن.. بەخوا ئەوە هات، گڕڕەی
ـێ، بۆمبای زۆر پێیە، یەکتان پێدا بدا بەرکەون؛
هەموو پارچە پارچە دەبن.

گەورەکان: بڕۆ منداڵی نەفام.. تەماتە هەڵمان
خەڵەتێنی تا تێکەوین و پێمان پێبکەنی!

منداڵەکە: بە خوا مەبەستم ئەوە نییە، بۆ ئێوەمە
حەیف دەکەم بفەوتێن...

گەورەیەک: ئەها بەخودا ئەوە هات.. کوڕەکە
ڕاست دەکا، تەقەی بۆمبای هات لەبەر قشلەی،
تەقی عاردی لەرزاند دەنگێکی زۆر بەهێزی هات،
هەر وەخت بوو پەردەی گوێم بدڕێتن، ئەمما
مەترسن شێخ بە هیممەت ناهێڵێ زیانمان پێ
بگات.

منداڵەکە پێکەنی و وتی: باوکم! خۆتان بشارنەوە
ئەوە ئیشی شێخ و مێخ نییە! ئەها، هاا هاا... بنۆڕن!
شێخ ئەوا بۆ خۆشی هەڵدێ. تەق بۆمبا تەقی.
شێخ هەڵات. ئەوجا فڕی فڕی لە ترسان باڵی
گرت. ئەها ئەها ئەوە غار دەدا بۆ کونێکی خۆی
بشارێتەوە، ئای ئای ئەوە چووە ناو ئەشکەوتەوە!
هاها چووشە بنەبانی

گەورەکان: ئەی ماڵی وێرانم، خۆ شێخ هەڵات و
خۆی شاردەوە! دەکوو خانەت خەراپ بێ یا شێخ!
ئەدی لە زەلزەلەی ڕۆژی قیامەت و لە ساعیقەی
ئینشیقاقی سەماوات و لە شەهیق و زەبیری
جەهەننەم چۆن نەجاتمان دەدەی داخەکەم پەکوو
چۆن عەقڵی لێ گۆڕین بە درۆ و دەلەسە، کوو
ماڵی خواردین! لە دین و دونیای کردین! بە خودای
هەمووی درۆ بوو! هیممەتی پڵاوخواردنی لێ
کردین بە هیممەت هیممەت و بەرەکەتی وی تەنها
بۆ ماڵی مفتی بوو.. تەق، تەق، تەق... بۆمبا بارینە،
جێی قسە نەما. هەڕاکەن، هەڕاکەن، چارەسەرە،



ڕۆژی نەفسی نەفسییە، فڕی فڕی شێخ فڕی، مەلا
فڕی، ئاغا فڕی، ئەفەندی فڕی، مام حاجی فڕی،
سۆفی فڕی، دەروێش فڕی، سەگ فڕی، مریشک
فڕی، هەموو فڕین.. چوونە پەنایان.

منداڵەکان: ئەدی وا بفڕن، دەنا تێ دەکەون، قوڕ
بەسەرتان ئەگەر بە شەو هات، بە ئەلکتریک دونیای
ڕووناک کرد، لەسەر بانان، لەناو حەوشان، لە
کۆڵانان، هەمووی دیتن، ئەوجا چی دەکەن؟

گەورەکان: تۆخوا ئەمیش دەبێ؟ ئەوجا قوڕی
کوێ کەین بەسەر خۆمان؟ کێوە بچین؟ کێوە
بفڕین؟ دەبێ زەوی بکۆڵین و بچینە بن عاردی.

ئاوا فڕۆکە گەڕاوە. چووە کەرکووک الحمدالله
یارەبی، ئەوجارەش قوتار بووین.

داخەکەم ئەوانی زۆر کەرن دووبارە دەبنەوە
کەرەکەی جاران و دەچنە خزمەت شێخ و دەست
و پێی ماچ دەکەن و دەڵێن قوربان! لە سایەی
هیممەتی تۆوە سلامەت بووین و زیانمان نەهێنا.

یەکێک لە مریدە هەرە کەر و گەوجەکان دەڵێ:
بەخودا بە غەوس، چاوم لێ بوو کە بۆمبا دەهاتنە
خوار حەزرەتی شێخ دەستی وەبەر دەگرتن و
لە ئێمەی لادەدا، صدق صدق.. امنا امنا هیممەتی
شێخ کافییە، زاهەن خۆی شاردەوە... باتنەن
هیممەتی فەرموو... شکور دەرچووین. کوڕە هەر
شێخ حیسابە...

منداڵەکە وەختە لە قینان بدڕێ و تەق بکا. ئەو
جارەش فڕۆکەی ئینگلیز فڕی لە کەرکووک، لە
بەغداد، لە موسڵ، وەک قاز و قولینگ لەسەران
دێنە خوارێ و ئەوا لە هەموو لایەکەوە هاتن و
جێ بە جێ کردیانە ئاگر باران قیامەتە.. عالەم بە
لەرزە لەرزەوە دەستیان بە هەڵاتن کرد. هاوار
یا غەوس یا غەوس، یا غەوس، شاهی نەقشبەند،
ئۆمەرمەندان، خارخاران، پیرەمەگروون، پیرۆتە
سووری مەرگی، پیری دابان، نجات، حیفز، هاوار،
دەخیل. دیسان بەو چەشنە هەموویان خۆیان
بزر کرد و خۆیان شاردەوە. گەلێ مزگەوت
و تەکیە بە بەر بۆمبا کەوتن و ڕمان و خراپ
بوون. دووبارە کە ڕۆیشتنەوە خەڵکی هاتنەوە
دەرێ زۆر ترسان، ئەسەری تەجروبەیان دیت
کەمێک هاتنەوە سەر هۆش، تەمایان بوو نەختێ
عاقڵ بن. بەڵان کە هێندێکیان چوون بۆ لای
شێخ، شێخ نەمابوو. مەلا نەمابوو. هەموویان



باڵیان گرتبوو. فڕی بوون. ئەوجا گوتیان بە خودا لێمان گۆڕاوە. هەر شتە قاعیدەی خۆی هەیە ئێمە بە حیکایەتی قالیچەی سلێمان پێغەمبەر و باسوخواسی عیفریتیان تێکەوتین. شێخان هەڵیان خەڵەتاندین. فلان سواری قالیچەی سلێمانی بوو. گوتی بە حەقی سلێمان بمبە فلانە جێ، دەست بەجێ بردی، عیفریتان قەڵای کچی پادشایان هەڵگرت بە بناغەوە بردیانە ناو حەوت دەریایان و لە جەزیرەدا دایاننا. بەعزێ لە ئەولیایان دیتویانە کە کەعبە لە جێی خۆی نەماوە، چووە بەپیر رابیعەی عەدوییە. ئەی ئامان، ڕەببی دەخیل ئەوە چی بوو؟ چۆن وای لێ هات؟ ئەو هات و باتی کەرامەت و حیکایەت بەجارێ ئێمەی گۆڕی. ئەگەر لێگەڕابان هیچ نەبا لەجێی خۆمان دەماین و ئەوەندە بە عاردیدا نەدەچووینە خوارەوە وەک لە حیکایەتیدا دەڵێ: ئەحمەد کەوتە ژێر زەمین پێیان گوت: دوو بەران دێن ڕۆژی جمعە خۆت هەڵدە سەر بەرانە سپییەکە بە سەر ئەکەوی. ئەگەر بکەویە سەر بەرانە ڕەشەکە لە حەوت تەبەقی زەوی ڕۆ دەچیت. قوربەسەر خۆی هەڵدا کەوتە سەر بەرانە ڕەشەکەی و کەوتە بن حەوت تەبەقەی عاردی. چی بکەین تاوانی ئێمە نەبوو.

مەلای چاک لە وەعزیدا دەیفەرموو: فلانە کەس بەهەشتاوی دەچێتە مەککە، دەفڕێ دەچێتە ئاسمان، سدرە المنتهی، بەهەشت، کورسی، عەرش، هەمووش دەگەڕێ. نەمان دەوێرا دەنگ بکەین، کەرامەتی ئەولیا حەقە لە کتێبی عەقیدە نووسراوە وەک موعجیزەی پێغەمبەران دەبێ ئیمانی پێ بێنین.

منداڵ بە منداڵی بە فیترەتی ئیلاهی زۆر زیرەکە. دیارە پرسیار دەکا. دەڵێ: بابە! ئەو بارانە کوو دەبارێ؟ کوا وا دەنک دەنک... تنۆکە تنۆکە دێتە خوارێ؟

باب: ڕۆڵە ئەوە مەلائیکەت دەچن لە بەحری «رزق مقسوم» ئاوی دەیێنن بە بێژەنگیدا دەکەن، وەک دەنکە گەنم و جۆ لە بێژەنگی دێتە خوارێ، ئەمن لە مەلا وام بیستوە.

منداڵ: ئەدی بابە! بۆچی هەندێ جاران بەرێژنە دەبارێ، دەنکی گەورەیە، جارجاریش نەرمە نەرمە دەبارێ دەنکی ورد ورد دێتە خوارێ وەک خوناوی ڕەشماڵان؟ بەپێی فەرموودەی تۆ دەبێ بێژەنگ و سەرەد و هێڵەکیان هەبێ!

باب: سەیری ئەم هەتیوە بێژەیە، ئەوە دەرسی شەیتانییە، بە قسەی مەلایان بڕوا ناکات.

منداڵ: ئەدی بابە گیان! ئەو بروسکە و گرمەی هەورە چییە؟

باب (ئەگەر سوننی بێ) دڵێ: ڕۆڵە! ئەوە مەلائیکەتە بە قەدەر ژەنگەسوورەیەکی (زەردەواڵــە) قەمچییەکی ئاگرینی بە دەستەوەیە لە هەوری دەدا و بەسەریدا دەهاژێنێ. ئەو برووسکە ئاگری قەمچیی ئەوە. ئەو نەڕەیە و دەنگە گەورەیەش هەر هی ویە.

منداڵ: ئەدی بابە! جار جارە بررووسک لە عاردی دەدا ئینسان و حەیوانی دەسووتێنێ. لەو جێیە بۆنی barووتی لێ دێ و هەندێ جاران لەو جێگایە ئاسن دەدۆزرێتەوە.

باب: ئەی لەو ماڵ خراپە. ئەتۆ چت بەسەر شتی واوەیە؟ وەڵڵا ئەوە شەیتانە سەرم بە فەتەڕات دەدا.

باب (ئەگەر شیعە بێ) دەڵێ: «علي في السحاب صلاة الله و سلام و عليك يا أمير المؤمنين»، موجتەهیدی نەجەفی ئەشرەف و کەربەلای موعەللا وایان فەرمووە.

منداڵ: ئەڵبەت ئەڵبەت وایە بابە، تەواوە.

کوڕی شیعە زوو بڕوا دەکا، ئەمما منالی سوننی زرەنگن و بە قسەی پڕوپووچ ناخەڵەتێن ئیللا ئەوانە نەبێ کە وەکوو شیعان ئیمانیان بە ئیمام هەیە. بە شێخان بێ ئەوانیش دەگۆڕێن. دەنا منداڵە سوننی بەتایبەت منداڵی کوردان قەت لە زەکای فتری خەڵقی ناگۆڕێن. لەسەر ئەو بێ کەسییە شوکر منداڵی کوردان بە نەوعێ بۆ ئەوجی ئەعلا دەفڕن هەرچی دۆستە حەق وایە کەیفی پێ بێ چونکوو زۆر باش دەخوێنن، عاقیبەت بۆیان باش ئەبێ.. دەچن بۆ بڵندترین پایە.

هیوای من بە بێچوە کوردان ئەوەیە بە قسەی پڕوپووچ نەگۆڕێن، تەماشای خودای بکەن خەلق و ئیجادی ئەو بێننە بەر چاو. قەواعدی فتری تەماشا کەن. خوارق العادة چ نییە.. گوێی نەدەنێ. چی خوا کردبێتی بە عادەت ئەوە باشە. ئەگەر بە عەقڵ تەماشای کەرامەتیان کردبا دەیانزانی فائیدەی چییە، بۆ هەموو شتی تەشەبوسیان بە

کەرامەت نەدەکرد. ئەوە ڕاستە شێخ دەفڕێ بە نوقی دەچێتە مەککە و نوێژی سبەینێ لە مەککە دەکات. ئیشراق لە مەدینە، ضحی لە قودس نیوەڕۆ لە بەغدا. بۆ هەموو میللەت چ کەڵک دەگرێ؟ سوودی چییە؟ تا ئیمڕۆ حاجی قوربەسەر پشتی دەشکا لەسەر حوشتر گەلێکیان بەر دەبوونەوە ئیسک و پرووسکیان ورد دەبوو. چل پەنجا ڕۆژ بە سواری حوشتر حندەر حۆیان دەکرد. توک و لۆکیان دەچوو؛ ئایا بۆ میللەت فایدەی چی هەیە کە شێخ فڕی یا نە. چووە مەککە یا نەچووە مەککە. بفڕێ و نەفڕێ... تەماشای لەوحی مەحفوزی کرد ئەوی تیا بوو بۆی کەشف بوو، چ سوودی هەیە؟ بابەگوڕگوڕ ئاگری شالاوی هەڵسا، بەغدای ترساند. کە ئاوی نەوتاوی بکا. بە علم و فەن و هەندەسە زەوتیان کرد و تەمایانە ئەو نەوتە بۆ ئەورووپا بەرن، ئێمە خۆمان لە ماڵی خۆماندا بێبەش بووین. کەشفی عیلمیمان نەبوو. ئەو لەناو عەردیدا بوو لێمان بزر بوو. ئەجانب بەدەریان خست. ئێمەش هەر خەریکی لەوح بووین! قەی ناکات لەویش سەرفی نەزەر... ئەم قورئانە لە لوح المحفوظ بۆ پێغەمبەر (ص) هاتە خوارێ، بۆچی ئەم وەلی و شێخانە تەماشای ناکەن؟ تەنانەت کەمیان بە ڕەشخوێنیش دەیزانین.. بە مەعنا هیچ. ئەویش خەراپە نابێ ئەوان کە ئیمانیان هەیە بە قورئان کە کەلامی خوایە بیزانن. فکری موسڵمانان هەر بەولاو بەولادا دەفڕێ. بەڕاستی ڕوو لە ڕێگەی ڕاست ناکەن.

فڕێ فڕێ... بە فکرم هاتەوە: فڕی فڕی کەری دەجال فڕێ، کەری واهروهوپ گوێی ئەوەندە درێژە حەفتا هەزار جوو لەبن سێبەری گوێیدا ڕادەوەستێ. شەقاوی لە مەددی نەزەرە، بە چل ڕۆژ هەموو دونیا دەگەڕێ خسووسەن نەرەدێوێکی وەک دەجالی سوار بووە.

منداڵەکە: ئاوا کەرامەتی ئەولیایانمان سەلماند. عەبدی خودا عیبادەتی دەکەن با کەرامەتیان هەبێ. ئەی دەجال ئەو چییە؟ ئەویش خۆشەویستی خوایە؟ خودا ئەو هەموو ئیشانەی بۆ دەکا؟؟ فڕی فڕی.. هەموو خەزێنەی دونیایە لە دوای سەری وی وەک زەنگەزوورە، زەردەواڵە، مێشهەنگوین بە هاژە هاژ و گرمەگرم بە ئەمری وی دەفڕن، ئەمە بۆ فڕی؟! فڕی فڕی ئەم چیایە فڕی، ئەو چیایە بە ئەمری ئەو لە ڕەگ و ڕیشە لە عاردی



دێنە دەرێ بە حەوا دەکەون. دەفڕن دەفڕن وەک دوو بەران شەڕە قوچی دەکەن لەمبەر و لەوبەر.. ئەمە بۆ کەس نەبووە. کوو ڕێک دەکەوێ؟!

گەورەکان: برای باوکم ئێمە موسڵمانین بە قەولی مەلایان موسڵمانین. ئەوی ئەوان فەرموویانە بڕوا دەکەین. حەتتا دەفەرموون ڕووبار نان و گۆشتی بە دودا دەڕوا.

منداڵەکە: چی ڕووبار؟ چی نان؟ چی گۆشت؟ بە خوا ئەم قسەیەکی سەیرە. خۆزیا ئەمن لەناو ئێوە گەورە نەبووبام و ئەم تەرزە قسانەم نەبیستبا لە ئێوە. هەرچی مەلا بیڵێ ئێوە دوای قسەی بکەون ئەوە قەت نابێ. ئەمە دیارە مەلا زۆر برسییە. بێنانە. ئاردی لە ماڵا نییە. لەمێژە گۆشتی نەخواردیە. تامەزرۆیە، خەون بە نان و گۆشتەوە دەبینێ «الخير لنا والشر لاعدائنا» لام وایە تەفسیری ئەو خەونە ئەویە ئیمڕۆ سبەی کوێخا خێر بۆ خۆی دەکا دوو سێ حەیوان سەردەبڕێ. دەیکا بە کەشکەک و مەلای دەعەوت دەکات. سەلەی پڕ لە نان و تەبەقی پڕ لە چێشتی لەبەر دەمی دادەنێن، مەلا عافیەتی دەکا. لاڕانێکیش دەنێرێتە ماڵی مەلا، مەلاش نەختێ بە کولاوی و هەندێکیش بە برژاوی یەک دوو زگی تریشی لێ دەخوا. یا کەسێ بووە وەکوو بسحاق ئەویش حەزی لە تعام بووە ئەمما بوسحاق چاکە، باسی تعامی خۆش خۆش دەکا واقعەن ئەویش حەزی لە قاورمە بوو لەگەڵ ساوەری ڕزی ڕەواندزیان. ئەمە ئەوەندە نان و گۆشتە بۆ تریت خۆرەکانە، ئەوە لە مەلای چاک دوورە، گۆشت و نان و حەز بە درۆی هەڵبەستراو: خەیاڵ و خولیا ی برسییانە دوورە لە پێغەمبەر چونکە پێغەمبەر وەحی لە خوا وەردەگرێ. تەشریعی ئەحکام ئەکا. دوورە لەم نەوعە قسە پڕوپووچانە خسووسەن تەعریف و تەوسیفی کەری دەجال. یاخوا لەعنتی خوا لەو کەسە بێ کە درۆی بە زاری پێغەمبەر هەڵبەست و عالەمی ماڵوێران کرد. کردنی بە کەری نەفامی هیچ نەزان.. برای باوکم! ورنەوە سەر حاڵی منداڵی بەخودا باشترە.

فڕی فڕی قەل فڕی. دەست هەڵبڕن. فڕی فڕی قول فڕی. دەست هەڵمەبڕن. مەبەستی لە قول ڕەشەیە و نافڕێ. وە ئیللا سەر و بن دەبن وەک هاروت و ماروت سەرەوژێر هەڵدەواسترێن.



بەڵێ، ئەویش حیکایەتێکی زەمانی پیرییە، موسڵمانان کە گەورە بوون گوێیان و عەقڵیان تەواو دەبێ، ئیمانیان بەقوەت دەبێ. ئەمجا بە هەموو عەجائیب و غەرائیب بڕوا ئەکەن! خۆشناوێک مەتحی کەری خۆشناوێکی تری دەکرد؛ دەیگوت: بەخوا کەری تۆ زۆر دەنگ خۆشە. ئەویش تەشەککوری ئەکرد و دەیوت: ماڵت سەد جار ئاوا بێ. هیچ چاکەم بۆ تۆ نیشە ئاوا هەر لە پیاوەتیی خۆتەوە مەتحی کەرێم ئەکەی. موسڵمانانیش سەدجار ماڵیان ئاوابێ، دەجاڵ هیچ پیاوەتیشی بۆ ئەوان نییە، کەچی مەدحی کەرەکەی دەکەن!

فێڵێک هەیە لەناو کوردان کۆتر فڕینێکی پێ دەڵێن؛ وا دبێ کچێکی گچکە دەدەنە پیاوێکی زەبەلاح. لێی مارە دەکەن. بۆی دەگەوێزنەوە و کچەکە لێی دەترسێ، هاوار هاوار دەکا بۆی ڕاناوەستێ ئیشی خۆی لەگەڵ بکا. ئاخری کۆترفڕنکێنی پێ دەکا؛ شەو یا ڕۆژە گەمەی لەگەڵ ژنەکەی دەکا ئەڵێ: وەرە کۆترفڕینکێت پێ بکەم.. بۆ خۆت دەفڕی.. دەچیتە دەرەوە. ئەویش پێی خۆش دەبێ.. دەڵێ باشە.. بە پەتێکی دەست و قاچی و پێی دەبستێتەوە و ئیشی خۆی لەگەڵ دەکا. دیارە ئەوی لاقی ببەسترێ چی بە سەر دێت! ئیتر لازمە ئینسان ئاگای لە دەست و لاقی خۆی بێت، وە ئیللا تێدەکەوێ.

بەڵێ ئەگەر ئەمڕۆ بڵێین عەقڵ لەنێو موسڵمانان فڕی، ڕاستە... گورج دەست هەڵبڕە و ئەگەر بڵێن: علم و زانین لەنێو کوردان فڕی، وایە.. خێرا دەست هەڵێنە، هیچ ڕامەوەستە، نە علم نە عەقڵ نە فکری تەنقید و محاکەمە لەناو موسڵمانان خسووسەن لەناو کوردان (ئەوانی تابعی شێخانن) نەمایە. فڕییە. ڕۆشتیە. لام وایە نایەتەوە مەگەر منداڵانێ کە تازە پێ دەگەن فێڵەکی بکەن، فاقە و داوێکی دابنێنەوە بەڵکوو تەیری علم و عەقڵی پێوە دەبێ و دەیگرنەوە. ئەویش لازمە باوکەکانیان لێیان گەڕێن لەسەر عەقڵی فیتریی گەورە بن، لێیان نەگۆڕن.

**مەلای گەورە**



ژمارە: ٣٦

فڕي فڕي قەل فڕى

دانەر

ماموستا مەلا محمدي جەلى كويى

كە ناوبانگى مەلاى «گەورە» يە

چاپي دووەمین

چاپخانەی هەولێر

هەولێر – ٢٥٧٨ ى كوردى (١٩٦٧) ز.

نرخی ٤٠ فلس

فڕي فڕي قەل فڕى



- **دەستخەت و وتارە بڵاونەکراوەکەی مەلاجەمیل ڕۆژبەیانی لەچلەی ماتەمینیی تۆفیق وەهبی بەگ (١٨٩٢-١٩٨٤)دا**

پ.ی.د. ئەحمەد باوەڕ

- **عەبدولحەکیم ئەفەندی .. یەکەم مامۆستای قوتابخانەی ڕوشدیە لەڕواندز و هەولێر**

یاسین برایم

- **ئەنفال لە زەمینەسازییەوە بۆ جێبەجێکردن و دادگاییکردن (بەشی پێنجەم و کۆتایی)**

عەلی مەحموود محەمەد

- **ڕووناکبیرانی کورد لە سەدەی نۆزدەدا**

موحەممەد گەلالەیی

دەستخەت و وتارە بڵاونەکراوەکەی مەلاجەمیل ڕۆژبەیانی

# لەچلەی ماتەمینیی تۆفیق وەهبی بەگ (١٨٩٢-١٩٨٤)دا

بەشی دووەم و کۆتایی




پ.ی.د.
ئەحمەد باوەڕ

مامۆستا تۆفیق وەهبی بەگ، یەکێک بووە لەو زانا و بیریار و کەسایەتییە سیاسیی و سەربازییانەی گەلی کورد، لە زۆر قۆناغی مێژوویی، وەک ڕۆژگاریی فەرمانڕەوایەتی دەوڵەتی عوسمانیی و ماوەی حوکمداریەتی شێخ مەحموودی حەفید لە شاری سلێمانی و لە عێراقی سەردەمی داگیرکاریی بریتانیا و دواتریش لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتی پاشایەتیدا (١٩٢١-١٩٥٨) گەلێک پلەوپۆستی جۆراوجۆری سیاسیی و سەربازیی و کارگێڕیی وەرگرتووە و ڕۆڵی بەرچاو و کاریگەریی هەبووە.

لە بواری ڕووناکبیریی، زمان، مێژوو، فەرهەنگ و ڕۆژنامەوانی، شوێن دەستی دیارە، لە بواری کاری حزبی و ڕێکخراوەیشدا، یەکێک بووە لەوانەی لە سەروبەندی سەرهەڵدان و دامەزراندنی (حزبی خۆیبوون) کە لە ساڵی (١٩٢٧) لە هاوینەهەواری (بحمەدون) هاتەکایەوە، بۆماوەیەک سەرۆکی لقی ئەو حزبە کوردییەی لە باشووری کوردستان و بەتایبەتی لە شاری سلێمانی گرتە ئەستۆ، جگە لە ئەندامێتی لە حزبی دەستووریی نوری سەعید (١٨٨٨-١٩٥٨) سەرۆک وەزیرانی عێراق، تا بەرپابوونی شۆڕشی ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨، کە بە یەکجاری عێراق و کوردستانی بەجێهێشت و لە شاری (لەندەن) نیشتەجێ بوو.

ماڵەکەی تۆفیق وەهبی لە ناوچەی وەزیرییەی شاری بەغدا بوو، بەتەنیشت کۆلێژی ئەدەبیاتی (زانکۆی بەغدا)ەوە، کە وەک ئەنجوومەنێکی ڕووناکبیریی وابوو، چونکە ماڵەکەی بەردەوام شوێنی دیدەنی و کۆبوونەوەی زۆرێک لە ئەدیبان و ڕووناکبیرانی کورد و عێراق بووە.

لە ساڵانی دواتریش بەدواوە خانووەکەی بۆماوەیەکی زۆر کرابووە شوێنی بەشی ڕاگەیاندنی کۆلێژی ئەدەبیاتی زانکۆی بەغدا.

تا ئەو کاتەنەش، کە ئێمە خوێندکاری ئەو کۆلێژە بووین لەساڵانی (١٩٨٨-١٩٩٢) دەمبینی خوێندکارانی بەشی ڕاگەیاندنی کۆلێژ هەر لەنێو خانووەکەی مامۆستا تۆفیق وەهبی بەگ دەوامیان دەکرد.

تا ئەوکاتە لە ڕووکاری دەرەوەی سەر دەرگای خانووەکەی، لەسەر ئاسنێک بە زمانی ئینگلیزی ئەمە (T.W.١٩٤٢) هەڵکۆلرابوو، واتە (تۆفیق وەهبی ١٩٤٢) ئەمەش بەڵگە و ئاماژە بوو بۆ ئەوەی، کە ئەو خانووەی ماڵی تۆفیق وەهبی تێدابووە، لە ساڵی (١٩٤٢) بونیاد نراوە بەسەریەکەوە ئەو زانا گەورەیەی کورد بۆ ماوەی شازدە ساڵ لەو خانووەی گەڕەکی وەزیرییە ژیاوە.

ئەم زانا گەورەییەی کورد، دوای ساڵانێکی زۆر لە ژیانی ئاوارەیی و دوورە وڵاتی لە سەروبەندی دانوستانی نێوان حکوومەتی عێراق و یەکێتیی


تۆفیق وەهبی بەگ

نیشتمانیی کوردستان (١٩٨٣-١٩٨٤) لە ڕێکەوتی (٥ی کانوونی دووەمی ١٩٨٤) لە لەندەن کۆچی دوایی کرد و لە (١٥ی کانوونی دووەمی ١٩٨٤) لەسەر وەسیەتی خۆی، تەرمەکەی لە ڕێگەی فڕۆکەخانەی نێودەوڵەتی بەغداوە، هێنرایەوە عێراق و بە یاوەری زۆرێک لە نووسەران و ڕووناکبیران و جەماوەرێکی زۆر لە بەغداوە هێنرایەوە شاری سلێمانی، بۆ ماوەی شەوێک تەرمەکەی لە مزگەوتی گەورەی شار دانرا، بۆ ڕۆژی دواییش لەسەر چیای (پیرەمەگروون) نێژرا.

ڕۆژی بەخاک سپاردنی، ڕێورەسمێکی جەماوەریی گەورە ڕێکخراو، کە هەریەک لە مام جەلال تاڵەبانی (١٩٣٣-٢٠١٧) سکرتێری گشتی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و شاعیری ناسراوی کورد شێرکۆبێکەس (١٩٤٠-٢٠١٣) لەسەر مەزارەکەی وتار و هۆنراوەیان خوێندەوە.

وەک نوێنەری کۆڕی زانیاری عێراق (دەستەی کورد) چەند کەسێک لە شاری بەغداوە، ئامادەی ڕێورەسمی ناشتنی تۆفیق وەهبی بەگ بوون. یەکێک لەوانە خوالێخۆشبوو مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی بوو، کە وتارێکی خوێندەوە.

مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی لە ڕێورەسمی چلەی ماتەمینەکەشی، کە لە (٢٤ی شوباتی ١٩٨٤) لە هۆڵی نەقابەی کرێکارانی شاری سلێمانی بەڕێوەچوو، وتارێکی خوێندەوە، ئەم وتارەی تا ئێستەش وەک دەستنووس ماوە، دەمەوێت لە ڕێی ئەم وتارەمدا بۆ یەکەم جار ئاماژەی بۆ بکەم و بڵاوی بکەمەوە.

مەلا جەمیل لە بەشێکی دەستنووسەکەیدا نووسیویەتی:



ڕێورەسمی بەخاکسپاردنی تۆفیق وەهبی، چیای پیرەمەگروون، ١٩٨٤
ئەوانەی دەناسرێنەوە، لەڕاستەوە: شانی شێرکۆ بێکەس دەرچووە، فواد مەعسوم، مام جەلال، فەرەیدون عەبدولقادر، مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی

هەروەک لە پیرمەگرون ووتم: نەتەوەی ...یە لە رووی شوێنەواری ئەدەبی و زانستی و خوێندەواری و پشکنینی وێرانە شارو ...شکەوتەکانەوە، بەڕاستی قەرزاری تەوفیق وەهبییە» کەچی هەریەک لە کەمال موفتی سەرۆکی دادگای تێهەڵچوونەوەی سەربازیی عیراق و بابەکر پشدەری و عەبدوڵلای حاجی سمایل (مەلاماتۆڕ) کە ئەوکاتە وەزیربوون لە حکومەتی عێراقی سەردەمی بەعس، لە شاری سلێمانی. ئامادەی ڕێوڕەسمی ناشتنەکەی توفیق وهبی لەسەر چیای پیرەمەرگروون نەبوون.

بەپێی ناوەرۆکی ئەو راپۆرتە رووناکبیرییەی، کە (ئاسۆس) ناوێک، وەک پەیامنێری گۆڤاری کاروان) لە ژمارە (١٩)ی نیسانی ١٩٨٤ بەناوونیشانی: «کاروانی رۆشنبیریی لە کوردستان» بڵاوی کردووەتەوەهاتووە: ێژنەیەکی یەکێتی نووسەرانی کورد (لقی سلێمانی) کۆڕێکی سێ کاتژمێریی بەرفراوانیان بۆ یادی چلەی ماتەمینی توفیق وەهبی لە هۆڵی نەقابەی کرێکاران سازکردووە، کە تیایدا ژمارەیەکی زۆر لە ئەدیبان و رووناکبیران لە بەغدا و شارەکانی کوردستانەوە ئامادەی بوون لەوانە مامۆستای چیرۆکنووس محەمەد موکری کە لە برگەیەکی وتارەکەیدا سەبارەت بە توفیق وەهبی نووسیویەتی: «ئێمە لەڕوانگەی ئەدەب و خزمەتگوزاری بە وشەی کوردی دەڕوانینە ئەم کەڵە نووسەرەمان، سەری ڕێز و نەوازش بۆگیانی پاکی دادەنەوێنین لەنێو ناخ و ویژدانماندا وەک کوردستان زیندووە، وەک پیرەمەگروون سەربەرز دەمێنێتەوە»

دواتریش هەریەک لە ئەحمەد خواجە، محەمەد بەدری و پاشان عەبدول لەتیف گلی لە بەغداوە، وتاری کۆڕی زانیاری عێراق-یان خوێندووەتەوە، سەرەرای خوێندنەوەی وتارێکی مامۆستا عەلائەددین سەجادی، کە لەلایەن محەمەد نوری توفیق-ەوە خوێندراوەتەوە، جگە لە خوێندنەوەی وتاری هەریەک لە مامۆستا کەریم مستەفا شارەزا بە ناوی یەکێتی نووسەرانی هەولێرەوە، هاوکات مومتاز حەیدەری، مستەفا نەریمان، حەسەنی شێخ مارف، کەمال ڕەئوف محەمەد، عەبدولڕەحمان موفتی و هەروەها وەک ئافرەتانیش هەریەک لە لەیلانی شاعیر و ناهیدەی شێخ سەلام بەشداری کۆڕی چلەی ماتەمینییەکەیان کردووە و لە کۆتاییشدا نەوشیروان فوئاد مەستی برازای توفیق وەهبی وتاری بنەماڵەی خوێندۆتەوە و شان بەشانی هەموو ئەوانەش مێژوونووسی شەهید مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی لەشاری بەغداوە و وەک هاوڕێ و دۆستێکی نزیک و لەمێژنەی مامۆستا توفیق وەهبی بەگ بە وتارێک بەشداری کردووە، کە لێرەدا وتارەکەی و دەستنووسە بڵاونەکراوەکەی ڕۆژبەیانی دوای تێپەڕبوونی نزیکەی چل ساڵ بڵاودەکەینەوە، بەهیوای ئەوەی نووسەران و لێکۆڵیارانی کورد بتوانن لە داهاتوودا سوودی لێ وەربگرن.

> ”تەوفیق وەهبی جگە لە زمانی کوردیی مادەر زادی، تورکی و فارسی و عەرەبی، و ئینگلیزی و ڕوسی و فەرەنسی-شی دەزانی، هەندێکیش پەهلەوی و سانسکریتیش، بۆیە زۆر چاک لە زانستی نەکۆڵییەوە“

### رابەری نووسەران، تەوفیق وەهبی بەگی نەمری جاویدان!

خوشکینە! براینە!
«مەرگ و ژین میثلی سێبەر و تاوە»
«ئەوەی باقی بمێنێ هەر ناوە»

ئەوانەی هەستی مرۆڤایەتیان هەیە، و خێوی چەشکەی ئەدەبی و زانستین، زۆریان ئەمرۆکە لێرەدا کۆڕیان بەستووە بەهۆی یادی چلەی کۆچی تەوفیق وەهبی بەگەوە، لەناخی دڵەوە قوڵپی عەسر ئەدەن و بەچاو سەیلاوی فرمێسک ئەڕێژن بۆ لەدەس چوونی زانای مەزن تەوفیق وەهبی بەگ، کە دوورە وڵات سەری نایەوە و کۆچی دوایی کرد و تەرمەکەی بەرەو وڵات گەڕایەوە.. ئەمە هۆی سەرسوڕمان نییە، زۆر لە نووسەران و هەستیاران و گەورە پیاوانی ئێمە دوورە وڵات مردوون و تەرمەکەشیان نەگەڕاوەتەوە. ئەوە مەولانا خالیدی میکایەلی شارەزوری ئەوە سەر ئامەدی هەستیارانی کورد «نالی»ی خاکوخۆڵی، ئەوە بولبولی نیشتمانی ی کوردستان حاجی قادری کۆیی..

تەوفیق وەهبی ساڵی ١٨٨٩ی زا لە سلێمانی لە دایک بووە، لە بنەماڵەیێکی خوێندەوارا کە هەندێکیان هەستیار بون و لە سەرەتای ئەم ساڵی ١٩٨٤دا لە لەندەن کۆچی دوایی کرد،

بەڕاستی تەمەنێکی درێژ و پانی ڕابوارد. کە دەڵێم تەمەنی درێژ مەبەستم ساڵەهای زۆری تەمەنێتی، بە قوتابێتی، ضابطی، کاربەدەستی، وەزیری.. و کە دەڵێم تەمەنی پان، مەبەست ئەو تەمەنەیە کە خزمەتی وولاتەکەی تیاکرد بە گەشت و گوزاری کۆنە شار و ئەشکەوتەکان، بە دانانی باشترین دەستوری زبانی کوردی، و بەمەدا خۆی کرد بە«سیبویة» (یا سبەوەیهی) کە بۆ یەکەمجار دەستورێکی زبانی ڕێکی بۆعەرەب دانا.

> لاتان سەیر نەبێ کە تەوفیق وەهبی بەم زستانە سەختە داوای کردبوو بیبەنە پیرەمەگرون، ئەوانەی دوورە ولات ئەکەونە مردن و گیانەڵا، ئەم جۆرە نیازەیان هەر هەیە، حەز لە بینی خاکەکەیان ئەکەن

تەوفیق وەهبی جگە لە زمانی کوردی مادەر زادی، تورکی و فارسی و عەرەبی، و ئینگلیزی و ڕوسی و فەرەنسی شی دەزانی، هەندێکیش پەهلەوی و سانسکریتیش، بۆیە زۆر چاک لە زانستی ئەکۆڵی یەوە، و قایل نەبو بە قسەی سادەی مێژونووسان. ئێمە نازانین لە دەورانی عوثمانی دا چی کردووە؟ چی نووسیوە؟ خۆی لەو بارەوە نەدوواوە، وەک بەهەشتی یان ئەمین زەکی بەگ، پیرەمێرد، ڕەفیق حیلمی کە بەکاری ئەو سەردەمەی خۆیانەوە نازیون، ئەو ئەنازیوە. هەروەک لە «پیرمەگرون» ووتم: نەتەوەی ئێمە لە ڕوی شوێنەواری ئەدەبی و زانستی و خوێندەواری و پشکنینی وێرانە شار و ئەشکەوتەکانەوە، بەڕاستی قەرزاری تەوفیق وەهبی یە. ئەوە ووتارەکانی خۆی لە گۆڤارەکانی گەلاوێژ، دەنگی گێتی تازە، پەیام، کۆڕی زانیاری بە کوردی بڵاوکردۆتەوە. لە گۆڤارەکانی «سوممەر، ئەلموعەلیم الجدید، مەجەلەت الکوتتاب، مەجەلەت المجمع العیلمی»شدا بە عەرەبی بلاوی کردۆتەوە. نامیلکەکانیشی هەر چەندە بەقەبارە بچوکن، بەلام بۆ کورد هەر لاپەڕەیێکیان دە هەزار لاپەڕە لەو کتێبە زل زلانە دەهێنێ کە باسی پڕ و پیرێژن و هەڵمەتە کاسەی بێگانەیان تیایە. گەرچی دۆستی خۆشەویست مامۆستا سەید مصطەفا نەریمان، ناوی زۆر لە نووسراوەکانی ئەوی لە ڕۆژنامەکانا خستۆتە بەر چاوی خوێنەران و خوێندەواران، بەلام من لێرەدا تێچەنی خۆم ئەخەمە لاپەڕەکانی ئەم یادە شیرینەوە:

١- خوێندەواری باو، بەکوردی لاتینی نووسراوە.
٢- دەستوری زمانی کوردی، دوو بەرگە.
٣- قسنێ لە کوردستانا (قزقاپان)
٤- دینی کۆنی کورد، من ئەم کتێبەم بەفارسی و بە عەرەبیش وەرگێڕاوە.
٥- ئەشکەوتەکەی گوندوک.
ئەمانە بەکوردی نووسرابون.
١- القصد والاستطراد في اصول معنى بغداد.
٢- ابعاد معنى اليحمور عن اسم الملک «بهرام گور» لەم سیپارەیەدا وای دەرخستووە کە ووشەی (گۆڕ) کەرە کێوی نی یە، وەک فارسەکان ووتویانە، بەڵکو گۆڕاوی (گۆر) گورانە.
٣- سفرة من دربندي بازيان الى ملەی تاسلوجە.
٤- الجسر الذهب (ئالتون کۆپرو).
٥- اصل اسم کرکوک.
٦- اصل تسمية شهرزور.
٧- قواعد اللغة الكوردية.
٨- دروب السياسة.

و زۆری تری کە بەعەرەبی نووسراون.
نامیلکەی زۆریشی بە ئینگلیزی نووسیوە.
١- میثرائی لە هەتەرە و لە کوردستانا، باسی ئایینی کۆنی هەزارەها ساڵ لەمەو بەری کوردە.
٢- ڕەگەزەی کورد، مشتومڕێکە لەگەڵ «مینۆرسکی» و «مەکنزی» لەسەر ئەوەی کە مادەکان کوردبون، و بەرانگاریان وەستاوە دەڵێ: ئەگەر کوردەکانی ئێستە هەر مادەکانی کۆن نەبن، ئەی ئەونەتەوە گەورەیە ئەو دەوڵەتە بەهێزەی «سکا»ی لەناو برد «خەلەدی» و «ماننا»ی خستە ژێر چنگی خۆیەوە، تەخت و بەختی بەدەسەڵات ترین هێزی جیهانی ئەو ڕۆژەی تێک و پەکاندا چی لێ هات؟ ئایا نەتەوەکە توفان بردی؟. بێگومان نەء ! « کەوا بێ کوردەکانی ئێستە هەر مادەکانی جارانن!»

جگە لەمانەی ووترا، خۆتان ئەزانن تەوفیق وەهبی وەک مێشی هەنگ، تا گیانی سپارد، شتی بۆ کورد نووسی کە ماون و هیوایە بەرچاوکەون.

تەوفیق وەهبی خێوی قەڵەم بو، خزمەتی خۆی بۆ کورد کرد، ئێمەی کورد لەو هەڵەیانەی کردویە، خۆش ئەبین، کە خۆی لێی پەشیمان بووەوە، دەیوت: «کورە تەوفیق» تۆ چی و سیاسەت چی؟! تۆ چی وحیزبی ئوممە چی؟ تۆ زانای، دەبێ بۆ زانین بژی.

حاجی قادری کۆیی بەهەشت جێی بێ، فەرموبوی

«شیر و قەڵەم شەریکن لەم عەصرەدا، دریغا

«شیرم قەڵەمتراشە و کالانی یە قەڵەمدان»

برادەرە گەورەکەی خۆشمان ووتویە:

«ئەوەی وولات و نەتەوە ئەپارێزێ نووکی قەڵەم و نووکی لوولەی چەکە»

حاجی قادر مێشکی کورانی وولاتی ساودا.. تەوفیق وەهبی زبانەکەی بۆ ساودان... تا مردیش بەئاواتی ئەوەوە بو، کە بتوانێ زۆرتر بەهرە بخاتەوە. پیرەمێرد ووتەنی: «نامرن ئەوانەی لە دڵی میللەتا ئەژین» تەوفیق وەهبی نەمردووە و نامرێ.

«هەرگیز نەمیرد
ئانکە دلەش زیندە
شود بە عەشق
ثەبت است بر
جریدەی عالەم دوام ما»

لاتان سەیر نەبێ کە تەوفیق وەهبی بەم زستانە سەختە داوای کردبوو بیبەنە پیرەمەگرون، ئەوانەی دوورە وڵات ئەکەونە مردن و گیانەڵا، ئەم جۆرە نیازەیان هەر هەیە، حەز لە بێتی خاکەکەیان ئەکەن..

کابرایەکی هەستیار ووتویە:

«دەر
غوربەت
ئەگەر مەرگ
ڕەسەد بەر
بەدەنی ما
ئایا کی
کەنەد گوڕ و کی دوزەد
کەفەنی ما
تابوت مەرا بە ڕجای
بلەندی بگوزار
شایەد کی وەزەد باد وەطەن
بەر بدەنی ما»

ئیتر جاویدانی بۆ گەل و نەمری بۆ تەوفیق وەهبی.

**ڕۆژبیانی**
**١٩٨٤/٢/٢٤**

> **مەلا جەمیل لە بەشێکی دەستنووسەکەیدا نووسیویەتی: هەروەک لە پیرەمەگروون ووتم: نەتەوەی ئێمە لە ڕووی شوێنەواری ئەدەبی و زانستی و خوێندەواری و پشکنینی وێرانە شارو نەشکەوتەکانەوە، بەڕاستی قەرزاری تەوفیق وەهبییە**













دەستنووسی وتارەکەی مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی

# عەبدولحەکیم ئەفەندی

## یەکەم مامۆستای قوتابخانەی ڕوشدیە لەڕواندز و هەولێر

کەسایەتییەکی دیار، لە بنەماڵەیێکی ئایینی قەزای ڕواندز و کوردستان لە بواری زانست و پەروەردە و فێرکردن، خزمەتێکی زۆری کردووە بەتایبەتی لە دامەزراندنی قوتابخانەی ڕوشدیە لە ڕواندز و هەولێر لە ساڵی ١٨٦٨ وەک مامۆستای یەکەم ناوی هەیە.

لە ساڵنامەی مووسڵ و بەغدا و بەڵگەنامەی عوسمانییەکان و سەرچاوە عەرەبییەکان، کاتێ باس لە پرۆسەی پەروەردە و فێرکردن دەکرێت، بەتایبەتی ویلایەتی مووسڵ، ناوی ئەو مامۆستایە بەرچاو دەکەوێت، ئەویش مامۆستا عەبدولحەکیم ئەفەندییە. کوڕی زانا و موفتی و کەسایەتی دیاری عێراق و میرنشینی سۆران (مەلای خەتێ)یە. عەبدولحەکیم «محەمەد کوڕی مەلا ئەحمەد کوڕی عەبدولڕەحمان کوڕی ئیسماعیل کوڕی سلێمان[1])ە.

لە شاری ڕواندز لەدایکبووە، ڕەنگە هەر لەو شارەش خوێندنی ئایینی خوێند بێت، ساڵی لەدایکبوونی دیار نییە، بەپێی ئەوەی باوکی «مەلای خەتێ لە ساڵی ١٢٢٥ کۆچی دوایی کردووە، یەکێک بووە لە زانا بەناوبانگەکان[2]

مەمدوح مزوری دەڵێت: «مەلای خەتێ لەدەوروبەری ١٨٥٠ لە ڕواندز کۆچی دوایی کردووە لە گەردەگەرد نێژراوە[3]»

عەبدولحەکیم ئەفەندی بە نزیکەیی لە سەردەمی پاشای گەورە (١٨١٣_١٨٣٨) لەدایک بووبێت. باوکیشی لە ساڵانی سیی و چلەکانی سەدەی نوزدەیەم مردبێت، کە لەتەمەنیی پیریدا بووە. بە پشتبەستن بە چەند بەڵگەنامەیێکی سەردەمی عوسمانیی، هەندێک زانیاری لەسەر ئەم مامۆستایە دەخەینە ڕوو.



**یاسین برایم**

لە بەڵگەنامەیێکی عوسمانیی کە بەژمارە [mf.mkt. ٤٠٨,٥٤, لە ٥ی ڕەبیعی یەکەم ١٣١٦] تۆمارکراوە« مامۆستای پلە یەک عەبدولحەکیم ئەفەندی لە مەکتەبی ڕوشدیە لە هەولێر لە بارەی خانەنشینی ڕەزامەندی نەدراوە / ٢٨ی نیسان/ ١٣١٢[4]»

لە نووسراویکی دیکە، تۆمارکراوە بە ژمارە [MF,MKT ٣٤٤,٦ , ٥ی ڕەمەزان ١٣١٣] بۆ بەڕێوەبەرایەتی مەعاریفی مووسڵ کراوە، تێدا هاتووە «مامۆستای پلە یەکی ڕوشدیە لە هەولێر حەز دەکات خانەنشین بکرێت، بۆ ئەم مەبەستە داواکاری پێشکەش کردووە. ئەمر و فەرمان بۆ ئەو کەسەیە فەرمان دەردەکات. لە ٥ی ڕەمەزانی پیرۆز ١٣١٣ و ٢٦ی کانوونی دووەم ١٣١٢.

محەمەد تۆفیق، بریکاری بەڕێوەبەری مەعاریفی مووسڵ[5]». بەپێی ئەو نووسراوەی مامۆستا عەبدولحەکیم ئەفەندی بە خەت و ئیمزا و مۆری خۆی نووسیووە« کە بۆ وەزارەتی مەعاریفی ناردووە و دەڵێت: «لە مێژووی ٨٥* تا ئێستا کە نزیکەی ٣٠ ساڵە بە پیشەی وتنەوەی وانە خزمەتم هەیە لە ناو ویلایەتی مووسڵ، قەزاکانی ڕواندز و هەولێر لە مەکتەبەکانی ڕوشدییە بە مامۆستای پلە یەک لە پیشەکەم بەردەوام بوومە و خزمەتم کردووە، بە هۆی تەندروستی لە ساڵی ١٣١٢ داوای خانەنشینیم کردووە، بۆیە لە ئەنجوومەنی تەندروستیش بەپێی ڕاپۆرتی تەندروستی بۆ ئەم مەبەستە نێردراوەتە وەزارەتی خانەنشینی، ئەم نموونەیەی کە بۆ

ـەزرەتی خانەنشینی نێردراوە لەگەڵ ڕاپۆرتی
ـەندروستی وەکوو یەک نییە، بۆیە دووبارە
ـەوەی پشکنینی تەندروستیم لێکراوە. هەروەها
ـەرئەوەی لەناو قەزای هەولێر پزیشک نییە،
ـێویست دەکات بچمە مەرکەزی ویلایەت، بۆ
ـەوەی، دووبارە پشکنینم بۆ بکرێتەوە، چونکە
ـەر کارەکەش مۆڵەتم پێ نادەن. پێویست
ـەکات کەسێک لە شوێنم دابندرێت تا لە مووسڵ
ـەگەڕێمەوە. ئەمر و فەرمان بۆ ئەو کەسەیە کە
ـەرمان دەردەکات. ٢٣ی تشرینی دووەم ١٣١٣.

ـواکار/ مامۆستای مەکتەبی ڕوشدیە/ هەولێر.
ـوزی عەبدولحەکیم.[٦]»

ـەم داواکارییە چەند ڕاستییەکی حاشا
ـەڵنەگری تێدایە. ناوبراو تەندروستی باش
ـەبووە و لەتەمەنی پیریدا بووە، نزیکەی ٣٠
ـاڵ خزمەتی هەبووە. بەو پێیەی داواکارییەکە
ـە ساڵی خوێندنی ١٨٩٤_١٨٩٥ نووسراوە. ئەو
مێژووە دەگەڕێتەوە بۆ مێژووی دامەزراندنی
قوتابخانەی ڕوشدیە لە هەولێر و ڕواندز ساڵی
١٨٦٨. بەهۆی نەبوونی پزیشک و ڕاپۆرتی
تەندروستی و مۆڵەت پێ نەدان و دووری
هەولێر لە مووسڵ لەم داواکارییە بەدی
ـەکرێت. لە نووسراو و بەڵگەنامەکان زۆر
شتمان بەرچاو دەکەوێت لەسەر ئەم خانەنشین
بوونە. ئەمە لە بەڵگەنامەی [٤٦٦,٢٩ MF.MKT,
١٨ی سەفەر١٣١٨] تۆمارکراوە.

ـە نامەیێک بۆ بەڕێوەبەرایەتی ئۆفیسی
ـواناوەندی لە ویلایەتی مووسڵ، دەڵێت: «لە
مێژووی ١٦ی کانوونی یەکەمی ساڵی١٣١٥
ژمارە (٣) وەڵامی داواکارییە لەبارەی
گورینەوەی شوێنی مەکتەبەکانی ڕوشدیە، کە
ناکرێت، مامۆستای ڕواندز، ئەسعەد ئەفەندی،
کە ناوی تۆمارکراوە، کەچی لە خزمەتی ناوبراو
عەلی ئەفەندی لە شوێنی ئەوە، لەبەر ئەوەی
لە مێژووی ٤ی تشرینی یەکەم ساڵی ١٣١٥ کە
ناوبراو بوونی نییە، بەڵام لە داواکاری مێژووی
١٦ی کانوونی یەکەم ١٣١٥ عەبدولحەکیم
ئەفەندی مامۆستای مەکتەبی ڕوشدیە لە
کاغەزی ناوبراو، کە ناردوویەتی، لە ئەنجوومەن
باس دەکرێت[٧]

هەر ئەو نووسراوە کە بۆ وەزارەتی مەعارفی
گشتیی ناردراوە بە مۆری (محەمەد تۆفیق_
بەڕێوەبەری مەکتەبی دواناوەندی لە وەکیلی
بەڕێوەبەری مەعارفی مووسڵ) ئەوها باسکراوە:

«.... لەبەر هەندێک هۆکاری قەدەغەکراو
مامۆستاکانی هەولێر و ڕواندز گۆڕینەوەیان
ناگونجێت لەگەڵ ئەوەی مامۆستای ڕواندز
بەناوی ئەسعەد ئەفەندی تۆمارکراوە، کەچی لە
شوێنی ئەو عەلی ئەفەندی بەکار دەهێندرێت.
هەروەها مامۆستای هەولێر (عەبدولحەکیم
ئەفەندی) لە نووسراوی ناوبراو فەرمان و
ڕەزامەندی دراوە. هەرچی مەسەلەی مامۆستای

**"عەبدولحەکیم ئەفەندی پێدەچێت لە سەردەمی پاشای گەورە لەدایک بووبێت. باوکیشی لە ساڵانی سیی و چلەکانی سەدەی نوزدەیەم مردبێت"**



ڕواندزە لە مەکتەبی خودنجود و موفتی خانەی قەزای ڕواندز دامەزراوە. لەبەر ئەوەی وەکوو موفتی ئەندامە لە ئەنجوومەنی کارگێڕیی قەزا. ناتوانێ لە مەکتەب درێژە بەکارەکەی بدات، بۆیە لە شوێنی ئەو، شێخ عەلی داندراوە. لە فەرمانی عالی لە وەزارەتی پەناهی ژمارە ٣ لە مێژووی ٨ی شوبات ١٣٠٩ ڕەزامەندی دراوە. فەرمان بۆ ئەو کەسەیە، کە فەرمان دەردەکات لە ١٦ی جەمادی ١٣١٧ و ٩ ی تشرینی یەکەم ١٣١٥[8]



خانەنشینەکەی زۆری خایاندووە، زۆر هات و چوونی پێکراوە. شوێنی دەوامکردنی بەزۆری هەولێر و ڕواندز بووە. بەپێی ساڵنامەی ویلایەتی بەغدا هاتووە لە ساڵی ١٨٧٥ لە ڕواندز مامۆستا بووە[9].

لە ساڵانی خوێندنی «١٨٩٠، ١٨٩٤ و (١٨٩٨_١٨٩٩) و (١٨٩٩_١٩٠٠) و (١٩٠٠_١٩٩١) و (١٩٠١_١٩٠٢) لە شاری هەولێر مامۆستابووە[10]

ڕەنگە ساڵانی پێشووش لە ڕواندز بوو بێت. واتە لەو دوو شارە لە دەستپێکی کردنەوەی قوتابخانەی ڕوشدیە و ١٨٦٨ تا ١٩٠٢ بەردەوام بووە لە پرۆسەی پەروەردە و فێرکردن.

لەسەر جۆری خوێندن و بڕوانامە و شوێن و مامۆستایەکانی، زانیاریمان بەردەست نەکەوتووە. ڕەنگە لە بەڵگەنامە و ئەرشیفی عوسمانییەکان، زانیاری لەسەر ژیان و خوێندن و بڕوانامەی هەبێت، چونکە ئەو زیاتر لە ٣٠ ساڵ خزمەتی بواری پەروەردە و فێرکردنی کردووە. بێجگە لەوەی ئەو مرۆڤە ناوێکی دیاری پەروەردەیە، منداڵەکانیشی درێژە بەو پرۆسەیە دەدەن و لە بواری زانست و خوێندن و خزمەتکردنی ئایین و کاری وەزیفیدا، پلە و بەرپرسیارییەتی گەورە وەردەگرن. تەنانەت کوڕەکەی لە بەڵگەنامەیێکی عوسمانییدا ئەوها ناوی هاتووە. «محەمەد خورشید لە مەکتەبی ڕوشدیەی هەولێر بە بەرزترین پلە لە ١٦ی تەمووز ١٣١٢ بڕوانامەی وەرگرتووە[11]».

عەبدولحەکیم مامۆستای ڕوشدیە بوو لە ڕواندز لە ساڵی ١٣٢٢ کۆچی دوایی کردووە، محەمەدئەمینی ئەفەندی کوڕی موفتی بووە لە ڕواندز و خورشیدبەگ لە ساڵی ١٣٢٥ دەرچووی یاسابووە لە ئیستانبۆل و پاشان لە زۆر شوێنی دیکە وەزیفەی وەرگرتووە[12].

عەبدولحەکیم ئەفەندی(**) لە هەولێر مردووە و

**«بنەماڵەی خەیلانیی و مەلای خەتێ لەسەردەمی پاشای گەورە، چەندین زانا و عەلامە و مەلای گەورەیان تێدا هەڵکەوتووە و گەلێ زانا و شاعیر و کەسایەتیی گەورە لەسەر دەستی ئەوان پەروەردەکراون و پێگەیشتوون»**

...یەکەشی هەر لەوێیە. لە دوای مردنی ئەویش، ...ڕەکەی جێگەی دەگرێتەوە. «لە ساڵی ١٩٠٢ ...مۆستای یەکەم، عەبدولحەکیم کۆچی دوایی ...کات کوڕەکەی ئەمین ئەفەندی کە شارەزایی ...ی لە تاقیکردنەوەکە سەلماند، دەستبێشان ... و فەرمانی پێدرا بۆ ئەو کارە و ڕۆیشت بۆ ...وێنی کارەکە و دەستبەکار بوو[١٣]»

...ربارەی هەبوونی نووسین و دەستنووس، ...ەک یەکێک لە نەوەکانی دەڵێت: «زانایەکی گەورە بووە و زۆر ڕۆشنبیر بووە لە بواری ...ەرع، ئایین و پەروەردە، هیچ شتێکمان ...ینیوە و لامان نییە، تەنانەت خورشیدەفەندی ...یریشم شتی وەهای لەپاش بەجێ نەماوە[١٤]».

...ماڵەی (خەیلانیی و مەلای خەتێ) وەک ...ماڵەی ماڵە مەلایانی ڕواندز ناسراون، ...سەردەمی پاشای گەورە، چەندین زانا و عەلامە و مەلای گەورەیان تێدا هەڵکەوتووە و حوجرە و مەدرەسە و مزگەوتی ئەوان لە فەقێ و مەلایان جمەیان هاتووە و گەلێ زانا و شاعیر و کەسایەتیی گەورە لەسەر دەستی ئەوان پەروەردەکراون و پێگەیشتوون. هەرکاتێک باس لە بواری خوێندنی ئایینیی بکرێت لە شارەکە، ماڵە مەلایەکان(***) بەشی شێریان بەردەکەوێت. بۆیە مامۆستا عەبدولحەکیم-یش پەروەردەی نێو ئەو خێزان و بنەماڵە و شارە ڕۆشنبیرو ناودارە بووە و بۆیە چرای زانستی ئەویش هەمیشە پرشەنگداربووە.

## پەراوێز و سەرچاوەکان


١. حەیدەر عەبدوڵلا، مەلای خەتێ لە نێوان حەقیقەت و خەیاڵدا، ماڵپەڕی مێژووی کورد، ٢٠١٨/٣/٢٨.

٢. محمد علی القرداغي، ورود الكرد فی حديقه الورود، دار ئاراس للطباعه و النشر، الطبعة الثانية، اربيل، ٢٠٠٧، ص٢٢٠.

٣. مەمدوح مزوری، بنەماڵانی بەناوبانگی ڕواندز، هەولێر، ١٩٩٨، ل٣٠.

٤. د. نەوزاد یەحیا باجگر، هەولێر لە بەڵگەنامەکانی عوسمانی دا، بەرگی یەکەم، ٢٠١٨، ل٢٨١.

٥. د. نەوزاد یەحیا باجگر، هەولێر لە بەڵگەنامەکانی عوسمانی دا، بەرگی دووەم، ١٩١٨، ل٢٠٩.

٦. هەولێر لە بەڵگەنامەکانی عوسمانی دا، بەرگی یەکەم، ل٢٦٦.

٧. سەرچاوەی پێشوو، ل٣٠٢.

٨. هەمان سەرچاوە، ل٣٠٢.

٩. فاضيل بيات، الموسسات التعليمية المشرق العربي العثماني، استانبول، ٢٠١٣، ص٢٧١.

١٠. مهدی محمد قادر، التعليم فی جنوب كوردستان في العهد العثماني الاخير ١٨٦٩_١٩١٨، اربيل، الطبعة الاول، ٢٠٢١، ص ١٤١_١٤٢. فاضيل، ٢٧٠_٢٧١.

١١. هەولێر، بەرگی یەکەم، ل٣٥٥.

١٢. محمد علي القرداغي، ص ٢٢٠.

١٣. مهدی محمد قادر، ص ١٤١.

١٤. سهیلە زیائەدین خورشید، مامۆستای خانەنشین، ١٩٤٦، هەولێر، نامە، ٢٠٢٢.


* مەبەستی ساڵی (١٢٨٥)ە.

** لەوسەردەمە کەسایەتییەکی دیکەی بەناوبانگ بەناوی (مەلا عەبدولحەکیم)ی ماڵە مەلایان لە گوندی ئاکۆیان_ڕواندز هەبووە، باوکی مەلاتاهیرە کوێر، باپیری (مامۆستا حەکیم تاهیر).

*** لە (ئاکۆیان)ش، ماڵە مەلا هەیە و مێژووەکەیان لە هی ڕواندز کۆنترە و مەلا و زانای گەورەیان تێدا هەڵکەوتووە و تا ئێستاش مەلای لێیە.

**تێبینی:** ڕەچەڵەکی بنەماڵەی عەبدولحەکیم ئەفەندی لە لایەن مامۆستا (سهیلە زیائەدین خورشید ئەفەندی عەبدولحەکیم) وەرگیراوە.

عەلی مەحموود محەمەد



# ئەنفال لە زەمینەسازییەوە بۆ جێبەجێکردن و دادگاییکردن

بەشی پێنجەم و کۆتایی

## ئەنفالی هەشت

پرۆسەی ئەنفالی هەشت، تاکە ئۆپەراسیۆنی ئەنفالە لە دوای ڕاوەستانی شەڕی ئێران عێراق لە ڕێککەوتی ٨-٨-١٩٨٨ بەڕێوە چوو. لەو کاتەی هیچ بەهانەیەک بۆ هاوکاریکردنی ئێران لە لایەن بەشێک لە پارتە کوردییەکانەوە نەمابوو.

ئۆپەراسیۆنەکە لە ڕۆژی پێنج شەممە ڕێککەوتی ٢٥-٨- ١٩٨٨ ەوە تاکو ڕۆژی سێشەممە ڕێککەوتی ٦-٩-١٩٨٨ و بۆ ماوەی ١٣ ڕۆژ بەردەوام بوو، بە ڕووپێوی ١٠،٣٦٠ کم چوارگۆشە.

سوپاو جاش لە یانزە قۆڵەوە پەلاماری ناوچەکەیان دا (دهۆک، زاخۆ، کانی ماسی، دێرەلوک، سەرسەنگ، دینارتێ، ئاکرێ، ئەتروش، زاوێتە، زێوە شێخان و شێروان مازن).

ئۆپەراسیۆنەکە بە سەرکردایەتی لیوا ڕوکن سوڵتان هاشم فەرماندەی لەشکری یەک، فەرماندەیی لیوا ڕوکن یونس محەمەد ئال زەرب فەرماندەی لەشکری پێنج، لیوا ڕوکن کامل ساجد فەرماندەی لەشکری دوو، بەسەرپەرشتی ڕاستەوخۆی فەریقی یەکەمی ڕوکن عەدنان خەیرڵلا وەزیری بەرگری عێراقی، عەلی حەسەن مەجید بەرپرسی بیرۆی باکووری حزبی بەعس، سەرۆکی ئەرکانی سوپا بۆ کاروباری ئەرکانی سوپا، فەریقی ڕوکن نزار عەبدولکریم خەزرجی ئەنجامدرا.

ئەم ئۆپەراسیۆنەش وەک ئەنفالەکانی پێشووتر، بە هێرشی چەکی کیمیاوی دەستی پێکرد، سەرەتا لە ڕێککەوتی ٢٤-٨-١٩٨٨ گوندی سپیندارەی قەد پاڵی چیای گارە بە بۆمبی هێشوویی و کیمیاوی بە پانتایی ٣٠ کم بۆردومان کرا، کە چەند کەسێک شەهید بوون، هاوکات هەمان ڕۆژ زێوەشکان، کە بارەگای لقی یەکی پارتی دیموکراتی کوردستانی لێ بوو بەر هێرشی چەکی کیمیاویی کەوت، کە (١٠) پێشمەرگە شەهید بوون.

دەڤەرەکە بە چڕترین شێوە ١٩ جار لە ماوەی ئەو ١٣ ڕۆژەدا کیمیاباران کرا، تەنیا لە ٢٥ی ئاب شەش جار بۆردمان کرا، لەو پەلامارانەدا، بە چەکی کیمیاوی زیاتر لە ٤٥ گوند بەرکەوتن، کە سەدان کەسی بوونە قوربانیی.

هێزەکەی حکومەت جگە لە لەشکری پێنج سوپای عێراقی، چەند بەشێکیش لە سوپاکانی (١،٢،٣،٤، ٦،٧) کە لە ناوەڕاست و خۆرهەڵات و باشووری عێراقەوە گوازرابوونەوە بۆ ناوچەکە بەشدارییان تێدا کرد، ئەم هێزانە زیاتر لە (٢٥٠) هەزار سەرباز دەبوون، وێڕای لانی کەم ١٦٣ فەوجی جاشی خەفیفە، کۆی گشتیی ٦٥،٣٧٥ جاش بەشداری ئۆپەراسیۆنەکەیان کرد.

بەپێی بەڵگەنامەیەک بە واژۆی سەرکردەی ئۆپەراسیۆن لیوا ڕوکن یووسف محەمەد ئەل زەرب، فەرماندەی لەشکری پێنج لە جۆری (ئەو پەڕی نهێنی و تایبەت) بە ژمارە (ح٢ ٢٤٢٢) لە (٢٥ ک. ١. ١٩٨٨) بۆ فەرماندەیی گشتیی، کە بۆ

ـوپای ناردووە، تێیدا دیاری کردووە، کە لەو شاڵاوەدا ـ١٣٠٠ کەس دەستگیر کراون، کە « ٨٩٣ کەسیان ێکەرن «پێشمەرگە» ٧٣٧ کەسیان تێکدەری خۆ ـەستەوە دەر، ١٤٨٩ پیاو، ٣٣٧٣ ژن، ٦٩٦٤ منداڵ» ـوونە. هاوکات لە ڕاپۆرتەکەدا ستایشی ڕۆڵی فەوجە ـفیفەکانی کردووە، کە لە هەموو قۆڵەکانەوە پێش ـرتەکانی سوپا کەوتوونە و بەشداری ڕووخاندنی ـیکان و تالانییەکانیان کردووە.

ـە ئۆپەراسیۆنەدا ٤٤٨ گوند تێکدراون. بەپێی بەڵگەنامەی حکومەتی عێراقی پەنجا هەزار کەس ئاوارەی تورکیا ـ دوو هەزاریش ئێران بوونە. ڕێکخراوی ئەمنستی ـتەرناشیۆناڵ ژمارەی ئاوارەکانی تورکیای بە ٥٥٠٠٠ کەس داوەتە قەڵەم، لە بڵاوکراوەیەکی خۆیدا، کە لە ڕێککەوتی ١٤-٦-١٩٩٠ دەرچووە. لێ مەزەندە دەکرێت ١٦٠٠٠٠ کەس ئاوارە بوونە بۆ تورکیا و ئێران. لە ڕێگەی خۆ دەربازکردن، کە زۆر لە نەخۆش و منداڵ ـ پیرەکان مردن و بەرگەی ڕێگەی سەختی هەڵاتنیان ـەگرتووە، ئۆردوگاکانی ناوخۆ و دەرەوەش بۆیان بوونە گۆڕستانێکی دی.

ـەنفالی هەشت، لە ڕوی تاوانی کۆمەڵکوژی مەیدانی و ـەست نەپاراستنەوە، دڕندترین قۆناغی ئەنفال بووە، ئاماژەکان ئەوە دەردەخەن هێزەکانی حکوومەتی عێراقی لەم ئۆپەراسیۆنەدا فەرمانی کوشتنیان پێ بووە، ـ کوشتن بە فیشەک، یاخود کیمیاباران کردن، باس ـەوە دەکرێت، کە هەندێک گوند پیاویان نەماوە، چونکە چەندین کۆمەڵکوژی لەم ئۆپەراسیۆنەدا ئەنجام درا.

ـە گوندی کورێمیی دەڤەری مانگێش، ڕۆژی یەک شەممە ڕێککەوتی ٢٨-٨-١٩٨٨، دوای ئەوەی خەڵکی ئاوایی خۆیان بە دەستەوە دەدەن، سەربازەکان سی وسێ پیاو و کوڕی هەرزەکار، کە تەمەنیان لەنێوان ١٣بۆ ٤٣ ساڵ دابوو، لە گروپەکەیان جیا دەکەنەوە، دواتر لە دەرەوەی لێپرسینەوەو دادگاییکردن، بە کۆمەڵ گوللەبارانیان دەکەن، بەڵام شەش-یان بە بریینداری ڕزگاریان دەبێت. بە ناوەکانی: ئەبابکر عەلی سەعید، عەبدولقەهار خەلیل، عەبدولکەریم نایف حەسەن، هاشم محەمەد ڕەشید، صدقی عەبدولقادر فەتاح، یەکێکیان بەناوی فەتاح عەبدولقادر فەتاح جارێکی

**پرۆسەی ئەنفالی هەشت، تاکە ئۆپەراسیۆنی ئەنفالە لە دوای ڕاوەستانی شەڕی ئێران-عێراق لە ڕێککەوتی ٨-٨-١٩٨٨ بەڕێوە چوو**

دیکە بێسەروشوێن دەبێتەوە، چواریشیان تا ئێستە لە ژیاندا ماون.

لە ناوچەی دۆسکی لە گوندی کورفێل-یش بە هەمان شێوە ئەفسەرێک سی و پێنج کەسی لە ژن و منداڵ و پیاو گوللەباران کردووە، لێ ڕزگاربویەک نییە چیرۆکەکەیان بگێڕێتەوە. ٩٣ پیاوی گوێزێی ئامێدی، ٨٣ پیاوی وەرخەل و ٤٨ پیاوی گوندی هەمزا.... تاد گوللەباران کران.

لە ئێوارەی ڕێککەوتی ٢٩-٨-١٩٨٨یش بە هەزاران کەسی ناوچەکانی زێبار و بەری گارە لەسەر (ڕووی شین) لە هەموو لایەکەوە گەمارۆ دران و دواتر دەستگیر کران، تەنیا لە ٣٦ گوندی ناوچەکە، ٦٣٤ پیاویان لە دەست داوە.

تاوانەکان تەنیا لە ماوەی ١٣ ڕۆژەی ئەنفالی هەشتدا قەتیس نەما، لە مانگی پێنجی ساڵی ١٩٨٩ش، لەودیو سنووره نێودەوڵەتییەکانەوە، ڕژێم بە هاوکاری نۆکەرانی ٣٠٣٤ لە



دیمەنێک لە دادگاییکردنی سەددام و هاوەڵەکانی

ئاوارەبووان لە ئۆردوگایەکی تورکیا لە شاری ماردین-ی باکووری کوردستان لە ڕێگەی نانی ژەهراوییەوە ژەهر خواردی کردوون.

ڕژێم هەر بە ئەنفال کردنی کورد لەم دەڤەرە نەوەستا، بەڵکوو هێرشەکە گوندنشینە کریستانەکانیشی گرتەوە، دوای بۆردمان کردن و سووتاندن و وێران کردنی گوندەکانیان، جگە لەو دانیشتوانەی خۆیان ڕزگارکرد، ئەگەرنا ئەوانی دی هەر هەموویان دەستگیرکران و ڕەوانەی بەندیخانەی سەلامیەی مووسڵ کران، کە زۆربەیان خەڵکی گوندەکانی مێزێ لە سەرسەنگ و گوندە کۆسە و دۆسکی و کانی بەلاڤ لە بەرواری باڵا و گوندی باش و قارولە لە نێروا و دەرەکش لە ئامێدی...... هتد بوون، لەوانە ١٥٢یان تا ئێستەش بێسەروشوێنن.

لە هاووڵاتییە ئێزیدییەکانیش ١٨٣ کەس چارەنووسیان تا ئێستە نادیارە.

ڕزگاربووەکانی ئەم قۆناغەی ئەنفال لە ئۆردوگاکانی

**ئەنفالی هەشت، لە ڕووی تاوانی کۆمەڵکوژی مەیدانی و دەست نەپاراستنەوە، درندترین قۆناغی ئەنفال بووە**

بەرحوشتر و جێژنیکانی نزیک هەولێر لە خراپترین بارودۆخدا وەک دیلی جەنگ جێگیر کران.

کۆی گشتیی نزیک پێنج هەزار کەس لەم ئۆپەراسیۆنەدا تیا چوون، کە زۆرینەیان ڕاستەخۆ لە سەر زەوی ئۆپەراسیۆنەکە گوللەباران کران.

### دادگاییکردنی تاوانبارانی ئەنفال

هێما بیرکارییەکان بۆ ژماردنی تاوانەکانی ئەنفال کڵۆڵە، تاوانەکان هێندە زەق و گەورە و زۆرن، یاساکانیش لە ئاستیدا زەبوونن بۆ پێناسی یاساییان، بۆ باڵای تاوانەکان، لە ئاست حەقیقەتی تاوانەکە، بەڵگەنامە و فیلم و دیدنامەکان لاوازن.

کۆمەڵکوژیی، کوشتنی بە ئەنقەست لە گۆڕەپانەکانی دەرەوەی دادگا، دوورخستنەوەی بە زۆری دانیشتوان، زیندانی کردن و کوشتنی تەواوی ئەو خەڵکە سڤیلە، پاش گرتنیان و گواستنەوەیان بۆ ناوەندی کۆکردنەوەی تۆپزاوە و شوێنەکان دی، دواتر کوشتنیان و خستنە نێو گۆڕە بە کۆمەڵەکان، هەندێکیشیان بێ گواستنەوەیان بۆ شوێنەکانی کۆکردنەوە تەنانەت لە گوندەکانیان بە کۆمەڵ کوژران.

تەرمی بەشێکیان لە مووسڵ و سەماوە دۆزرانەوە و لە لایەن پسپۆری نێودەوڵەتی مایکل تربیل و ئەوانی دییەوە دەرهێنرانەوە، زۆرینەیان، تا ئێستەش گۆڕەکانیان نەدۆزراونەتەوە. بێبەریکردن لە پێداویستییەکانی ژیان، ئەشکەنجەدان، دەستدرێژیی سێکسیی و پەلاماردان و لاقەکردن، سزادانی گرووپ بە هۆی جیاوازیی نەتەوەییەوە، پەلاماردانی ناوچەکانی سڤیل بە چەکی کۆکوژی کیمیاویی و هێشۆیی و چەکی کلاسیک، پەلاماردانی گوندەکان و بێ هۆکار ڕووخاندنی نەخۆشخانە، قوتابخانە و مزگەوت، بەزۆر گواستنەوە و سەپاندنی نیشتەجێبوونی زۆرە ملێ لە ئۆردوگاکان و بێبەری کردن لە هەلی کار و پێداویستی ژیان، توندوتیژ جووڵانەوە لەگەڵ هاووڵاتیانی سڤیل، تا ئاستی کوشتنیان بە ئەنقەست و بە کۆمەڵ، بێ ڕێزیکردن بە تەرمی مردووەکانیان، مردن بەهۆی برسێتی و تێنوێتی و گەرما و بێ دەرمانیی و پیسییەوە، نەبوونی بێ بایەخترین کەرەستەی ژیان لەنێو بەندیخانەکاندا، هێرش بۆ سەر هاووڵاتیانی سڤیل، کە هیچ بەشدارییەکییان لە چالاکی سەربازیی نەبووە، وێرانکردنیماڵەکانیان و تاڵانکردنیان، جیاکردنەوەی ژنان و پیاوان و ڕێگە گرتن لە بەیەک گەیشتنیان، بۆ ئەوەی منداڵیان نەبێت، جیاکردنەوەی منداڵی بچووک لە دایک و باوک و برا و کەسوکاریان، توندوتیژیی بە نەخشە، زیانی جەستەیی و عەقڵیی، وێرای مردنی زۆرێک لە ئەنفال کراوان، کە لە بەندیخانەکاندا تووشی کەم ئەندامی بوون، بێ هۆکار پەلاماردانی خەڵکی سڤیل، کوشتنی بە دەستی ئەنقەست، کوشتنی نابەجێ، بێبەش کردنی توند لە هەموو پێداویستییەکی تەندروستیی و ژیان.

جیاکردنەوەی خێزان لە یەکدی، تەنانەت منداڵان لە گەورەکان. دەستگرتن بەسەر سەروەت و سامان، لەنێویاندا بەروبوومی کشتوکاڵی هەڵگیراو.

نەهێشتنی سەروەت و سامانی ئاژەڵداریی، کوێرکردنەوەی کانیاو و پڕکردنەوەی بیرەکان، پەیڕەوکردنی سیاسەتی زەوی سووتاندن، بۆردومان کردنی گوندەکان.

کەمی خۆراک و برسی کردن، نەبوونی دەرمان و

ــــرى پزیشکیی، سەپاندنی ژیان لە گەرمای ـیـ. نەبوونی شوێنی خەوتن، بە پێوە وەستاندنی یەک ـ ـی یەکی زیندانییەکان و برسیکردنیان بۆ ماوەی ـ ـ ڕۆژ، تەعریب کردن، هتد. ئەمانە هەمووی چەند ـ ـیەکی کەمن لە تاوانەکان، تا شوێن پێی هەموو ـ ـییەکان هەڵنەگرێت ناتوانرێت هەمووی بزانرێت، ـ بەڵگەنامە و فیلم و دیدنامەو نووسراوەکان ـ دەربڕی گەورەیی تاوانەکە بن، کاتێک ئامادەی ـنەوەی گۆڕە بە کۆمەڵەکان دەبێت، جا دەزانیت چ ـ ـێک ئەنجام دراوە، دەزانیت چ جەهەنەمێک لە ژێر ـنەکان شاردراوەتەوە.

## دادگای باڵای تاوانەکان

ـ ـگای باڵای تاوانەکان، پاش ڕێکارەکان بۆ دامەزراندنی، ـ ـوەرانی دادگاکان و نۆ ئەندامی لیژنەی پێداچوونەوە ـلایەن دەوڵەتی عێراق-ەوە دانران، دەوڵەت ڕێگەی دا ـوود لە دادوەرە نا عێراقییەکان وەربگیرێت.

ـشوێنی پێویست لە پێناو دامەزراندنی لیژنەیەکی ـمیشەیی ٢٠ کەسی لە ژێر ناوی دادوەری لێکۆڵینەوە ـگیرایە بەر، کە ئەرکیان ناردن و ئاگادارکردنەوەی ـتۆمەتباران بوو، بڕیاری دەستگیرکردن، ئامادەکردنی ـکاڵانامە و کۆکردنەوەی هەڵسەنگاندنی بەڵگەنامەکانیان ـ ئەستۆ بوو.

ـپەیڕەو و پرۆگرامی دادگای باڵای عێراق، کۆمەڵێک چەمکی ـ پرەنسیپی خۆڕاوا وەرگرتووە وەک «ڕێوشوێنی ـسایی، نەریتی بەدوادا چوون، شێوازەکانی بەرگریی، ـمۆدێلەکانی وەرگرتنی دۆکۆمێنت، پەسەندکردنی ـبەڵگەنامەکان».

ـبڕیار درا، بەپێی یاسا بەرکارەکانی عێراق ڕێوشوێنی ـفەرمی و دادپەروەریی لە هەمبەر تۆمەتباران بگیرێتە ـبەر. دادگا ڕایگەیاند ئەو لایەنەی فەرمانی تاوان ـکردەکات بە تاوانباری سەرەکی دەژمێردرێت، ئەو ـکەسەش بەرپرسیارێتی زیاترە. کە فەرمانەکە پیادە ـدەکات.

ـدادوەرەکانی دادگایی ئەنفال، پشتیان بە کۆمەڵێک بەڵگەی زۆر بەست، وەک شایەدی دانی سکاڵاکەر و شایەد حاڵەکان و بەڵگەی بەردەست، وەک بەڵگەی ناو گۆڕە بە کۆمەڵەکان.

بە گوتەی شایەتحاڵەکان، شایەت و دۆکومێنتەکان دەری دەخەن، کە کۆمەڵکوژیی کورد بە شێواز و مۆدێلێکی پیلان گێڕانە نەخشەی بۆ داڕێژراوە، تا ئەو کۆمەڵکوژییە نهێنیانە و کاریگەر بن، بۆیە هەموو دۆکۆمێنت و بەڵگەنامە و ئامارەکان لە ئاست قەبارەی تاوانەکەدا نەبوون، دادگایی کردنەکە قورس بوو، چونکە پرۆسەی دادگایی دۆسیەی سەنگینی جینۆساید بوو.

ئەوانەی ئامادە کران و خرانە ڕوو، بەهۆی نەبوونی هوشیاریی دادپەروەریشەوە، نە هەموو قوربانیان داوای مافی خۆیان کرد، نە هەموو تاوانبارانیش سزا و دادگایی کران، یان خرانە لیستی تۆمەتبارانەوە.

## دەستپێکی دادگا

دادگای دۆسیەی ئەنفال لە دادگای باڵای تاوانەکان لە ڕۆژی دووشەممە ڕێککەوتی ٢١-٨-٢٠٠٦ دەستی پێکرد، لە شەست ویەک دانیشتندا، ١١٩٣ سکاڵاکار و دیدەر و پسپۆڕی ناوخۆیی و بیانی، سکاڵا هەبوو، شایەدییان دا، لەوانە پەنجاودوو سکاڵاکار، دە ڕزگاربووی گۆڕی بە کۆمەڵ، هەشت دیدەر، چوار پسپۆڕی بیانی «کلایکۆلون سنۆ ١٩٢٨ ئۆکلاهۆما ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا......زانای بواری زانستی بایۆلۆژی، پسپۆر لەسەر ئاستی جیهان، گۆڕی بە کۆمەڵی کرۆمی هەڵدابووەوە و کاری لەسەر قوربانیانی کیمیاباران کردنی گوندی فرجینی کردبوو، کە چەکی کیمیاوی تێدا بەکار هاتبوو. ئەسفەندیار ئەحمەد شوکری توێژینەوەی لەسەر ئەو ئاوارانەی دیاربەکر و ماردین


لەکاتی جێبەجێکردنی لەسێدارەدانی سەددام حوسێن لە بەرەبەیانی ڕۆژی ٢٠٠٦/١٢/٣٠

کردبوو، که به کیمیاویی لێیان درابوو. مایکل کۆمفر ترەمبیل پسپۆڕ لە بواری پزیشکی ڕێوشوێنی دیاردە سزاییەکان، لە مووسڵ و موسەنا، کە گۆڕی بە کۆمەڵی ئەنفال کراوانی هەڵداوەتەوە، بە هاوکاری پسپۆڕانی ئەمەریکی و کۆستاریکی و ئوسترالی و کەنەدی. دۆگلاس سکوتی- ئەمەریکی پسپۆڕ لە بواری چەک و زانستی سزایی».

ئەم بەڕێزانە ڕاستەوخۆ بەشدارییان لە دادگاییەکە کرد و لە بەردەم دادوەرەکان وتەیان پێشکەش کرد.

یەکشەممە ڕێککەوتی ٢٤-٦-٢٠٠٧ بڕیاری دادگا دەرچوو، لە ڕێککەوتی ٤-٩-٢٠٠٧ بڕیاری پێداچوونەوەی کۆتا درا، تاوانکاران بە ئەنجامدانی تاوانی جینۆساید و تاوانی جەنگ و تاوانی دژ بە مرۆڤایەتی سزا دران.

ژمارەیەکی کەمی تاوانباران و دکتاتۆرەکان لە مێژوودا بە جینۆساید تاوانبار کراون، بۆیە بڕیارەکەی دادگا گەورە بوو.

**ڕژێم هەر بە ئەنفال کردنی کورد نەوەستا، بەڵکوو هێرشەکە گوندنشینە کریستانەکانیشی گرتەوە**

### ئەوانەی دادگایی کران کێ بوون؟

ئەو حەوت کەسەی دادگایی کران، ئەوانە بوون، کە پێشتر زیندانیی بوون: سەددام حوسێن ئەلمەجید ئەلحەسەن عەبدالغەفوور عەبدولقادر ئەلناسری ئەلتکریتی سەرۆک کۆماری عێراق، کە ڕۆژی شەممە ڕێککەوتی ٣٠-١٢-٢٠٠٦ لەسەر تاوانی دوجەیل لە سێدارە درا، بۆیە تۆمەتی ئەنفالی لەسەر هەڵگیرا.

لاری کۆکسی سەرۆکی لقی ئەمەریکای ڕێکخراوی لێبوردنی نێودەوڵەتی ڕایگەیاند: لە سێدارەدانی بە پەلەی سەددام حوسێن، نا دروست بووە، مانای ئەوە دەگەیەنێت، کە کەمتەرخەمی لە دادپەروەریی مەسەلەی ئەو قوربانییە زۆر و زەوەندانەدا کرا، کە مەینەتییەکی بێ وێنەیان لە سەردەمی ڕژێمەکەی سەددام-دا بینی. ئێستەش مافی ئەوان بۆ بینینەوەی دادپەروەریی، پێشێل کرا. دەرفەتی سەپاندنی حوکمڕانی یاسا لە عێراقدا بە ئاسانی لە دەست چوو.

عەلی حەسەن ئەل مەجید ئەلحەسەن عەبدالغەفور عەبدولقادر ئەلناسری ئەلتکریتی بەرپرسی بیرۆی باکووری پارتی بەعس. لیوا ڕوکن سابیر عەبدولعەزیز حوسێن عەلی دوری بەڕێوەبەری هەواڵگری گشتیی سەربازیی. فەریق ڕوکن حوسێن ڕەشید محەمەد عەرەب ئەلتکریتی یاریدەدەری ئەرکانی سوپا بۆ کاروبارەکانی ئۆپەراسیۆنەکان. لیوا ڕوکن سوڵتان هاشم ئەحمەد محەمەد حەمەد ئەلحەمەد ئەلتائی فەرماندەی فەیلەقی یەکەم. تاهیر تۆفیق ئەلحاج یوسف ئەلعانی سکرتێری لیژنەی کاروباری باکوور و پارێزگاری مووسڵ. عەقیدی ڕوکن فەرحان موتڵەگ ساڵح خەڵەف ئەلجبوری بەڕێوەبەری ڕێکخراوی هەواڵگری خۆرهەڵات.

تۆمەتباران پاش ساغبونەوەی تاوان لەسەریان بەم شێوەیەی خوارەوە سزا دران:

عەلی حەسەن ئەلمەجید بە پێنج سزای لە سێدارەدان، یەک زیندانی بەند بوون تا پاشماوەی ژیانی، یەک سزای پازدە ساڵ زیندانیی، دوو سزای زیندانی دە ساڵیی و دوو سزای زیندانیی حەوت ساڵیی.

لیوا ڕوکن سوڵتان هاشم چوار سزای لەسێدارەدان، دوو سزای زیندانی بەند بوون تا پاشماوەی ژیانی، یەک سزای زیندانی پازدە ساڵی، یەک سزای زیندانی دە ساڵی و دوو سزای زیندانی حەوت ساڵیی.

فەریق ڕوکن حوسێن ڕەشید چوار سزای لە سێدارە دان و سزایەکی حەوت ساڵ زیندانیی.

سابیر عەبدولعەزیز حوسێن سێ سزای زیندانی بەند بوون، تا پاشماوەی ژیانی و سزایەکی زیندانی دە ساڵیی.

عەقیدی ڕوکن فەرحان موتڵەگ دوو سزای زیندانی بەند بوون، تا پاشماوەی ژیانی و سزایەکی زیندانی دە ساڵیی.

تۆمەتبار تاهیر تۆفیق ئەلحاج یوسف ئەلعانی بڕیاری بێ تاوانی لە تۆمەتی بەشداری لە تاوانی ئەنفالی بۆ دەرچوو.

ناوبراوان بە ئەنجامدانی تاوانی جینۆساید و تاوانی جەنگ و تاوانی دژ بە مرۆڤایەتی لە پرۆسەی تاوانی ئەنفال تاوانبار کران.

تاوانباران عەقیدی ڕوکن فەرحان موتڵەگ لە

ـڕێککەوتی ٣٠-٣-٢٠١٣ لە گرتوخانەی مووسڵ و سوڵتان هاشم-یش لە نەخۆشخانەیەکی شاری ناسریە لە ڕێککەوتی ١٩-٧-٢٠٢٠ مردن، بۆیە بڕیارەکانی دادگای ـڵای تاوانەکانیان لەسەر جێبەجێ نەکرا.

## کێی دیکە داواکرا؟

ـە پرۆسەی دادگاییەکە حەوت تۆمەتبار دادگایی کران، ٤ تۆمەتباری دیکەش لە هەنگاوی یەکەمدا دیاری کرابوون بۆ دادگایی کردن، لێ ئامادە نەبوون وەک ـە نوو نامەی دادگای باڵای تاوانەکاندا ناویان هاتووە بەپێی نووسراوی ف٢  ١٤٤٥ ڕێککەوتی ١٨-١٢-٢٠٠٠ی دادگای باڵای تاوانەکان، بڕیاری گرتن بۆ ٢٤ کەس دەرچوو، کە بریتی بوون لە «نزار خەزرەجی، یونس ئەلدرب، ئەیاد خەلیل زەکی ٨٩» لیوا الرکن (ایاد خلیل زکی) قائد ق ق جح /د و /»، ڕەمزی مەحموود» ٩٢ لیوا الرکن (رمزی محمود عبدالله) قائد فق مش /٣٣/» سەعید مەحمود باریکە، قاسم درەیی « ٢١٦ قاسم رشید درەیی» معتەسەم بەرزنجی، یاسین ڕەئوف، تەحسین شاوەیس، قاسم ئاغای کۆیە، بایز عەبدولڕەحمان، عەلی ئەحمەد ڕەشید، نیعمە فارس «٨٦- الفریق الرکن (نعمە فارس حسین) معاون رئیس ارکان الجیش للتدریب» حەمید شەعبان، نەجم عەبدوڵڵا دوری، عیسمەت سابیر» ٩٤- لیوا الرکن (عصمت صابر عمر) قائد فق /٤» عەدنان جەباری «١٧٩-سعید عدنان جباری» جیهان موسا، ڕەفعەت گلی شمال رفعت گلی امر سریە، عوسمان شێخ سەعید، شێرزاد ساڵح، تۆفیق جەبار قارەمان «١٥٩-توفیق جبار قارمان» حوسێن شێخ سەعید، حەسیب حەمە ئینجە»

«لە ڕێککەوتی ٢١-١٢-٢٠٠٥، بەپێی نوسراوی دادگای باڵای تاوانەکان ژمارە ف٢  ١٤٧٤، داوای ناوی سیانی و ناوونیشانی ١٨ تاوانبار دەکات، کە بریتین لە «سەعید مەحموود باریکە، عەدنان جەباری، شێخ ڕەئوف، شێخ جەعفەر» ١٦٤-جعفر عبدالکریم البرزنجی محافظ السلیمانیە» شێخ ڕەمەزان، قاسم درەیی، جیهان موسا، معتەسەم بەرزنجی، ڕەفعەت گلی، یاسین ڕەئوف، غەسان شێخ سەعید، تەحسین شاوەیس» ٤٠٩-تحسین شاویس سعید» شێرزاد ساڵح، قاسم ئاغای کۆیە» ١١٥-المستشار (قاسم فارس تاهر مصتفی اغا) ف د و /» تۆفیق جەبار قارەمان، بایز عەبدولڕەحمان، حوسێن شێخ سەعید، عەلی ئەحمەد ڕەشید، حوسێن حەمە ئینجە».

یەکێک لە بەرچاوترین فەرماندەکانی پرۆسەی ئەنفال نزار خەزرەجی بوو، کە بە وتەی خۆی ڕاستەوخۆ فەرماندەیی ئەنفالەکانی ١ ، ٢، ٤ ، ٨ی کردووە ناوی هەر لە لیستەکەدا نییە، بیست و پێنج کەس لە کۆی چل و دوو کەسە داواکراوەکە ناویان لە لیستی تۆمەتباراندا نییە، کە بیست و یەک-یان کوردن و ڕاستەوخۆش کەسوکاری قوربانیان لە مانە و زۆری دیکە سکاڵایان تۆمارکردووە، کاتی خۆی پێش دادگای باڵای تاوانەکان لیستەکەیانم بڵاوکردەوە.

## داواکراوانی دیکەی کەیسی ئەنفال

لە ڕێککەوتی ٢٠-٥-٢٠٠٧ دادگای باڵای تاوانەکان بە فەرمی لیستێکی ٤٢٣ ناوی ڕاگەیاند، وەک تۆمەتبارانی تاوانی جینۆسایدی ئەنفال، کردنەوەی دۆزی سەربەخۆی بۆیان ڕاگەیاند، بەڵام لە بەغدا و هەولێر کاری پێ نەکرا.

ئەو ژمارەیە ٢٥٨ کەسیان هاووڵاتی هەرێمی کوردستانن،

***جەژنانەی ڕژێم بۆ هاووڵاتییەکانی ئەم ناوچەیە، ئەوە بوو، لەجەژنی ڕەمەزاندا دوو فڕۆکە کیمیابارانی گوندی وەرتێیان کرد***

ج بە لیست، ج  بە تاکە کەسی بڕیاری گرتنیان بۆ دەرچووە، لە ڕێککەوتی ١١-٨-٢٠١١ بە کتابی ژمارە ڕس/١٠/ ٨٣  نێردراوە بۆ وەزارەتی شەهیدان، بەڵام تاکو هەنووکە هیچ یەکێک لەو تۆمەتبارانە، بۆ لێکۆڵینەوە بانگ نەکراون.

دووجار ڕێکخراوی کوردستان بۆ جینۆساید، لە ڕێگەی داواکاری گشتییەوە لە شاری هەولێر سکاڵای لەسەریان تۆمارکردووە، وەلی لە ژێر فشاری کەسانی دەست ڕۆیشتووی دەسەڵاتدارەوە داوکاری گشتیی بێ ئیرادە کراوە و لە سکاڵاکەی نەپرسیوەتەوە.

## لێبوردنە گشتییەکەی بەرەی کوردستانی چی بوو؟

لە کۆی ٤٢٣ کەسی تۆمەتباری داواکراوی دیکەی ئەنفال، جگە لەو حەوت کەسەی ئاماژەمان پێیان دا، ٢٥٨یان جاش و هاووڵاتی هەرێمی کوردستانن، کە دەکاتە ٦٠،٩٩٪ی

کۆی تۆمەتباران، هەرچەندە لە بەشەکەی دیکەشدا کورد هەن. بەهانە بۆ لێپرسینەوە لە تۆمەتباران، لێبوردنە گشتییەکەی بەرەی کوردستانی ساڵی ١٩٩١ بوو، هەرچەندە کەسی وایان تێدایە لێبوردنەکەی بەرەی کوردستانی نایگرێتەوە، چونکە تا ڕووخانی بەعس لە بەغدا بووە، وەلێ لێبوردنەکەی بەرەی کوردستانی ساڵی ١٩٩١ بەپێی بڕگەی شەشی یاسای دادگای باڵای تاوانەکانی عێراقی هیچ شەرعیەتێکی نییە، هەر لێبووردنێک پێش جێبەجێکردنی ئەم یاسایە دەرچوبێت بۆ تۆمەتبارانی دوو توێی تاوانەکانی بڕگەکانی ١١ و ١٢ و ١٣ و ١٤ دادگای باڵای تاوانەکان، کە بریتین لە تاوانەکانی جینۆساید و تاوانی دژ بە مرۆڤایەتی و تاوانی جەنگ و تاوانی پێشێلکردنی قانوونی عێراقی، بەپێی بڕیارەکانی دادگای باڵای تاوانەکانی عێراقی لەسەر تاوانباران عەلی حەسەن مەجید و سوڵتان هاشم و .... تاوانی ئەنفال تاوانی جینۆساید و تاوانی دژ بە جەنگ و تاوانی دژ بە مرۆڤایەتییە، ئەم تاوانانەش بە تێپەڕبوونی کات بەسەر ناچن و بنەمای نێودەوڵەتییان هەیە «زەمان و مەکان» تۆمەت لەسەر تۆمەتبار هەڵناگرن، تاوانی نێونەتەوەیشن، لەسەر ئەو بنەمایە دادگای تاوانی نێودەوڵەتی دامەزراوە، ئەم جۆرە تاوانانە لە تایبەتمەندیەتی، تۆمەتبار بۆ کوێ هەڵبێت دەربازی نابێت لە سزا، کەس ناتوانێت لێبووردنیان بۆ دەربکات، تەنانەت ناکرێت مافی پەنابەریشی پێ بدرێت، هەرچەندە ئەمە لە لایەن لانی کەم شەش وڵاتی ئەوروپاوە پێشێل کراوە، تۆمەتباری ئەنفال مافی پەنابەری سیاسیان پێ نادرێت، بەپێی ڕێککەوتننامەی قەدەغەکردنی جینۆسایدی ساڵی ١٩٤٨، چونکە بەشدارن لە تاوانی جینۆساید، سزا دەسەپێنرێت بەسەر هەموو کەسێکی بەشدار لە پرۆسەی پاکتاوی بە کۆمەڵ، نابێت ڕزگاریان بێت لێی، بەو پێیەی ئەمانیش کەسانێکن بەشداربوونە لە ئەنجامدانی تاوانەکە، بۆیە وەک بەشداربوویەک لە پرۆسەی کۆکوژی دەبێت دادگایی بکرێن و دەربازیان نەبێت.

بۆیە ئەوانەی ناویان هاتووە لێبوردن نایان گرێتەوە، بەم هۆیەشەوە ئەو بڕیارەی بەرەی کوردستانی هیچ بنەمایەکی یاسایی و هێزێکی نییە، بەداخەوە جگە لە دەسەڵاتدارانی کوردستان لە عێراقیش بڕیارەکە جێبەجێ نەکراوە، هاتووانی ناو لیستەکە لە بەغدا پۆستی سەربازی و تەشریعیان وەرگرتووە و چوونەتە پەرلەمانەوە و فەرماندەیی گرنگیان لە سوپا وەرگرتووە، یاسای بنەبڕکردنی پارتی بەعس ئەمانی لێ دەرکراوە و بڕیارەکانی نەیانی گرتۆتەوە.

---

سەرچاوەکان:

١- انفال جريمه منسيه» نجم الدين فقی عبدالله، چحايا الانفال ١٩٨٨ من المسيحيين والايزيديين محامی طارق جامباز و ئینسکلۆپیدیای تاوانبارانی شالاوی ئەنفال لە باشوری کوردستان دەرسیم دیبەگەیی.
٢- ئاکامە جوگرافییەکانی پرۆسەی جینۆسایدی گەلی کورد ئەنفالی چوار وەک نموونە پ ی د. یاسین هاشم حەمەدەمین.
٣- دادگایی ئەنفال زوهەیر کازم عەبود
٤- ئەنفالی هەشت عدالەت عومەر، سەنتەری برایەتی ژمارە ٢٤.
٥- ئەنفال و ڕەهەندە سۆسۆلیجییەکانی محەمەد ڕەئوف عەبدالعەزیز.
٦- ئەنفال و ئەنفالی گەرمیان یادگار عەلی.
٧- جینۆساید لە عێراق پەلاماری ئەنفال بۆ سەر کورد ئامادەکردنی میدل ئیست ۆچ وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە محەمەد حەمە ساڵح توفیق چاپخانەی تیشک ٢٠٠٤.
٨- القسوه لدى صدام حسين د. محمد مجيد، اللائحه الايضاحيه المقدمه من قبل هيئه الدفاع عن ضحايا جريمه الانفال الى محكمه الجنايات العراقيه العليا، ڕۆنامەی ئاسۆ ژمارە ٤٢٥ ڕێکەوتی ٧-٥-٢٠٠٩، محكمه الانفال ڕێکار مزوری.
https://en.wikipedia.org/wiki/Anfal_genocide#cite_note-Frontline. The Lasting Legacy of Chemical Weapons in Iraqi Kurdistan.
١٠- نێرگز لە دۆزەخی ئەنفالدا-عارف قوربانی ٢٠٢٠، سوڵتان هاشم
١١- کورتە وەلامێک بۆ دەست و پەنجە خوێناویەک بە خوێنی کورد
١٢- لەتیف فاتیح فەرەج، کاریگەرێتیە دەروونییەکانی ئەنفال لەسەر جێماوانی
١٣- بەهادین محەمەد عەبدوالرڕەحمان-چاپی یەکەم ٢٠١٨، تاقانەکانی جینۆساید لە کوردستان
١٤- چاپی یەکەم ٢٠١٦، چاپخانەی ڕۆکسانا، جینۆسایدو تاوانەکانی ڕژێمی عێراق دژ بە گەلی کوردستان، لە بلاوکراوەکانی یەکێتی پەرلەمانتارانی کوردستان ژمارە ١٣-ساڵی چاپ ٢٠١١و چاپخانەی شهاب- هەولێر
١٥- جینۆسایدکردنی نەتەوەیەک بە چەکی کۆمەلکوژی ژەهراوی ل ٢٨٢-٣٠٥ د. فوئاد ئەحمەد بابان، تارماییەکانی هەڵەبجە سەدام حوسێن و جینۆسایدی کورد پرۆفیسۆر د. مایکل. جەی. کیلی وەرگێڕانی کارزان محەمەد ٢٠١٥ چاپخانەی پیرەمێرد-
https://en.wikipedia.org/wiki/Anfal_campaign

# ڕووناکبیرانی کورد
# لە سەدەی نۆزدەدا

تا ئێستە لاپەڕەکانی مێژووی کورد لە سەدەی نۆزدە، بە تەواوی هەڵنەدراونەتەوە، بەتایبەتی لە بوارەکانی ئابووریی، جڤاکی، پەروەردەیی و ڕووناکبیریی دا. لەم باسەماندا لامان لە بابەتێکی گرنگی کۆتاییەکانی سەردەمی میرنشینە کوردییەکانی نێو چوارچێوەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیی کردووەتەوە.

وەک دەردەکەوێت، لە ناوچە جیاجیاکانی کوردستان کۆمەڵێک ڕووناکبیری گەورە لەو سەدەیە سەریان هەڵداوە و دەرکەوتوون، کە ڕۆڵێکی گەورەیان هەبووە لە بنچینەی نوێکردنەوەی زمان، ئەدەب، فەرهەنگ، مێژوو، سیاسەت و ئایین. (وەک دەرکەوتنی ڕەوتی سۆفیگەری نوێ، بەتایبەتی تەریقەتی نەقشبەندی خالیدی موجەددیدی لەسەر دەستی مەولانا خالیدی نەقشبەندی ١٧٧٩-١٨٢٦)

لە هەمان کاتدا ڕووبەڕووی دەسەڵاتی ئەو میرنشینە کوردییانە بوونەتەوە، بەشێوەیەک زۆر جار پەنایان بردووەتە بەر ئامرازی توند، لە بەکارهێنانی زمان و ئاخاوتنی دەسەڵاتداران، تا ئاستی دوورخستنەوە و ناچارکردن و سەرهەڵگرتنیان بۆ تاراوگە.

مەبەستی ئێمە لە تاراوگەی سەدەی نۆزدەهەم، بە پلەی یەکەم شاری ئیستانبوڵ و ئینجا شارەکانی دیکەی وەک: بەغدا، دیمەشق، قاهیرە، مەککە و مەدینە (خاکی حیجاز)ە، لەبەرئەوەی ئیستانبوڵ پایتەختی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیی و ڕووگەی گەلانی عوسمانیی بووە، بۆئەوەی لەلایەن دەسەڵاتدارانییەوە ئاوڕیان لێ بدرێتەوە، شارەکانی دیکەی وەک: بەغداد، دیمەشق و قاهیرە، وەک تاراوگەی دووەم هەژماردەکرێن. ئەو سێ شارەی ئاماژەمان پێ کردن لەڕووی ئازادی ڕا دەربڕین، نووسین، بڵاوکردنەوەی بیر و هزری ڕووناکبیرانی کورد، بە بەراورد لەگەڵ ئیستانبوڵ، ئازادییەکی زیاتریان تێدا هەبووە، چونکە هەر لە کۆنەوە کورد بە شارەکانی بەغدا، قاهیرە و دیمەشق ئاشنا بووە، وەک ناوەندی دەسەڵاتی خیلافەتی عەبباسیی بەغدا و ناوەندی دەسەڵاتی دەوڵەتی ئەیوبیی قاهیرە و دیمەشق.

کورد بۆ ماوەیەک لەم شارانەدا دەسەڵاتداربوونە، چ لەڕووی سیاسیی، ئایینی، کاری بازرگانیی و مامەڵەی دارایییەوە بێت، تا ئێستەیش گەڕەکی کوردنشین لەم سێ پایتەختەدا ماون و ژیانیان تێدا بەردەوامە.

دانیشتووان و دەسەڵاتی ئەم سێ شارە گەورەی خۆرهەڵات بە ڕەگەزی کورد و جڤاکەکەی نامۆ نەبوون، بەڵکو تێکەڵ بوونێکی زۆر ئاشتیانەی کۆمەڵایەتی لەنێوان ئەوانی عەرەب و کوردی بەغدا و قاهیرە و دیمەشق هەبووە.

شاری بەغدا لەچاو هەمو شارەکانی دیکەی وەک: قاهیرە و دیمەشق لە کوردستان نزیکتر بوونە، بەڵام لە ئیستانبوڵ نامۆییەکی تەواو بەرانبەر بەکورد هەبووە، لەبەر ئەوەی ئیستانبوڵ بۆماوەی (٣٣٠-١٤٥٣زایینی) هەڵگری شوناسێکی ئەورووپی-مەسیحی ئەرتەدۆکسی پارێزگار بووە. لەماوەی (١٤٥٣-١٩٢٤) هەڵگری شوناسێکی ئەورووپی-عوسمانیی ئاسیای ناوەڕاست بووە، کە شوناسی عوسمانیش هەتا دوای کەوتنی ئیستانبوڵیش لەژێر کاریگەریی فەرهەنگ و ئەدەبی فارسیی، عەرەبیی و زیاتریش ئەورووپیدا


موحەممەد گەلالەیی

بووە. هەرچەندە ڕووناکبیرانی کورد بەبێ هیچ کەموکورتییەک زمانەکانی: کوردیی، عەرەبیی و فارسییان، جا تورکی-عوسمانیتان زانیوە.

دوای گەڕانەوەی دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیی، بەهێزی سەربازیی بۆ کوردستان، بەتایبەتی لەسەپاندنی دەسەڵاتی ناوەندێتیی (سەردەمی گەڕانەوەی دەسەڵاتی مەرکەزی عوسمانی ١٨٢٦-١٨٥٢) و ڕووخاندنی میرنشینەکانی کوردستان لەسەرەتای نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەمدا، زمانی تورکی-عوسمانیی لەنێو ڕووناکبیرانی کورد بەشێوەیەکی بەربڵاوتر ئاخاوتنی پێکرا و ئینجا پەڕیەوە بۆ نێو زمان و ئەدەب (نووسینی زانستیی و ئەدەبیی) ئەمەش بە دوو ڕێگە: یەکەم: بەگشتی سەپاندنی دەسەڵاتی مەرکەزیی عوسمانیی لە کوردستان و هێنانی کاربەدەست، کە زمانی کوردیی بە پلەی یەکەم و دواتر عەرەبیی و فارسییان نەدەزانی، ئەم سێ زمانە لە کوردستان زۆرترین کەسی خوێندەوار (ڕووناکبیران، زانایانی ئایینیی، کوڕی کاربەدەست و دەوڵەمەندەکان و میر و بەگەکان) دەیانزانی، بۆیە لەگەڕانەوەی دەسەڵاتی مەرکەزیی عوسمانیی بۆ کوردستان، هەر تەنیا گەڕانەوەی دەسەڵاتی سوپایی، کارگێریی، دادوەریی، سیاسیی و پەروەدەیی نەبوو، بەڵکو پەیڕەوکردنی سیاسەتێکی توندی سەپاندنی زمانی تورکی-عوسمانیی بوو، کە هەتا نووسراوەکانی گرێبەستی هاوسەرگیریش بەزمانی تورکیی دەنووسران، کە خەڵکی ڕەشۆکی ئەوکات نەیاندەزانی کوردیی بخوێننەوە، چ جای ئەوەی بزانن بە زمانی تورکی-عوسمانیی چی تێدا نووسراوە، بەتایبەتی لە دۆسیەی دادگا شەرعییەکان (السجلات محاکم الشرعیة) لە سەنجەقەکانی شارەزوور و سلێمانی لە ویلایەتی مووسڵ ڕەنگی داوەتەوە.

دووەم: لەدوای دەست پێکردنی سەردەمی تەنزیمات (١٨٣٩-١٨٧٦) واتە: چاکسازیی ریشەیی لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانیی، کە یەکێک لەو چاکسازیانە، کردنەوەی وەزارەتی مەعاریف (پەروەردە) بووە، دوای ئەمە دەستکرا بەکردنەوەی قوتابخانەکانی وەزارەتی مەعاریفی عوسمانیی لە ناوەندی ویلایەتەکان، سەنجەقەکان (پارێزگاکان) قەزاکان، لە ناحیەکانیش بەشێوەیەکی دەگمەن نەبێت ئەم قوتابخانانە نەکرانەوە، بۆیە زمانی تورکی-عوسمانیی، کە زمانی فەرمی ئیمپراتۆریەتەکە بووە، خوێندنیش بەم زمانە پەرەیەکی زۆری پێدرا بەتایبەتی لە چارەکی کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم، هەرچەندە زمانی تورکی-عوسمانیی، زمانێکی دروستکراو، یان پێکهێنراوە لە ٣٥ زمانی جیاجیا لە خۆرهەڵات و خۆراوای جیهان، بەڵام پشکی شێر لە فەرهەنگی زمانی تورکی-عوسمانیی بەر زمانەکانی: کوردیی، عەرەبیی، فارسیی و یۆنانی-لاتینی و زمانەکانی دی ئەورووپا دەکەوێت.

بۆیە ئەم قوتابخانانە ڕۆڵ و کاریگەرییەکی گەورەیان هەبوو، لە دروستکردنی نەوەیەک لە ڕووناکبیرانی کورد، کە زمانی تورکی-عوسمانیی بەباشی فێر بن و بکەونە ژێر کاریگەریی کلتوور و فەرهەنگی عوسمانییەوە، لەبەرئەنجامی ئەوەی، کە ئیمپراتۆریەتی عوسمانیی وەک پاڵپشتیکارێکی بەردەوام هاوکاری ئەم قوتابخانانەی دەکرد، سەرەڕای ئەوەی، کە دەرچووانی ئەم قوتابخانانە لە دامەزراوەکانی عوسمانیی، وەک فەرمانبەری دەوڵەت دادەمەزرێنران، بەڵام کاتێک دەسەڵاتی عوسمانیی لە کوردستان لاوازبوو، لەنێو ناوەندەکانی خوێندنی ئایینیشدا ئامادەیی نەبوو، بەتایبەتی لە سەردەمی میرنشینەکاندا، کەچی دوای ڕووخاندنی میرنشینەکان زمانی تورکی-عوسمانیی لەنێو ئەم دامەزراوە گرنگەشدا برەوی زیاتری پەیداکرد.

دوای نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم ڕۆیشتن، یان کۆچکردنی ڕووناکبیرانی کورد بۆ ئیستانبوڵ، بەهۆی نەزانینی زمانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیی تووشی نامۆیی نابنەوە، چونکە بەشێکی زۆریان زمانی تورکی عوسمانییان زۆر بەپاراوی دەزانی، چونکە بەشێک لەمانە پێش ئەوەی بچنە ئیستانبوڵ، پیشەی جیا جیان لە دامەزراوەکاندا هەبووە، یان لە خوێندنگە ئایینیەکاندا خوێندکاریان هەبووە و وانەیان گوتۆتەوە، بەتایبەتیش لە دانانی هۆنراوە و قەسیدە بە زمانی تورکی عوسمانیی دەستێکی

-لایان هەبووە.

ـەـدەکانی پێشووتریش (پێش هەژمووونی عوسمانییەکان بە سەر کوردستان) ڕێگەی هەموو ڕووناکبیرانی کورد چۆتەوە بەغدا، جا پێش ئەوەی بە تەواوی لەوێ گیرسابنەوە، پاش ماوەیەک ڕوویان لە شارەکانی وەک: قاهیرە، دیمەشق، خاکی حیجاز (مەککە و مەدینە) کردووە، دواتریش ڕوویان لە ئیستانبوڵ کردووە. ئەمە سەرەڕای ئەوەی زۆرێکی دی لە ڕووناکبیرانی کورد ڕوویان لە خاکی حیجاز (مەککە و مەدینە) کردووە، کە دوو هۆکاری سەرەکی ئامادەبیان لەوکاتدا هەبووە.

یەکەمیان: حەجکردنی ساڵانە و زیارەتکردنی شوێنە پیرۆزەکان، دواتر گەڕانەوەیان بۆ کوردستان، یان چوونیان بۆ شارەکانی دی وەک بەغدا، حەلەب، دیمەشق و قاهیرە و مانەوەیان لەو شارانەدا.

دووەمیان: بۆ فێربوونی زیاتری زانست و گەڕان بەدوای فێربونی زانستە عەقڵی و نەقڵییەکان و مامۆستای بەتوانا، کە لەسەردەمی هاتنی ئیسلام، تا ناوەڕاستی سەدەی بیستەم لە زۆرینەی وڵاتانی خۆرهەلاتی ئیسلام وەک نەریتێکی پەیرەو لێکراوی لێ هاتبوو، بەشێوەیەک مەرجێک بوو لە مەرجەکانی هەڵکشانی پایەی زانستیی و فێربوونی زانستە شەرعییەکان و زانستەکانی دی ئەو سەردەم، کە بەشێوازێکی تایبەت لە قوتابخانە ئایینییەکان دەخوێندران.

لێرەدا ئیستیکێکی مێژوویی پێویستە؛ تا ئێستە بەوردی لێکۆڵینەوە لە سەر ڕووناکبیرانی کوردی سەر خاکی حیجاز (مەککە و مەدینە) دەستنووس و دانراوە جۆراوجۆرەکانیان، کە لە دوایان بەجێماون ئەنجام نەدراوە، هەڵبژاردنی ئەم شارانە، کە ببنە تاراوگەی ڕووناکبیرانی کورد، بۆ هەر یەکێکیان هۆکارێکی جیاوازی هەبووە.

گرنگە لێکدانەوە بۆ جیهانبینی کورد بکەین، کە چۆن لە ڕووناکبیریی و کاری ڕووناکبیرەکانی ڕوانیووە؟ بەڵام پێش هەموو شتێک گرنگە ئاماژە بە پێناسەی دەستەواژەی ڕووناکبیر لە فەرهەنگی کوردیی سەدەی نۆزدەهەمدا بکەین، کە ئایا ڕووناکبیری کورد کێ بووە؟ لە ئەنجامی تەتەڵەکردنی ئەو نووسراوە مێژووییانەی سەدەی نۆزدەهەم و ئەو کتێبانەی لەوکاتدا نووسراون، پێناسەکیان بۆ چەمکی ڕووناکبیر و کاری ڕووناکبیریی نەکردووە، هەتا پێناسەیان بۆ چەمکی خوێندەواربوونیش نەکردووە، پێناسەیەکیان بۆ چەمکی مەلا و زانا ئایینییەکانیش نەکردووە!؟ لەبەرئەوەی هەر زانا و فەقێ و موستەعیدەی وەک (ڕووناکبیرێک) لە گۆشەی مزگەوتەکەی وەک منارەیەک بۆ بڵاوکردنەوەی زانست و گەیاندنی سەدای زانابوونەکەی، یان خوێندەوار بوون و بەناوبانگ بوونەکەی بەکارهێناوە، واتە: ڕووناکبیرانی ئەوکات لە کۆمەڵەیەکی یەکانگیری نێو ڕێکخراوێکی زانستیی، ڕووناکبیریی، خوێندەواریی و پەروەردەیدا گرد نەبووبونەوە، بەڵکو هەرکەسە، لە مزگەوتەکەی، یان ماڵەکەی، یان لە خانەیەکی هەژاران، بەردەوامی بە ژیانی تاکەکەسیی و زانستیی خۆی دەدا، بۆیە چەمک و ناوهێنانی ڕووناکبیر لە ناوچەیەک بۆ ناوچەیەکی دی جیاوازیی هەبووە، لەهەندێک شوێن ئەو ناونانەش نەبووە، کە ئێمە ئێستە بەکاری دەهێنین، ئەوکات: زاراوەی (منەوەر) زۆر بە کەمی لە ناوچەکانی سلێمانی و کەرکووک بەکارهاتووە، تا دەگەیشتە هەولێر، ئامێدی و زاخۆ، زاراوەی زانا و عەللامەیان زیاتر بەکاردەهێنا، لە ناوچەی باڵەکایەتی زاراوەی (پیتۆڵ، واتە: فەیلەسوف، زانا، قسەزان، یان بنە پیتۆڵ، واتە: کوڕی زانا، یان کوڕی فەیلەسوف)یان بەکارهێناوە، بەڵام لەدوای شەڕی یەکەمی جیهانیی وشەی منەوەر لە سلێمانیی بەهەموو کوردستاندا بڵاوبوویەوە، کە تا ئێستەش لەڕووی جوانکاریی بۆ گێڕانەوەی مێژووی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم ئەم زاراوەیە دێتەوە بەرباس، کەواتە: لەفەرهەنگی کوردیی لە سەدەی نۆزدەهەم، وشەی منەوەر، یان زانا و عەللامە، یان پیتۆڵ و بنە پیتۆڵ، بەکارهێنراون.

لە سەدەی نۆزدەهەم ناونانەکان زۆر بوون، بەڵام لە ئەمڕۆدا یەک ناونانی گشتیی بۆ ڕووناکبیر هەیە، وەزیفەکانی ڕووناکبیر دیاریکراون، بەڵام

لەسەدەی نۆزدەهەم، ڕوناکبیر وەزیفەیەکی دیاری کراوی نەبووە، هەبووە مامۆستای ئایینی بووە و خوێندنگەی تایبەتی خۆی هەبووە، بە لێهاتوویی و زیرەکییەکەی ژمارەی فەقێیەکانی زیاد و کەمی کردووە، ئینجا دەبوو بەزانایەکی گەورە، ئەگەر ئاستی زانستییەکەی لاواز بووایە، دەبوو بە مامۆستایەکی ئایینی و تەنیا گوتار و کاری پێشنوێژی و ئەرکەکانی دیکەی مزگەوتی ئەنجام دەدا، هەبوو مامۆستای ئایینی بوو، لە هەمان کاتیش شاعیر و نووسەر بووە، هەبووە زانستە ئایینییەکانی خوێندبوو، بەڵام کاری وەزیفیی حکوومەتی دەکرد.

زۆربەی زۆری ڕووناکبیرانی سەدەی نۆزدەهەم دەرچووی قوتابخانە ئایینییەکان بوون، بەتایبەتی تا ساڵی ١٨٧٥ز، دوای ئەم ساڵە ژمارەی قوتابخانەکانی حکوومەتی عوسمانیی لە ناوەندی شار و قەزاکان، بە ڕێژەیەکی بەرچاو زیادی کردبوو، بەڵام زۆرینەیان خۆیان لە بواری ئەدەبیات و نووسینی شیعر، بەزمانەکانی کوردیی، عەرەبیی، تورکیی و فارسیی بینیوەتەوە.

ڕووناکبیرانی کورد، بەلای کەمەوە چوار زمانیان زانیوە، بەڵام ڕوناکبیرانی عەرەب لەسەدەی نۆزدەهەم، بەشێوەیەکی گشتیی زمانەکانی عەرەبیی و تورکییان زانیووە، بەڵام تەنیا ویلایەتی بەیروت و پێشووتریش میسر و تونس لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانیی هەڵاوێرد کرابوون، کە ڕوناکبیرەکانیان، بەهۆکاری تێکەڵبوونیان بە کلتووری وڵاتانی ئەورووپا زمانەکانی ئەوانیشیان زانیوە.

لە ویلایەتێکی وەک میسر، کە لە دوای ساڵی ١٧٩٧ز لەلایەن فەرەنسییەکان داگیرکرابوو، دواتریش لە ساڵی ١٨٠٥ز حاکمێکی نوێ بەناوی (موحەممەد عەلی پاشا)ی بۆ دانرا، زۆرێک لە خوێندەوار و خوێندکارانی بۆ زانکۆکانی ئەورووپا نارد، لەوێ فێری زمانە ئەورووپییەکان بوون، بەتایبەتی فەرەنسیی و ئینگلیزیی، هەرچەندە لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانییش زمانی فەرەنسیی و ئینگلیزیی لە پرۆگرامەکانی خوێندنی قوتابخانە حکومییەکان تا ئاستێکی باش خوێندراون، ئاگەرچی لەلایەن خوێندکارانی کورد کەمتر گرنگیی بەم دوو زمانە ئەورووپیە دراون، بەڵکو زیاتر گرنگییان بەزمانی تورکی-عوسمانیی دراوە، کە زمانی دەوڵەت، دامەزراندن و پەیداکردنی بژێوی ژیان بووە، زمانی فارسیی زمانی ئەدەبیات بووە، بە تایبەتی گوڵستان و بوستانی سەعدی شیرازی، وەک کتێبێکی بەربڵاو لەنێو خوێندەوارانی کورد هەبووە، زمانی عەرەبیی، زمانی ئایین و قورئانی پیرۆز و زمانی سەرەکی خوێندنگە ئایینیەکان بووە، زمانی کوردیی، زمانی دایک و کۆمەڵی کوردەواری بووە، زۆرینەی ڕووناکبیرانی کورد دەرچووی قوتابخانە ئایینیەکان بوونە، کە ئەم چوار زمانە و بەتایبەتی زمانی عەرەبیی تێیدا باڵا دەست بوونە، ئینجا زمانەکانی دی، بۆ فێربوون بەدوای یەکدا هاتوو.

کورد وەک نەتەوە و جوگرافیا؛ دراوسێی ئەو گەلانە بوونە، کە بە زمانەکانی تورکی-عوسمانیی، فارسیی و عەرەبیی نووسیویانە و ئاخاوتنیان کردووە، کە خاوەنی ئیمپراتۆریەتی گەورە بوونە، بۆیە هەژموونی دەسەڵات و فەرهەنگ و ڕۆشنبیریی ئەو سێ ئیمپراتۆریەتە تا ئێستەش کاریگەریی گەورەیان لەسەر بیرکردنەوە و ئەندێشەی ڕووناکبیرانی کورد هەیە، ئەمەش وای کرد دۆخی ڕووناکبیرانی کورد لە سەدەی نۆزدەهەم گۆڕانێکی ئەوتۆی بەسەردا نەیەت و بەهەمان شێوە بۆ سەدەی بیستەم بگوازرێتەوە.

کۆت و بەندەکانی سەدەی بیستەم لە دوای دارشتنەوەی جیهانی نوێ، لە کۆتایی هاتنی شەڕی یەکەمی جیهانیی لەسەر ڕووناکبیرانی کورد، زمان، فەرهەنگ و کلتووری کوردیی زیاتر و بە ستەمتر بوون، کاریگەرییەکانیشی تا چەند ساڵی سەدەی ڕابردووش هەر بەردەوامیان هەبوو، بەتایبەتی لەلایەن دەوڵەتانی داگیرکار و سەردەستی کوردستان.

**●مامۆستا لە بەشی مێژووی فاکەڵتیی ئاداب لە زانکۆی سۆران.**

# ئەدەب

**لەم بەشەی گفتوگۆی ئەدەبییدا عەباس عەبدللا یووسف و سمکۆ محەمەد قسە لەسەر لایەنی وەرگێڕان و نووسینی دەق دەکەن، بەتایبەتی دەستپێکی نوسین، کە سەرەتایەکی سەختی پرۆسەی نووسینە، ئەمە جگە لەوەی نەبوونی گفتوگۆشیان لە نێوەندی ئەدەبیی کوردیی خستووەتە نێو باسەکەیان و ئاماژەیان بەوە کردووە، کە بۆچی ئەم پرسی گفتوگۆیە بەم شێوەیە پشتگوێ خراوە. ئیستاتیکای دەق-یش تەوەرێکی دیکەی ئەم گفتوگۆیەیانە.**

## گفتوگۆی پێنجەم

**سمکۆ محەمەد:** بابەتی ڕەخنە هاتە پێشەوە، کە لەنێو کورد ڕەخنە وەکو چەمکێکی فکری تەماشا نەکراوە، بەڵکو وەکو ڕق و کینە تەماشا کراوە، من بەردەوام ـتووە ئەوەم بیستوە، کە ڕەخنە چەمکێکی فرە مانایە، بـەلام لـەلای تۆ مـانای شۆڕشگێڕیی هـەیە، کە من جیاوازم لەگەڵ تۆ، یان ئەوەی دەگوترێت ڕەخنە موڵکی چەپەکانە، چەپ بەمانای ئـەوەی ڕۆشنبیر و نووسـەر ـدبێت ڕۆحێکی نارەزایەتیان تێدا بێت، یان مانایەکی تری ئەدەبیی هەیە، بۆچی لێرە کەسێک ڕەخنە لە کەسێکی ـی بگرێت، پێی دەڵێن (شیشێکیان لێداوە) بۆچی ڕووە ئەدەبییەکەی نابینرێت، یان بەمانایەکی دی، تۆ بۆچی بەرگەی ڕەخنە ناگریت و تووڕە دەبیت؟ من ئەم فەزایەم ـە زۆر نووسـەری دیکەشدا بینیوە.

**عەباس عەبدوللا یووسف:** ڕەخنە مامەڵەکردنە لەگەڵ تەواوی ئەو داتایانەی لە بەردەستن بۆ هەموو کایەکان، بەمانای ئەوەی ڕەخنەگر دەبێت کامڵ و شموولی بێت، لەهەمبەر ڕێچکە هونەرییەکان و تیۆر و ئەدەب و شانۆ و مۆزیک و تەواوی بوارەکان، ئەمە یەکێکە لە خەسڵەتە پێشکەوتووەکان، بۆ نموونە ئەدەب پەیوەندییەکی پتەوی لەگەڵ هەموو کایەکان هەیە، مۆزیکیش بەهەمان شێوە هـەروەهـا شانۆ و هـونـەر بەگشتیی، ئەحمەد سـالار لە شانۆی نالی و خەونێکی ئەرخەوانی، کارێکی زۆر پێشکەوتووانەی کرد و سەرکەوتوو بوو، بەڵام ئەگەر شارەزابیت، دەبێ ئەو داتایەت لە لابێت، کە ئەو ڕێچکەیەی لە شانۆکاری مەغریبی عەبدولکەریم بەرشید جۆرە سوودایکی وەرگرتووە، چونکە شانۆی ئاهەنگسازی بنەچەکەی لەمەغرییە.

**سمکۆ مـحـەمـەد:** مـن ئـەمـەم زانـیـوە، کـە بنـەچـەی ئاهەنگسازیی کورد لە مەغریبە، بەڵام بیرمان نەچێت ئەو پیاوانەی کورد لە مەغریب ناسراون، کە بە رائیدی بزووتنەوەی شانۆیی ئاهەنگسازی ناسراون، بەهەرحاڵ من باسی ئەوەم کرد، لەگەڵ ئەوەی، کە ڕەخنە کارێکی دڵڕەقانە و ئاشکراکردنی واقیعیەتی پشتی نووسینیشە، زۆرجار لەگەڵ سرووشتی دەقدا مامەڵەی پێناکرێ، بەڵکو دەق سەراوژێر دەکات، یان بە پێوەری خۆی، کە نازانین بەچ تیۆرێک مامەڵە دەکات، بۆ نموونە، ئەوەی کە پێی دەگوترێت ڕەخنەگری کوردیی، چاوەڕێ ناکات دەق خۆی

> سمکۆ محەممەد:
> من بەردەوام ئەوەم لەتۆ بیستوە، کە ڕەخنە چەمکێکی فرە مانایە، بەڵام لەلای تۆ مانای شۆڕشگێڕیی هەیە، کە من جیاوازم لەگەڵ تۆ
>
> عەباس عەبدوڵا یووسف:
> ڕەخنەگر دەبێت کامڵ و شموولی بێت، لەهەمبەر ڕێچکە هونەرییەکان و تیۆر و ئەدەب و شانۆ و مۆزیک و تەواوی بوارەکان، ئەمە یەکێکە لە خەسڵەتە پێشکەوتووەکان

پێناسە بکات، بەواتایەکی دی ڕەخنەگر ئەوکات پەلە لە زەمەن دەکات، بەبێ ئەوەی ڕێگە بدات دەق هەناسەیەک بدات، مەبەستم لەوەیە، کە ڕەخنەگر بوار بدات دەقەکە بکەوێتە بەردەستی تەواوی خوێنەران. ڕاستە، کە پێوەر لەسەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی دی دەگۆڕێ، هەروەها مەزهەبی ڕەخنەییش لەگەڵ هەلومەرجی سەردەمیانە تەماشای دەق دەکات، ئەمە لە کاتێکدا، کە پەیوەندی ڕەخنەگر و دەقنووس، هەروەها پەیوەندی خوێنەر و دەق-یش، پەیوەندییەکی جێگیر نییە، ڕەنگە ڕەخنەگر خۆی پڕ چەک بکات بـەزاراوەی میتۆدێک، کە زۆرجار لەجوگرافیا و کەرەستەی دەقەکانەوە دوورە.

**عەباس عەبدوڵلا یووسف:** ئێمە رەخنەگرمان نییە وەکو رەخنەگری ناسراو، واتە پیشەی خوێندنەوەی دەق و رەخنەگرتن بێت لە دەق و ئینتیمای سیاسیانەی نەبێت، ئەمە یەکێکە لە کێشە هەرە سەیرەکانی ئەدەبی کوردیی، ئەوەی کە دەڵێن (شیشێکی لێداوە) ئەمە ئیدیۆمی نێو بازنەی نووسەرانە، راست دەکەی رەخنە دەبێت بەمیتۆد و تیۆر بێت، هەروەها نابێت کڵێشەیەک بۆ چەندین نووسەر و ئەدیب بەکار بێت، ئاخر من بۆیە تووڕە دەبم، چونکە ئەوانەی دەرهەق بەمن نووسراون رەخنە نەبوون، بەڵکو

**سمکۆ محەمەد:**
**قسەی تۆ لەسەر گوتار، لە تێڕوانینەکانی فۆکۆ یان هابرماس، زیاتر لە کامیان نزیکە؟ چونکە رەخنەگرتن لە عەقڵانییەت نەوەی بەرهەم هێنا، کە مەرج نییە گوتار تەنیا لە کایەی سیاسیی بێت، بەڵکو هەموو کایەکانی ژیان دەگرێتەوە، کە تەواوکەری یەکدین**

**عەباس عەبدوڵلا یووسف:**
**گوتار دەبێت هەم شیکاریی بێت، هەم ناراستەکەر، هەم مانا و نامانجی دیار بێت. دەبێت هەڵگری گوتار واتە ئەو کەسەی لە پشت دەقەکانییەوە گوتاری هەیە، دەبێت خاوەنی مانایەک بێت، کە پێشتر بە لای کەم ئەو گوتارە لە هیچ شوێنێک نەگوترا بێت**

هەندێک جار ناوزڕاندن، بۆ نموونە لەجیاتی ئەوەی رەخنە لە ستایلی نووسینی من بگرن، نووسیویانە (شاعیری هەزیل) و هتد، قسەشم نەکردووە، من دەمتوانی سکاڵای یاسایی تۆمار بکەم، بەڵام لەبەرخاتری دەفعی بەڵا قسەم نەکردووە، چونکە دەزانم ئەو هاندانە، چەند کەسییە و لەمە خراپتریان پێیە.

**سمکۆ محەمەد:** بەس بەبڕوای من تێگەیشتنێک هەیە لە دونیای ئەدەبی رەخنەگرانەی کوردیی، کە هەم لەگەڵ رەوتی رەخنەگرانەی عەرەبیدایە و هەم پێچەوانەشە، نموونەی ئەو رەخنەیەی، کە بونیادگەرییەکان وەکو رەوتێکی لاساییکەرەوە هێنایانە نێو دونیای ئەدەبی کوردییەوە، لەگەڵ ئەوەشدا پێموایە ئەو لاسایی کردنەوەیە هونەری دەوێ، چونکە بەو تێگەیشتنەیە دەتوانێت تیۆر پراکتیک بکات بەسەر دەقدا، هەروەها نزیک ببینەوە لەچەمکەکە، ئەگەرنا نابین بەخاوەنی رەخنە و رەخنەگر، مەبەستم لەوەیە ترس دووربخەینەوە لەئەدەب؟ بابیرم نەچێت تۆ لەوەڵامی پێشووتدا باسی شۆڕشگێڕیت نەکرد، من مەبەستم ئەوەبوو قسە لەسەر چەمکی شۆڕشگێڕیی ئەدەبی بکەین، من هەستم پێکردووە ئەم بابەتە بەبیانووی ئەوەی شۆڕش باوی نەماوە خەریکە پشتگوێ دەخرێت، بەڵام لە راستیدا شۆڕش مانای ئاڵنگاری دەسەڵات نییە، بەو مانایەی، کە ئێمە بۆ چەمکی شۆڕش چەندین پاشگرمان هەیە، لەوانەش شۆڕشی فەرهەنگیی، کە بەشێکی کاری ئەدەبیی و هونەریی ئەمە، داگیری کردووە، بۆ نموونە ترۆتسکی کتێبێکی لەمبارەیەوە هەیە و محەمەد دەکروب شیکاری بۆ کردووە، کە ژیان هەرگیز ناچێتە دەرەوەی شۆڕش.

**عەباس عەبدوڵلا یووسف:** دیارە بۆچی ئەم تیۆرە پشتگوێ خراوە و لەدوای راپەڕینەوە کەوتووەتە بەردەم پەراوێزێکی گەورە، یەکەم بەو هۆیە بوو، کە سۆڤیەت تازە رووخاوە، ئەوەش هۆکارێک بوو، کە چەمکی شۆڕش بەهەموو رەهەندەکانییەوە بەهای نەمێنێت، دووەم رەوتی بوونایەتی (وجودییەت) تازە گەیشتبوونە خۆرهەڵات، ئەوانیش لە دایک بوونیان بەمەبەستی لێدان بوو لە چەمکی شۆڕشگێڕیی، کە لەنێو کایەی ئەدەبیی و هونەریدا، مولکی چەپ و رادیکاڵ و ریالیستەکانە، بۆیە کە زەمینە سازکرا بۆ لێدان لەم تێگەیشتنە تیۆرییەی ئەدەب و هونەر. ئیدی بابەتەکە بە کوێ گشتیی، بەبێ ئەوەی خەڵک بەتەواوی تێبگەن، کە شۆڕش مانایەکی گشتگیری هەیە، راستەوخۆ بەعەیبەیەکی گەورە لە قەڵەم درا، کەچی هەر دوای ٢٥ ساڵ جارێکی دی چەمکی شۆڕشگێڕیی بە وێنەیەکی دیکە و بە ئاراستەیەکی دی هاتەوە مەیدان، بەتایبەتی بۆ ئسولگەراکان و ئەوانەش، کە لەگەڵ فەزای نوێی ئەمریکی هاو ئاواز بوون، بونگەراکان بوون جۆرێکی نوێ لە هەڵوێستیان هێنایە کایەوە، ئەویش هەڵوێست بوو بەرانبەر بە ژیان و لێکەوتەکانی، گرییەک لە بەرانبەر سەلماندنی بوون لە هەموو بوارەکاندا، بەتایبەتی سەرمایەداریی هەموو دیاردە و شتێکی کۆنترۆڵ کرد.

**سمكۆ محەمەد:** بەڵام ئەم ڕەوتە هەر زوو تووشی شکستی فیکری هات، چونکە دەرکەوت، کە مادام سۆڤیەت ڕووخاوە، ئیدی پێویست ناکات فیکرەکەش بەردەوام بێت، خۆ زاڵبوونی سەرمایەداریی بەو مانایە نییە، کە بەختەوەریی و خۆشبەختیی و خۆشگوزەرانیی لە هەموو کایەکاندا ڕەنگ بداوەتەوە، یان بەمانای ئەوەی دونیای دووچینی نەماوە، بەتایبەتی ئەو ژیانەی، کە لەنێو ئەدەب و هونەردا هەیە، ئیدی بۆچی ئێمە یەخەی ڕەوتێک بگرین، یان یەخەی شکستی سۆڤیەت بگرین، ئەمەشیان خاڵی کردنەوەیە لە بیرکردنەوە لە چەمکی شۆڕشی هەمیشەیی.

**عەباس عەبدوڵلا یووسف:** منیش ئەوە دەزانم، کە لەم دواییەدا فەزایەک بەناوی شۆڕش پەیدا بووە، کە هەموو ئەوانەی بەشدارییان دەکرد، بەتایبەتی ئەو چالاکانەی لەسەر شەقامەکانی میسر و تونس و سووریا و تارادەیەک کوردستان و عێراق-یشەوە دەستیان پێ کرد هەموویان شۆڕشگێر نەبوون، هەروەها بەشێوەیەکی گشتی ئەدیب و هونەرمەندیش نەبوون، بەڵام دواتر بە نائاگایانە ئەو فەزایە بوو بەهەوێنی ئەدەب و هونەر، بەڵام دیسان دەمەوێت بڵێم هێشتە چەمکی شۆڕش ئەو ترسەی هەیە تەنانەت لە بەکارهێنانیشی لە لایەن ئەدیب و هونەرمەندانەوە، خۆ پەیوەندییە ڕۆشنبیرییەکان بەئاشکرا دیارن، کەس ئێستە موناقەشەی ئەو چەمکە ناکات، جا ترس بێت، یان دژەچەمک.

## گفتوگۆی شەشەم

**سمكۆ محەمەد:** گوتار تێرمێکی گرینگە لە دونیای ئەدەبدا، بەبڕوای من هەموو دەقێک گوتارێکی لەپشتە، جا ئەو گوتارە بۆ هەر مەبەستێک و ئامانجێک بێت، بۆیە لە لای من گوتار بریتییە لە چەند پنتێکی تەواوکەری یەکدی، ئەویش دەق و هێز و پراکتیکە، ئەمە تێگەیشتنی تایبەتی خۆمە بۆیە ئاراستەی تۆی دەکەم، تاکو موناقەشەی بکەین، لە ئەدەبیشدا هەتا دەق وەکو هێز و توانای ئەدەبیی دەرنەکەوێت، لە ئاستی خوێنەر و وەرگر تەماشا ناکرێت، قسەی تۆ لەسەر گوتار، لە تێڕوانینەکانی فۆکۆ یان هابرماس، زیاتر لە کامیان نزیکە، چونکە ڕەخنەگرتن لە عەقڵانییەت ئەوەی بەرهەم هێنا، کە مەرج نییە گوتار تەنیا لە کایەی سیاسیی بێت، بەڵکو هەموو کایەکان بۆ ژیان، کە تەواوکەری یەکدین، سەرئەنجام یەک ئامانجیان هەیە.

**عەباس عەبدوڵلا یووسف:** گوتار دەبێت هەم شیکاریی بێت، هەم ئاراستەکەر، هەم مانا و ئامانجی دیار بێت. دەبێت هەڵگری گوتار واتە ئەو کەسەی لە پشت دەقەکانییەوە گوتاری هەیە، دەبێت خاوەنی مانایەک بێت، کە پێشتر بە لانی کەم هیچ شوێنێک ئەو گوتارە نەگوتراوە، پاشان دەبێت ئەوە بزانین، کە گوتار دوو ڕەهەندی هەیە، ڕەهەندی یەکەمیان دژی خۆیەتی، ئەویدیش دۆستە لەگەڵ دەربڕینەکانی پشت دەقەکە، لە گوتاردا ڕەخنە هەیە، چونکە تەنیا نمایش نییە، بۆ نموونە گوتار هەیە لە ڕستەیەک دایە، یان لە پەیکەرێک دایە، یان لە دەقێکی شیعریی دایە، ئەوەی فۆکۆ باسی دەکات لە کتێبی سیستمی گوتاردا، بابەتێکی گشتییە، چونکە لە

> *سمكۆ محەمەد:*
> ***ئایدیۆلۆژیا لەلای من ماسکە و ئەگەر ورد ئەبینەوە، بۆمان دەرناکەوێت ئەو دەقە سەر بەچ ئایدیۆلۆژیایەکە، من ئەم موناقەشەیەم لەگەڵ زۆر نووسەر کردووە، بەڵام وەڵامی گونجاوم دەست نەکەوتووە؟***
>
> *عەباس عەبدوڵلا یووسف:*
> ***ئایدیۆلۆژیا وەکو خۆت، کە بڕوات پێ هەیە و ئاشکرات کردووە، بەو مانایەی، کە ئەدەب و ئایدیۆلۆژیا ماسکن، ئەو ڕووپۆشە بە خوێنەری جددی و بیرکەرەوە ئاشکرا دەکرێت، ئەم قسەیە زۆر تەواوە، بەڵام دۆزینەوەی ماسک لە ئەدەبدا زەحمەتە***

فەلسەفەدا گوتار هەیە، مانا بەدەستەوە نادات، خوێنەر تێی ناگات، بۆ نموونە گوتارە میتافیزیکییەکانی وەکو هایدگەر، یان ئەو نووسینانەی لەسەر هۆڵدەرلین-ی شاعیر نووسیونی.

**سمكۆ محەمەد:** باش بوو باسی میتافیزیکت کرد، ئەم چەمکە لە دوای ئەفلاتونەوە هاتووە و لە ئاییندا زیاتر ڕەگی داکوتیوە، بۆچی من لە مەبەستی میتافیزیکییەکان تێناگەم، بۆچی هەڵگرانی ئەم چەمکە خۆیان بەدەستەوە نادەن و تێناگەین چییان دەوێت، لە کاتێکدا ئەخلاق یەکێکە لە پێوەرەکانی میتافیزیکی، هەروەک (ئەمانوئێل کانت) کتێبێکی لەبارەوە نووسیوە، بەڵام ئەخلاق وەکو

چەمکێکی فەلسەفی سەربەخۆیی وەرگرتووە، ئەم چەمکە لە سەدەکانی ناوەڕاست بە دواوە زیاتر موناقەشەی فەلسەفی لەسەر کرا، بۆ نموونە سپینۆزا یەکێک لەو بیرمەندانەی، کە بە سەلماندن موناقەشەی سرووشتی ئینسان و ئازادیی و خێر و شەڕی کردووە، ئەو پێیوایە، کە ویستەکانی دیکەی مرۆڤ لە ئەنجامی هەڵچوونەکانەوە لە دایک بوون، ئەوان فێرە ڕقێکی خۆرسکیمان دەکەن، بۆیە توندترن لەو ویستانەی لە ڕێگەی مەعریفەوە لە دایک بوون، یان ئاگامین، کە ئەخلاقی گرێداوە بە بوونی

**سمکۆ محەمەد:**

***من پێموایە دۆزینەوەی موناقەشە دەبێ لەوێوە بێت، کە چۆن جیاوازیی بدۆزینەوە، بەبێ بوونی جیاوازیی، موناقەشە هیچ بەهایەکی نییە. ئێمە کە باسی موناقەشە دەکەین، باسی ئەو جیاوازییە دەکەین، کە لەنێوان پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکاندا هەیە. بەهای بیرکردنەوەی قووڵ و خۆ دوور خستنەوە لە هەرکام لەو دووانە، خۆ دوور خستنەوەیە لە چەمکی هیومانیزم؟***

**عەباس عەبدوڵڵا یووسف:**

***تەبایی پێویستییەکی هەمیشەییە، دەبێ وردە وردە ئەڵتەرناتیڤ بدۆزینەوە، لە نێوەوە ئەو تەباییە لەسەر بنەمای کپ کردن دروست بووە، نەک فەزایەکی خۆرسکی کۆمەڵایەتی و فیکریی، جاربەجار شتێک، دۆزێک ببەینە پێشەوە، بە مەرجێک تەباییەکە لەنێو نەچێت***

مرۆڤەوە، وەکو کارێکتەری ئاکتیڤ لە هەموو کایەکان، یان نیچە، کە بە چینە جیاوازەکانەوە گرێیداوە، کەچی ئەو میتافیزیکایەی نووسەری کورد باسی دەکەن، خاڵییە لەم ڕەهەندە فیکرییەی، کە لە خۆراوا شیکاری بۆ چەمکەکەی کراوە، بەمانایەکی دی لەنێو ئەدەبدا جێگەی بۆ کراوەتەوە و ڕەهەندی جیاوازی وەرگرتووە.

**عەباس عەبدوڵڵا یووسف:** من ناچمە سەر ئەوەی چەمکەکە لە کوێوە هاتووە و بۆچی کاری پێ دەکرێت و ئامانجی پشت سروشتی چەمکەکە چییە؟ میتافیزیک بە بڕوای من لە نموونەی باڵادا دەردەکەوێت، هەیە لە واقیعدایە، بەس نابینرێت، هەیە لە ئەخلاقی ئایدیایی دایە، چونکە بۆ ئەوی دی جۆرێک لە ڕەوشتی وروژاندنی بوونە، بۆ نموونە ئەفلاتون لە (کۆمار) چی گوت؟ کە دواتر یاساکەشی بۆ (یۆتۆپیا)کە دانا، گوایە دەبێت ڕۆشنبیر و فەیلەسووف دەسەڵاتیان هەبێت، فارابی لە چاکشارە (المدینة الفاضلة) چاکەکاران بەهەمان شێوە قسە دەکات، دەبینین، کە هیچیان مەبەستیان بۆ پراکتیک نەکرا، من هەر شتێکم لێ عاسی بێت و بۆم نەکرێتەوە، لە ڕێگەی لانگویج، واتە زمانەوەری ڕەگی بابەتەکە دەردەهێنم، کە ئەمە ئێتمۆلۆژیایە و کەمتر نووسەر و ئەدیب خۆیان لەم موناقەشەیە دەدەن، دواتر چەمک، یان تێرم، یان زاراوەکە شی دەکەمەوە، هەروەها دەرئەنجامێکی بۆ پەیدا دەکەم، ئێستە گەیشتوومەتە ئەو ئەنجامە، بۆیە ئەمە دوا هەوڵ و دوا ئاستی مەعریفی منە، پێشموایە هەوڵێکی جددی و سەرکەوتووانەیە، چونکە هیچ نەماوە نەگوترێت، تەنیا ئەوە نەبێت بۆ ناسیۆنالەکان ڕێگەی زمانناسی بگرنە بەر و لەوێوە، لە ڕێگەی زمانەوە کێشەی چەمکەکان چارەسەر بکەن، بەتایبەتی ئەو نەتەوانەی، کە هێشتە نەیانتوانیوە چەمکێک لە کایەکانی مەعریفیدا پراکتیک بکەن.

## گفتوگۆی حەوتەم

**سمکۆ محەمەد:** دەمەوێت باس لە تێرمێکی ئەدەبی بکەم، ئەویش تێرمی دەستپێکە لەنووسیندا، بەتایبەتی نووسینی دەق، جا چ شیعر بێت، یان چیرۆک، یان ڕۆمان بێت، ئایا دەستپێک دەچێتە چوارچێوەی ئایدیۆلۆژیا، تۆ لە نووسینی زمانەوانییەوە دەتوانی بەشدارییەکی باش و تەواو بکەیت لە دیاریکردنی کۆنتێکستێک بۆ نووسینەوەی دەقی ئایدیۆلۆژیی، ئایا ئەو دەقانە دەناسییەوە، کە کێشەی دەست پێکیان هەیە، لە کاتێکدا ئایدیۆلۆژیا لەلای من ماسکە و ئەگەر ورد نەبینەوە، بۆمان دەرناکەوێت ئەو دەقە سەر بەچ ئایدۆلۆژیایەکە، من ئەم موناقەشەیەم لەگەڵ زۆر نووسەر کردووە، بەڵام وەڵامی گونجاوم دەست نەکەوتووە؟

**عەباس عەبدوڵڵا یووسف:** دەقنووس پێویستە بە زمانی ئەفسانەیی بنووسێت، واتە زەخیرەیەکی هەبێت هاووتای هەبێت لەگەڵ دەقێکی دیکەی بیانی، بۆ ئەوەی بتوانێت لەنێو دەقدا، وشەگۆڕکێ بکات، یان بەردەوامی بە دەقەکەی بدات، کە فیکری جیاواز بەرهەم بهێنێت، بەڵام هیچ نووسەرێک خوێنەرێکی وەکو خۆی نییە تاکو

تنی بگات، لێرەوە ڕەخنە دروست دەبێت، کە نووسەر لەو ڕەخنەیە تێناگات، بۆیە بە بڕوای من خوێنەر دەبێت لە ئاست هۆشیاری نووسیندا بێت، ئەو جۆرە ڕەخنەیەی ئێستە لە دونیای ئەدەبی کوردیی دروست بووە، بەشێوەیەک لە شێوەکان، یان ئاراستەکراوە، یان نەزانینە. لە پاش هەموو ستەمێک، یان ململانێیەکی ئایدیایی بۆ ناساندنی تێکست، ئایدیاییەک هەیە، هەروەها ململانێیەکی جیاواز هەیە، کە دەبێتە دەستکەوت یان دەرکەوتەی ئەدەبیی و فیکریی. لە ئەدەبدا، من پێموایە ئایدیۆلۆژیا وەکو خۆت، کە بڕوات پێ هەیە و ئاشکرات کردووە، بەو مانایەی، کە ئەدەب و ئایدیۆلۆژیا ماسکن، ئەو ڕووپۆشە بە خوێنەری جددی و بیرکەرەوە ئاشکرا دەکرێت، ئەم قسەیەم زۆر تەواوە، بەڵام دۆزینەوەی ماسک لە ئەدەبدا زەحمەتە، چونکە ئەدەبی ئەبستراکت ماسک دەشارێتەوە، بۆیە دۆزینەوەی زمانی دووەم لە ئەدەبدا پەیوەندی بە کۆمەڵەوە هەیە، بەو مانایەی ئامانجی ئەدەبیات، کە دواتر باسی دەکەم، ئەوەیە، کە ڕەخنەگر لەجەوهەری دەقدا دەیدۆزێتەوە، بۆ ئەوەش دەبێت پابەندی ناسینی ئایدیۆلۆژی بێت. ئەگەر ڕەخنەگر، یان خوێنەری دەق خۆی ئایدیۆلۆژی بێت، دەق ئەوکاتە ڕزگاری دەبێت لە ڕەخنە، کە ئەمە لە دونیای ئەدەبی کوردیدا زۆرە.

**سمکۆ محەمەد:** دەمەوێت باسی نەمانی هێزی موناقەشەکردن بکەم، کە لە پاشەکشە دایە، ئەمەشیان خاڵی کردنە ناچێتە خانەی لە دەستدانی مۆراڵی ڕۆشنبیرییەوە. مارگریت دیراس لە فیلمی هیرۆشیما خۆشەویستمە، دەڵێت زانست بەسەر ئەخلاقدا سەرکەوت، لە ڕێگەی شاشەی تەلەفزیۆنەوە ئەم موناقەشەیە ناکرێت، چونکە ناکرێت لە بەرنامەیەکی تەلەفزیۆنیدا باسی مۆڕاڵ بکەیت، هەم بەرنامەکە دادەخرێت و هەم سانسۆرت دەخرێتە سەر، ئەمە زیان لە گرەوی دەستەبژێر دەدات لەگەڵ سیاسەتدا، چونکە بەکارهێنانی ئەو تێرمانە لە لایەن کۆمەڵگەشەوە یاساغە، ئەم وشانە ئاگرین، من پێموایە دۆزینەوەی موناقەشە دەبێ لەوێوە بێت، کە چۆن جیاوازیی بدۆزینەوە، بەبێ جیاوازیی موناقەشە هیچ بەهایەکی نییە. ئێمە کە باسی موناقەشە دەکەین، باسی ئەو جیاوازییە دەکەین لەنێوان پەیوەندی کۆمەڵایەتی و بەهای بیرکردنەوەی قووڵ، خۆ دوور خستنەوە لە هەرکام لەو دووانە، خۆ دوور خستنەوەیە لە چەمکی هیومانیزم؟

**عەباس عەبدوللا یووسف:** تەبایی پێویستییەکی هەمیشەییە، دەبێ وردە وردە ئەڵتەرتانیڤ بدۆزینەوە، لە نێوەوە ئەو تەبابییە لەسەر بنەمای کپ کردن دروست بووە، نەک فەزایەکی خۆڕسکی کۆمەڵایەتی و فیکریی، جاربەجار شتێک، دۆزێک ببەینە پێشەوە، بە مەرجێک تەبابییەکە لەنێو نەچێت، زۆر کەسی یاخی لە کۆمەڵگە، کە لەوانەیە تۆ یەکێک بیت، یان پەشیمان دەبێتەوە، یان پەشیمانی دەکەنەوە، ئەو فشارە کۆمەڵایەتییە، کەڵەکەبووەی کار و ڕۆشنبیریی خەڵکە، لە قۆناغێکی مێژوویدا، هیگڵ بەو مانایە هۆشیاری دەدات و دەڵێت (هەش بەسەر ئەوەی سەرەڕۆیە و پێش سەردەمی خۆی دەکەوی!) لەوانەیە هیگڵ مەبەستی تاکە کەسێک و دووهەمیش کۆمەڵگەیەک بێت لە بەرانبەر دەوڵەتانی کۆلۆنیالیزم، بۆ نموونە سەردەمی ڕۆشنگەریی زۆر لە بیرمەندەکان ئەو باجە قورسەیان دا، ئەنجامەکەی بە ماڵ وێرانی کۆتایی هات، تا ئەوکاتەی شۆڕشی فەڕانسی و دواتریش شۆڕشی تەکنۆلۆژی سەرکەوت، دەتوانین بڵێین جەنگیش هەمان شتە، وەکو ئەو هاوکێشەیە، کە ڕوونم کردەوە.

***سمکۆ محەممەد:***
***بۆچی دەستەبژێری کورد چێژ لە موناقەشە وەرناگرن، بۆچی شتێک نەماوە مانای موناقەشەکردن بێت بەمانا قووڵەکەی؟ بەبڕوای من وەکو کانینی بیرکەرەوە مامەڵە لە تەک ئەدەب ناکەن، کە ئەدەب و فیکرە.***

***عەباس عەبدوللا یووسف:***
***دەبێت ئەوە بزانین، کە ئێستە دەستەبژێر لەنێو حزبە سیاسییەکانن، هەر حزبێک کۆمەڵێک کاریکتەری ڕۆشنبیری هەمەجۆری خۆی هەیە، لەدەرەوەی حزبەکان بوونی دەستەبژێر بووەتە مەحاڵ***

**سمکۆ محەمەد:** هەر لەو پەیوەندییەی، کە باسەکەمان دەکاتە جیوەیی، دەمەوێت موناقەشەی تێرمی موناقەشە کردن بکەم لە دونیای ئەدەبیاتی کوردیدا، کە غاییە، بۆچی دەستەبژێری کورد چێژ لە موناقەشە وەرناگرن، بۆچی شتێک نەماوە مانای موناقەشەکردن بێت بەمانا قووڵەکەی؟ بەبڕوای من وەکو کائینی بیرکەرەوە مامەڵە لە تەک ئەدەب ناکەن، کە ئەدەب و فیکرە.

**عەباس عەبدوڵلا یووسف:** ڕۆشنبیری دەستەبژێر پێیوایە خۆ دوێنەییەکەی، واتە مەنەڵۆجی ئەدەبی و فیکریی، ئەگەر لە ٧٠٪ بەکارهێنابێت، مانای وایە لە ٣٠٪ کاڵکەی مەبەستە فیکرییەکانی دەرناچن، ئەمە وا نیشان دەدات، کە دەستەبژێریی کێشەی لەبەردەم خۆی دروست کردووە، کە مەرجێکی تەعجیزییە، چونکە خۆی دەبێتە بەشێک لەو کێشانەی لەبەردەم مەعریفە ڕاوەستاون، بەشێک لە گرێ دەروونییە ڕۆشنبیرییەکە، دەبێت ئەوە بزانین، کە ئێستە دەستەبژێر لەنێو حزبە سیاسییەکانن، هەر حزبێک

> **سمکۆ محەمەد:**
> ***لەفەزای ئەدەبی کوردیدا زۆر باس لە ئیستاتیکای دەق دەکرێت، لە کاتێکدا ئیستاتیکا لەدەقدا ڕەهەندی فیکری هەیە، مەبەست تەنیا لە جوانی نووسینەکە نییە، بەقەد ئەوەی ئیستاتیکا زۆر لەو تێڕوانینانەی تێدایە، کە بریتییە لەکات و شوێن و نۆستالیژیا و و تەنانەت هەڵوێستیش***
>
> **عەباس عەبدوڵلا یووسف:**
> ***چەمکی ئیستاتیکا لەلای من پەیوەندی بەجوگرافیا و تێڕوانینی ئەخلاقیاتەوە هەیە، بەهۆی ئەوەی من لە ژینگەیەکی میللیدا ژیاوم، هەستم کردووە شتە جوانەکان لە دونیای ئەدەبیی و هونەریدا وەکو خۆیان نابینرێن، تەنیا ئەوە نەبێت، کە ئیستاتیکا بە خەیاڵی و تیۆرییەوە تەماشاکراوە***

کۆمەڵێک کارێکتەری ڕۆشنبیری هەمەجۆری خۆی هەیە، لەدەرەوەی حزبەکان بوونی دەستەبژێر بووەتە مەحاڵ.

**سمکۆ محەمەد:** بەپێچەوانەوە من پێموایە مەحاڵ نییە، بەلام ئەگەر بڵێت ڕێگەیان گرتووە لە مومارەسەکردنی جەوهەری کایەکە ئەمە ڕاستە.

**عەباس عەبدوڵلا یووسف:** لەدەرەوەی سیاسەتی حزبەکان، دەستەبژێر گوفتارەکانیان وانیشان دەدەن، کە گوایە لەدەرەوەی بازنەکەن، ئەمە ئەگەر هەمووشی باش نەبێت، ئەم بەشەی باشە، کە جاربەجار فۆرمێکی جیاواز لە دەستەبژێر نمایش دەکەن، پێویستە دەستەبژێری نێو حزبەکانیش بتوانن هەڵبژاردنی ڕستەی دەربڕین و وشەی دەربڕیان ئامانجدار بێت، بۆئەوەی لە دەرەوەی سیاسەتی حزب گوتاری تایبەتی خۆیان بناسنەوە، من هەم ئەم نەغمەیە دەبیستم و هەمیش دەیبینم، هیوادارم زیاتر بێت.

## گفتوگۆی هەشتەم

**سمکۆ محەمەد:** لەفەزای ئەدەبی کوردیدا زۆر باس لە ئیستاتیکای دەق دەکرێت، لە کاتێکدا ئیستاتیکا ڕەهەندی فیکری هەیە لەدەقدا، تەنیا مەبەستم لە جوانی نووسینەکە نییە، بەقەد ئەوەی ئیستاتیکا زۆر لەو تێڕوانینانەی تێدایە، کە بریتییە لەکات و شوێن و نۆستالیژیا و تەنانەت هەڵوێستیش وەکو ئەوەی لەلای مەحموود دەرویش، سەلیم بەرەکات، ئەزرا پاوەند، ئەحمەدی شاملۆ و هتد، هەیە، بەلام بەوپێیەی کە ئیستاتیکا دۆزینەوەی هەڵوێستە لەو دەقانەدا، کە لە تارماییدا نووسراون و خۆیان نمایش کردووە بەناوونیشانی سیمۆلۆژیا، من لەو ئیستاتیکایە هیچ چێژێک نابینم، کە لە دەقی کوردیدا زۆرجار بەزۆر دەڵێن ڕەنگی داوەتەوە، بۆ نموونە نووسینی دەق لەسەر ڕووداوێک، یان کارەساتێک، کە هیچ ئیستاتیکایەکی تێدانییە، جگە لە هەڵوێستێکی ناسیۆنالی، جگە لە درووشم شتێکی دی نییە.

**عەباس عەبدوڵلا یووسف:** چەمکی ئیستاتیکا لەلای من پەیوەندی بەجوگرافیا و تێڕوانینی ئەخلاقیاتەوە هەیە، بەهۆی ئەوەی من لە ژینگەیەکی میللیدا ژیاوم، هەستم کردووە شتە جوانەکان لە دونیای ئەدەبیی و هونەریدا وەکو خۆیان نابینرێن، تەنیا ئەوە نەبێت، کە ئیستاتیکا بە خەیاڵی و تیۆرییەوە تەماشاکراوە، بەلام من بە شوێن و خودی ئینسانەوە گرێم داوە، بۆ نموونە کاتی خۆی ماڵمان لە گەڕەکی میللی نشین بوو، کچێک هەبوو، کە محەللەبی لەسەر سینییەکی، یان تەنەکەیەک دایدەنابوو دەیفرۆشت، هێندە جوان بوو بیرم لەوە دەکردەوە، کە ئەگەر دەرهێنەری هۆلیۆد، یان خۆراوایی هەبووایە، یان تا ئەو کچە خۆڕسکانە کارێکتەرێکی سینەمایی بوو، کەواتە ئیستاتیکا لەوێ وێنا دەکرێتەوە و لەتێکستێک تەوزیف دەکرێت، نەک کچێکی خاوەندار و خۆسازکەر بۆ بازاڕ، یان بۆ ئاهەنگ، کە سینەماکار، یان تەلەفزیۆنەکان ئامادەی دەکەن، ئەم شێوە تەماشاکردنە، پەیوەندی بە بینینەوە هەیە، چونکە ئەخلاقییەت بە پراکتیک دەسەلمێندرێت،

نەک تەنیا لە ڕێگەی تێکست، یان تیۆرەوە، بەڵام لە لای ڕۆشنبیر و نووسەری کورد و عێراقییەوە، ئەم بابەتە بە جیاواز دیقەتی وەرگرتووە، من بە پێچەوانەی ئەو دیدەی، کە گشتگیرە، دیدی من دیدێکی ڕەخنەگرانەیە بۆ هەموو شتێک، نەک بریندارکردنی کەسانی دی بەناوی ئەوەی فلان تێکست جوانە، یان فلان کاری هونەریی جوانە، لەکاتێکدا خولیا و مەبەستی پشت دەقەکە جوان نییە.

**سمکۆ محەمەد:** بەلای منەوە بەشێک لەناشیرنی جوانی تێدایە، بەڵام نەک ئەو ناشیرینییەی، کە لەتاکدا هەیە، وەختێک باسی بەفر دەکەین وەکو بەرهەمێکی زستانەی سارد، کە دیمەنی سرووشت جوان دەکات، بەڵام دەبێ بیر لەو کاتە بکەینەوە، کە بەفر چ ستەمێک لە ئینسان دەکات، وەختێک ڕێگە دەبڕێت و قات و قڕی و مەرگ لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت، ئەمە ڕوویەکی دیکەی بینینی مۆراڵییە بۆ ئیستاتیکا، کە من لەکتێبی ئیستاتیکا زانست و ئەخلاق نووسیومە، کەوابوو بەبێ لەبەرچاو گرتنی هەردوو دیوی جوانی و ناشیرنی بابەت و دیاردەی سرووشتی، ئەو ئامانجە ناپێکرێت کە لەڕووی تیۆرییەوە باس لە ئیستاتیکا دەکات، تۆ بۆچی ئەمە نابینی، کە بابەتێکی مۆراڵییە.

**عەباس عەبدوللا یووسف:** پێوانەیی بەشێکە لەدیدی من بۆ هەموو شتەکان، دیدی پێوانەییش بەشێکە لەتێڕوانینی ڕەخنەیی، چونکە هەموو دیدێکی گشت واتە کۆیە، بەڵام دیدی تاک پێوەرێکە لەنێو گشتدا هەم نامۆیە و هەم بەهەند وەرناگیرێت، بۆ نموونە ئەگەر کارێکی هونەریی، یان تێکستێک وەربگرین، تەماشا دەکەین چەندین دیدگا هەیە، ئایا ئەو دیدە هەڵدەبژێرین، کە لە فەزای گشتیدا هەیە و هەمووان بەشدارن تێیدا، یان دیدی تایبەتی، تایبەت بە مانای جیاواز لە گشت، پرسیارەکە ئەوەیە، ئایا نووسەران و ڕۆشنبیران ئەو دیدە تایبەتییەیان هەیە بۆ پێوانەیی لەبارەی دەقەوە، ئایا مشتومال کراوە، لەکاتێکدا وەڵامەکە نەخێرە، چونکە دیدی ڕاستگۆ و مۆراڵی ئەو کاتە تایبەتە، کە هەست بەترس نەکەین، ترس لە دابونەریت و سیاسەت و ئایین و دەسەڵاتە نادیارەکانی کۆمەڵگە، لێرەوە ئەو جۆرە دیدە وەکو ئایدیۆلۆژیا کاریگەری دەبێت، ئاخر خۆ ئایدیۆلۆژیا لە هەندێک جێ ئاشکرایە و هەندێک جاریش بزرە، ئەمەیان، کە مۆراڵییە ئاشکرایە.

**سمکۆ محەمەد:** هێشتە باسی ئەو مۆراڵەت نەکردووە، چونکە هەردوو دیدی تایبەت و گشت، هەمیشە لە ململانێدان، دیارە خۆ فەرزکردن لە ڕێگەی هێزەوە، یان خۆ فەرزکردن لە دیدی تایبەتدا چ کاردانەوەیەکی هەیە، بە بڕوای من ئەمە دەتوانێت هاوکێشەی هێزی فیکریی و عەقڵیی، لەگەڵ هێزی سیاسیی و کۆمەڵایەتیی لە یەکدی جودا بکاتەوە، ئەمەش پێویستی بە ڕیسک هەیە، کە تۆ هەمیشە خۆت لەم بوارە بەدوور دەگریت، بۆیە کێشەی من و تۆ کۆتایی نایەت.

**عەباس عەبدوللا یووسف:** نا من خۆم بەدوور نەگرتووە، بەڵام ڕەنگە وەکو تۆ نەچمە وردەکارییەوە و تایبەتمەندی خۆم بپارێزم، ئەمە خەسڵەتی منە بۆ تێڕوانین لەهەر کایەیەک بێت، تۆ جیاوازی هەم نووسەری و هەم ڕۆژنامەنووسی و جورئەتت هەیە و ناترسی، بەڵام من دوورتر دەڕوانم، بەوپێیەی ئەزموونم لەتۆ زیاترە، بابەتەکەش لەوە زیاتر ورد مەکەرەوە، ڕوون و ئاشکرایە، کە بۆچی من لە ١٠٠٪ تێڕوانینی خۆم نانووسمەوە، چونکە دەزانم ئەو فەزایەی تێیدا دەژیم، هەرسی ئەو تێڕوانین و دیدە تایبەتەی من ناکەن، بەتایبەتی کێشەی مۆراڵ، کە قورسترین بابەتی کۆمەڵگەیە بەهەموو کایەکانەوە، چونکە پێوەرێکی قورسە و هەر توێژ و کایەیەک بەشێوەیەک بەکاری دەهێنن، بۆ نموونە لە سیاسەت داب و ڕەفتار مانایەکی هەیە و لەئەدەبیشدا مانایەکی دیکەی هەیە.

**سمکۆ محەمەد:** بەڵام من هێشتە جەخت لەوە دەکەمەوە

*سمکۆ محەمەد:*
***بەلای منەوە بەشێک لەناشیرنی جوانی تێدایە، بەڵام نەک ئەو ناشیرینییەی، کە لە تاکدا هەیە، وەختێک باسی بەفر دەکەین وەکو بەرهەمێکی زستانەی سارد، کە دیمەنی سرووشت جوان دەکات، بەڵام دەبێ بیر لەو کاتە بکەینەوە، کە بەفر چ ستەمێک لە ئینسان دەکات***

*عەباس عەبدوللا یووسف:*
***پێوانەیی بەشێکە لەدیدی من بۆ هەموو شتەکان، دیدی پێوانەییش بەشێکە لەتێڕوانینی ڕەخنەیی، چونکە هەموو دیدێکی گشت واتە کۆیە، بەڵام دیدی تاک پێوەرێکە لەنێو گشتدا هەم نامۆیە و هەم بەهەند وەرناگیرێت***

کە مۆڕاڵ بایەخی سیستماتیکی هەیە، چونکە گشتی بوونی لە جیاوازییەکەوە دەردەکەوێت، ئەوەی، کە من و کەسێکی دی لەیەکدی جودا دەکاتەوە، مەسەلەی ویژدانە بۆ خۆشگوزەرانی، ژیانی مانادار، ئەدەبی بەهادار و نموونەیی، ئەم خوازەیە بە هەڵەبردنی کاری ڕاستەقینە نییە، بە ڕیالیستی کردنی ئەدەبیش نییە، بەڵکو چاو نەپۆشینە لەو نادادپەروەرییەی، کە لەنێو فەزای ئەدەبیی هەیە و هەموانیش دەیبینن. من هەموو شان خاڵی کردنەوەیەک بە نامۆڕاڵی دەبینم، شان خاڵی کردنەوە بەو مانایە نا، کە ململانێی مەحاڵ لەگەڵ دەسەڵاتی سیاسیی و بایۆ دەسەڵاتی لۆکاڵی بکەین، بەمانا ئەدەبییەکەی

> ***سمکۆ محەمەد:***
> ***یەکێک لەستایلەکانی نووسین، کە موتابەعەم کردووە، دەقی ئۆتۆماتیکییە، بەڵام زیاتر لەزاری تۆوە، زۆر تیرمی نووسینی ئۆتۆماتیکیم بیستووە، با لە ڕێگەی موناقەشەوە بگەینە ئامانج، مەبەست لە نووسینی ئۆتاماتیکی چییە؟***
>
> ***عەباس عەبدوڵلا یووسف:***
> ***نووسینی ئۆتۆماتیکی هونەری جۆرە ئەدەبێکە، کە لەجیهانی ئەوروپا هەبوو، بە دەستەواژە و تیرمی شاراوە دەست پێدەکات، بۆیە دەقنووسەکە پەنا دەباتە بەر دادائیزم***

مەبەستمە، کە وەکو پێشتر خۆت بەیانت کرد لە گوتاردا دەردەکەوێت.

**عەباس عەبدوڵلا یووسف:** من ئەو جۆرە ململانێیەم کردووە، بەڵام فۆکس نەکراوەتە سەری، بۆ نموونە کاتی خۆی لەسەر ڕوانگەم نووسیوە و هەر سێ گرووپەکەشم دابەش کردووە، گرووپی ڕوانگە و گرووپی کفری و گرووپی هەولێر، بەڵام کە نابیسترێت و نابێتە جێگەی موناقەشە ئەوە شتێکی دیکەیە، دواجار من لە تاکدێڕی زۆر باسی ئەو ململانێیەم کردووە، کە هەندێک جار نادیارە.

## گفتوگۆی نۆیەم

**سمکۆ محەمەد:** یەکێک لەستایلەکانی نووسین، دەقی ئۆتۆماتیکییە و موتابەعەم کردووە، بەڵام زیاتر لەزاری تۆوە زۆر تیرمی نووسینی ئۆتۆماتیکیم بیستووە، با لە ڕێگەی موناقەشەوە بگەینە ئامانج، مەبەست لە نووسینی ئۆتۆماتیکی چییە؟ من ئەو تێڕوانینەی (ئەندریە بریتۆن)م خوێندووەتەوە بەناوونیشانی (محل الرهونات) ئەمە وەکو تێهەڵچوونێک بوو بۆ بینای زمانەوانیی، کە بریتییە لە لوغز، هەروەها چارەسەری سایکۆلۆژی بە نووسین، بەڵام لە لای تۆ ئەمە ڕەنگی نەداوەتەوە، خوێنەر دەقی تۆ بخوێنێتەوە، فەزای بیرکردنەوەی خراپتر دەبێت، لەو زمانەش تێناگات با هەر فەرهەنگی بۆ بنووسیت، چونکە خوێنەر تێکست دەخوێنێتەوە، نەک فەرهەنگ، فەرهەنگ کاری ئەو خوێنەرانەیە، کە خەریکی وەرگێڕانن؟

**عەباس عەبدوڵلا یووسف:** نووسینی ئۆتۆماتیکی هونەری جۆرە ئەدەبێکە، کە لەجیهانی ئەوروپا هەبوو، بە دەستەواژە و تیرمی شاراوە دەست پێدەکات، بۆیە دەقنووسەکە پەنا دەباتە بەر دادائیزم، کە ساڵی ١٩١٦ هات، دواتر سریالیزم ساڵی ١٩٢٤ هاتە بوون، هەردوو ڕێچکە ئەدەبییەکە، کە هەڵوێستی سیاسیی لەگەڵ بوو، دژ بە جەنگ، زەمینەیان بۆ ئەوە خۆش کرد، کە هەدەفی ئەدەبی ببێتە جۆرە ئۆپۆزسیۆنێکی زمانەوانیی، هەروەها گوتارێک بۆ دەستەبژێری هونەری و ئەدەبیی دژی سیاسییە و دواجار نەبێتە فۆبیا، چونکە دەسەڵات ترسناکە، دەبێ ئەوەت لەیاد نەچێت، لەدونیا هاندان زۆر کەسی کردووە بەقوربانی (بەکوشت چوون) و کۆمەڵێک کەسی دی لەپەنایدا خۆش گوزەراون و بوونە بەخاوەنی دۆخە سیاسییەکە، یان دۆخە داسەپاوەی ئەفراندنەکە، ڕەنگە بابڵێن تۆ یەکێک بیت لەوانە، چونکە من دەزانم بۆچی بەو شێوەیە بیر دەکەیتەوە.

**سمکۆ محەمەد:** ئاخر با ئەوەش بڵێین، کە ستایلە و ستایلەکانی دیش، هیچیان موڵکی بیرکردنەوەی خۆماڵی خۆرهەڵاتی و کوردیی نین، بۆچی دەبێ ئێمە بەو لاساییکردنەوانە خۆمان وەکو داهێنەر و کێبەرکێکەری یەکەم ببینین و شانازی پێوە بکەین، هیچ شتێک نییە لە دونیای ئەدەب و هونەری کوردیدا نوێ بێت، یان موڵکییەتەکەی بۆ ناسیۆناڵ بگەڕێتەوە، هەموو ئەوانە لە خۆراواوە هاتوون.

**عەباس عەبدوڵلا یووسف:** دواجار (خراتی زەمین)

ئەوەی لە ئێمە دەوێ، گەر (پاناتی زەمین) یا (درێژاتی زەمین) هەبوایە، ئەمەش مەحاڵە (خڕاتی زەمین) ئەوەی لە خۆراواییەکانی ویستوە. لەهەر بارێک بێت، لە جیهانی ئەمڕۆ کەس لە سەتا سەت نییە خۆرهەڵاتی بێت، یا خۆراوایی. کەواتە: داهێنان و دروستکردنی ئەدەب و هونەر نووناسنامەیە.

## گفتوگۆی دەیەم

**سمکۆ محەمەد:** ترس بەشێکە لەدەرنەبڕینی ئامانج لەنووسیندا، تۆ یەکێک لەو نووسەرانەی، کە لە ڕێگەی دەربڕینی زمانی ڕاستەخۆ دەترسی، ئەم ترسە ئەگەر بەشێکی بریتی بێت لەوانە، یان ئەزموونی ژیان، بەشەکەی دی زێدەڕۆییە، چونکە بەو شێوەیە ترس لە بەردەم ئەدەبدا نەبووەتە کێشە و نەریت، مەگەر نووسەرێک دەستکاری پیرۆزییەکانی کۆمەڵگەی دواکەوتوو بکات، وەکو ئەوەی شێرکۆ بێکەس لە شیعردا کردی و فەتوایان لەسەری دەرکرد؟

**عەباس عەبدوڵلا یووسف:** تۆ ڕاست دەکەی دەق هەموو جار ناتباتە بەردەم دادگا، یان سزای ئەخلاقی، بەڵام ترس بۆ خۆی وەکو هەندێک جار سایکۆلۆژییە و هەندێک جاریش ڕاستی و واقیعییە و بوونی هەیە، واتە دەبێتە فۆبیا بۆ نووسەر، کە بێ بەرگرییە و بێ پشتی سیاسییە، بەڵام دەق ئاشکرا نابێت، بەڵکو دزە دەکات لەبری ئەوەی بە ڕێگەی سیمبولیزمەوە ئەو تێرم و وشانە بەرهەم دێنێ بۆخۆی، ئەمە دەرخەری مانایە بۆ دەق، بۆ نموونە ئاسمان بۆ تێکستی ئایدیایی مانایەکی ڕاستەوخۆیە، بەڵام بۆ تێکستی ئەپستراکتی، کە لیبرالیزمێک بینووسێت ناڕاستەوخۆیە، بەڵام ئەمە لە ڕێگەی خوێنەر و تێرامانکەری سیاسییەوە ئاشکرا دەکرێت، زۆر جار دەقی شاراوە بەم شێوەیە ئاشکرا کراوە، کە مانای پشتی دەقەکە چییە. ئەمە مەبەستی ڕەها نییە بۆ دەق، بەڵکو سەرسام بوونە بە ڕەهایی ناسینی دەق. ترسێک و بایەخێکی دی، بۆ ئەوەی دەقەکە سەرکەوتوو بێت، دەبێت پێداچوونەوەیەکی بیست جاری و زیاتری بۆ بکرێت، وەک ئەوەی من دەیکەم، کە بزانی دوو دیوانی قەدەغەکراوم هەیە لەسەردەمی ڕژێم وشەی (ترس)م بۆ دەکەیتە (ئازایەتی)

**سمکۆ محەمەد:** تا ئێستە هیچ ڕەخنە و ڕەخنەگرێکت بینیوە لەسەر دەقێکی کوردی بنووسێت، کە تۆ بڕوات وایە ئەوە ڕەخنەی کوردییە، کە من نەمبینیوە، چونکە من پێموایە ڕەخنە سیستمە، کورد لەدەرەوەی سیستم دەژی، ئەدەبەکەشی هەمان چارەنووسی کێشەی میللیگەراییەکەی هەیە، ئی کە سیستم نەبوو، دەبێت ئەو دیفاکتۆیە وەربگرین، کە ڕەخنەی کوردی لەو دۆخەدایە و ئەو مانایەی وەرگرتووە، باشە ئەگەر بترسین وەکو تۆ کردووتە بە نەریتی خۆت، دەبێ چیدی نەنووسین؟

**عەباس عەبدوڵلا یووسف:** من لێکدانەوەی خۆم هەیە بۆ ڕەخنە، بەتایبەتی بۆ هەموو جۆرە ڕەخنەیەک، یان خوێندنەوەی دەقێک، لێرە فرە ڕەخنەیی هەیە، فرە ڕەخنەییش خوێندنەوەی جیاوازیی و میتۆدی خۆی هەیە،

*سمکۆ محەمەد:*
***ترس بەشێکە لەدەرنەبڕینی ئامانج لەنووسیندا، تۆ یەکێک لەو نووسەرانەی، کە لە ڕێگەی دەربڕینی زمانی ڕاستەخۆ دەترسی، ئەم ترسە ئەگەر بەشێکی بریتی بێت لەوانە، یان ئەزموونی ژیان، بەشەکەی دی زێدەڕۆییە، چونکە بەو شێوەیە ترس لە بەردەم ئەدەبدا نەبووەتە کێشە و نەریت***

*عەباس عەبدوڵلا یووسف:*
***تۆ ڕاست دەکەی دەق هەموو جار ناتباتە بەردەم دادگا، یان سزای ئەخلاقی، بەڵام ترس بۆ خۆی وەکو هەندێک جار سایکۆلۆژییە و هەندێک جاریش ڕاستی و واقیعییە و بوونی هەیە، واتە دەبێتە فۆبیا بۆ نووسەر، کە بێ بەرگرییە و بێ پشتی سیاسییە***

بەتایبەتی بەمیتۆدی گادامیر، یان بارت، یان فینگشتاین، یان سۆسێر، یان دۆلۆزی، هەموو ئەمانە میتۆدی فیکرین بۆ خوێندنەوەی دەقی ئەدەبی، ڕێچکەی خوێندنەوە بە میتۆدەکە دەناسرێتەوە، کە ئایا ڕەخنەگرەکە کاری بەو میتۆدە کردووە، کە پێی وایە دەیزانێت.

زاراوەی ڕەخنە بە پراکتیکەوە هەقە کلێشەیی نەبێت، کە زۆربەی دەقخوێنی کورد بۆ خوێندنەوەیەکی کلێشەیی وەرگرتووە، تازە میتۆدەکانیش زوو دەبنە قاڵب من پێموایە دەربڕی ڕەخنەیی گەرانە بۆ ئاشکراکردنی جەوهەری دەق، لەکاتێکدا بەشێک لە ئەدیبی کورد، خۆیان لەو ستایلە دەدەن و چ نادەن.



# دوای ئەوەی باش شافاکم ناسی!

تازە ڕۆمانی چل ڕێساکەی عەشقی نوسەری بە ڕەچەڵەک تورکی نیشتەجێی بریتانیا ئەلیف شافاک دەرچوبوو، کریم و خوێندمەوە، زۆری پێ سەرسام بووم، لای خۆمەوە هانی مامۆستا جەلیل کاکەوەیسم دا بۆ ئەوەی بیخوێنێتەوە، دوای ئەوەی جەنابیان خوێندیانەوە، بڕیاری دا وەریگێڕێتە سەر زمانی کوردیی. پاش چەند مانگێک بە کوردیش بینیمان، زمانە کوردیەکەی ئوستاد جەلیل توانی بچێتە ئاستی زمانی خالید الجبیلی وەرگێڕە عەرەبییەکەی.

چل ڕێساکەی عیشق لە ڕووی تەکنیکەوە هەرە جوان بوو، لەوانەشە ئەم تەکنیکە لەوەوە سەرچاوەی نەگرتبێ، بەقەد ئەوەی بەر لەو، نوسەری دیش هەبوون بەم هونەرە ڕووداو و زەمەنی ڕوودانیان و کارەکتەرەکانیان خستووەتە نێو دەقی بالاوە و سەرئەنجام لە چنینی خەیاڵێکی ئەدەبیدا دونیایەکی دیکەیان بۆ نەخشاندوینەتەوە.

ئەوسا لەم ڕۆمانە کێشەیەکی خۆشەویستی زەمەنی نووسینی ڕۆمانەکەمان بە بەستنەوەی بە زەمەنی خۆشەویستی، بەڵام لە جۆرێکی دی و دەمێکی دیکە بۆ دەگێڕێتەوە، لەو دەمەدا چون تەواو لە کۆی کارەکانی شافاک شارەزا نەبووم و تەنیا ئەویانم خوێندبۆوە، هەربۆیە نەمتوانی هێڵە سەرەکییەکانی خەیاڵی هزرین و چنینی ژیانێکی شیمانەیی، کە ئەو لە بنچینەدا مەبەستی بوو بدۆزمەوە.



محەمەد تەها حوسێن

دوای ئەوەی زۆڵەکەی ئەستەمبوڵ و گوڵی ساردۆنیا و شیری ڕەش و شەرەف و سێ کچەکەی حەوا و کوڕە شەیداکە و دە خولەک و سی و هەشت چرکەکەیشم خوێندەوە، لەگەڵ ئەوانەشدا چەندین چاوپێکەوتن و موحازەرەکانیم لە یوتیوپ بینی و لێیان حاڵیبووم، گەیشتمە ئەو سەرنج و ڕایانەی ئێستەم و ڕشدیشم لەسەریان.

شافاک لەگەڵ دایکی، کە ناوی شەفەقە (شافاک) ژیاوە و هەر ئەویش بە تەنیا پەروەردەی کردووە، چونکە باوکی دوای لە دایکبوونی ئەلیف، لە دایکی جیابۆتەوە. بۆیە هەروەک لە شیری ڕەشدا باسی کردووە، ناوی دایکی خستۆتە شوێنی ناوی باوکی و ڕەچەشکێنیەکی فیمینیستانەی کردووە. لای من ئەمە هەڵوێستێکی بوێرانە بووە، بەڵام ژیانی کچێک لەگەڵ دایکی و کەوتنە نێو هەلومەرجێکی کۆمەلایەتی و دەروونی ئاوهاوە، زەمینەی حەز و سۆزی مێگەری و دواتر بەرگریکردن لە بڕیاری شونەکردنیان بۆ خولقاند، ئەو بڕیارەی، کە لە کتێبی یاداشتەکانی (شیری ڕەش) کە بە شێوازێکی ڕۆمانانە نووسیویەتی خستوویەتە ڕوو، تا ئەو دەمەی ڕازیبووە شوو بە کاک ئەیووب بکات، کە ڕۆژنامەوانێکی تورکە، زۆری پێچووە.

لە چالاکییە هزری و میدیاییەکانیدا، کە زیاتر لە زانکۆ و پلاتفۆرمە گشتییە میدیاییەکان دەیانکا، بە ئاشکراتر لە ڕۆمانەکانی ئەندامبوونی خۆی لە ڕێکخراوە بەرگریکارەکان لە هاوڕەگەزبازی و بە تایبەت لیسبێنیەت دەخاتە ڕوو، کە من پێموایە ئەگەر هاوسەنگانە و لە سۆنگە سۆسیۆکولتوریەکەیەوە ئەم هەڵوێستە گەلاڵە بووبێ ئاساییە، بەلام هی شافاک هێندەی پەیوەستە بە مەیل و ئارەزووەکانی خۆیەوە، هێندە پەیوەست نییە بە هەڵوێستێکی هزریی و ئەکادیمیک و دواتر

فەرهەنگییەوە، هەروەک ئەو کەسانەی تووشی تەلاسیمیا و ئۆتیزم و شێرپەنجە و .....تاد دەبن، باوک و دایک و کەسوکارە نزیکەکانیان ڕێکخراو و ئۆرگانی بەرگریکردن و هاوکاریکردنیان بۆ دەکەنەوە.

واچاکە هەر لێرە ئاماژە بە بۆچوون و لێکدانەوەیەکی خۆم بکەم سەبارەت بە (چل ڕێساکەی عەشق) و ئەوە بخەمە ڕوو، کە شافاک نەک مەبەستی نەبووە مەولانا جەلالەدین وەک سیمبولێکی جوانی مرۆڤایەتی بخاتە ڕوو، بەڵکو لە بچووککردنەوەی ئەودا بەرانبەر شەمسی تەبریزی پێگەی مەولانای وەک قوتبێکی زەمانی خۆی هێناوەتە خوار و وەک بەرکارێکی تەبریزی ڕۆڵی داوەتێ. ئەوە نییە تا ئەوی نەدی چ پێگەیەکی هەبوو، کە ئەوی ناسی بوو، بە چ شێت و شەیدایەک؟

ئەگەرچی خەڵوەتنشینی لە سۆفیگەریدا دیاردەیەکی ئیمانی و وجودیی باڵای ئەودیو سروشتییە، بەڵام خستنە خەڵوەتی مەولانا و شەمس بۆ ماوەی چل ڕۆژ لە شاری قونیەی شوێن ماڵی جەلالەدین لە تێگەیشتنی شافاکدا دەستکەوتنی ئەرگومێنت و بەڵگەیەکی مێژوویی و ئینجا ئیلاهییە بۆ پشتیوانی کردن لەو هاوڕەگەزبازیەی، کە ئەلیف بەرگری لێ دەکات، کە هەم لە ڕۆمانەکانی خەیاڵیزەی دەکات، هەمیش لە چالاکییەکانی تیۆریزەی کردووە. لای ئەلیف بە زمانێک لە زمانەکانی لەو نیازەی تێ دەگەین، یا باشتر وایە بڵێین لەو ئەگەرەی حاڵی دەبین، کە گوایە مەولانا و شەمس بەم سیناریزە و خەیاڵچنینە کەوتوونەتە داوی عیشقی یەکدی، هەم خوا و هەمیش خەڵکیان بۆ ئەم مەیلە تەقیوەوەی خۆیان خستۆتە گەڕ. لای شەفەق پەیوەندی مەولانا و شەمس ئەم گومانەت لا دێنێتە ئارا. لە ڕاستیدا ئەمەش لێدانی شافاکە لە گەورەیی و ئینسانبوونی مەولانا، نەک پێداهەڵدان و گەورەکردنی. ئەم لێدانە سەرەتا لە ساویلکەییدا دەردەکەوێت و دواتر لەو عیشقە شافاکییەی خراوەتە گیانی مەولانا، شەفەق دەیەوێ مێژووی پەراوێزنشین و هاوڕەگەزبازیی بە هەڵوێستە هەرە باڵا مەولانەییەکان بە تین و تاقەت بکا.

لە ڕۆمانەکانیدا لە زۆر شوێن ناوی کورد دەهێنێت، ئێمەش پێی شاگەشکە دەبین، کەچی لە فەنتازیای چنراوی خۆیدا هەمیشە کارەکتەرە کوردەکان پێگە و ڕۆڵی نزم و ناشیرینیان هەیە، وەک ستەم لێکراو دەریان ناخا، بەقەد ئەوەی وەک ویژدان ئازاریی دەیانخاتە ڕوو.

شافاک بەر لەوەی شەرەف لای کورد و سیستمە بەهاییەکانی بناسێ، باشتر بابەتی شەرەف لای نەتەوەکەی خۆی و ئەو نەتەوانە شارەزایە، کە لە خۆراوا لەگەڵیان ژیاوە، ئابڕوو سپیکردنەوە بە مانا کلاسیک و ترادیسیۆنیەکەی هەر بە تەنیا خەسڵەت و نەریت و ڕەفتارگەلێکی کوردانە نین بەقەد ئەوەی لای هەموو گەلانی موسڵمان و تەنانەت غەیرە موسڵمانیش هەر هەبوون. وەرگرتنی سامپلێک و دوان و سیان لە کورد، بۆ قسەکردن لەسەر بابەتی شەرەف، کە دەکرێ ڕۆمانی دە خولەکەکەی وەک بەشی دووەمی شەرەف بخوێنینەوە، نیازێکی پاکی ئینسانی ئەو دەرناخەن، ئەمە جگە لەوەی تاوانی هاوبەشیکردنی کوردیش وەک تورک لە قەلاچۆکردنی ئەرمەن دەخاتە پاڵ کورد. هەمووشمان دەزانین، لای ئەم ئیمپراتوریا و زلدەسەڵاتانە، کورد هەمیشە وەک سەرمایەیەکی بەشەریی بۆ پرۆسە و کردەکانی ئیرتیزاق بەکارهاتوون، هیچ کاتێک کورد لە سۆنگە و دەرچەی بڕیاری سیاسیی و ناوەندیی خۆیەوە بەشداری هیچ شەڕ و کردەیەکی جینۆسایدی نەتەوە و گروپەکانی دی نەکردووە.

یەشارکەمال هەزاران جار جوانتر واقیعیتر ژیانی کورد و تورک و دەوڵەتی تورکیای خستۆتە ڕوو، سووکایەتیشی نەخستۆتە پاڵ کەس، بامۆک-یش لە ڕۆمانی (بەفر) فەزایەکی جوانی ساز کردووە و کوردیش تیایدا کارەکتەرێکی جوانە و ناشیرین نییە.

بێشکچی ، کە لە



ئەلیف شافاک

کوردستان دەبێتە سەربازی دەوڵەتەکەی خۆی درۆزنی و کەچمیتودیی سیستمی سیاسیی و ئەکادیمی وڵاتەکەی بۆ ڕوون دەبێتەوە و لەوە حاڵی دەبێت، کە ئەوانەی لە نێویاندا لە کوردستان (خواروی خۆرهەڵاتی تورکیا) دەژی بە زمانێکی دیکەی غەیرە تورکی دەدوێن و کلتور و نەریتیشیان زۆر لە تورک جیایە، دواتر بێشکچی هەڵوێستە ئەکادیمیک و سیاسییەکانی لە وڵاتەکەی دەخاتە ڕوو، باجی ئەم هەڵوێستانەشی بە ١٧ ساڵ زیندانی دەداتەوە.

لای ئێمەیش هەڵوێستی بێشکچی وەرگەڕاوەتە سەر بارە سیاسییە ئەنتەرناسیونالییەکەوە، کە دوور و نزیک پەیوەندی بە هزری جەنابی بێشکچییەوە نییە و تەنیا و تەنیا شەڕی ئەو سۆسیۆلۆگە لەگەڵ نێوەندە ئەکادیمی، سیاسیی و پەروەردەییەکانی ئەو وڵاتە بووە، کە ڕاستی پێکهاتەی سۆسیۆکولتووری تورکیایان لەو شاردبۆوە.

لە ڕۆمانی (دە خولەک و سی و هەشت چرکە)دا شافاک لە شاری وان و دەوروبەری کەسایەتیەکانی ڕۆمانەکەی دروست دەکات. ڕۆڵی سەرەکی دەداتە کیژۆڵەیەک، کە دەبێتە قوربانی حەزە غەریزییە باش ڕامنەکراوەکانی مامی، ئەوە مامەی لە تەمەنی شەش ساڵیدا ئەتکی دەکا، دوای ئەوە لەم کردەوانەی بەردەوام دەبێت، تا تەمەنی کچە دەبێتە شازدە ساڵ.

بە ناچاریی، کچە بەرەو ئیستانبوڵ، کە بازاڕی بە میرات بەجێماوی سەرەکی لەشفرۆشی و کچ و کوڕبازی زەمەنی سوڵتانەکان و زەمەنی کۆمارییەکانیشە، سەری خۆی هەڵدەگرێت.

هەموو ئەوانەی دواتر لەگەڵ لەیلا، کە کیژۆڵە خزاوەکەیە بۆ نێو تۆڕی لەشفرۆشی، دەبن بە هاوڕێ، بەڵام هیچیان لە ڕەگەزی تورک نین. بەڵکو هەموویان عەرەب و فارس و خەڵکی سوریا، لوبنان و میسرن، ئەوانەی بکەرن لە کردەی کڕینی سێکسیدا، زۆربەیان تورکن و ئەوانەش کە بدەر و بەرکار، یان فرۆشیارن، کوردن، یان عەرەب، یان هیترن. ئەمەیان ناچێتە خزمەتی خەیاڵە مۆدێرنە بەرگریکارانەییەکەی شافاک، کە فرەیی و لیسبیێنیە، ئەم دیاردە سێکسواڵێتیە دیاردەگەلی مێژوویی جیهانیی و کلتووری و تەنانەت شارستانین و بۆ خەیاڵیزە کردنی کەرەستەکانی جگە لە کۆمەڵگەی کوردیی، لە کۆمەڵگەی تورکی و تەواوی نەتەوەکانی دیش هەن.

شەفەق لە ڕۆمانی شەرەف یەخەی خێزانێکی کوردی گرتووە، کە دوای چوونیان بۆ بریتانیا لەوێ کچێکی خۆیان لەسەر ئابڕووچوون دەکوژن، گوایە ڕوویان لە بەرانبەر دونیا سپی دەکەنەوە، ئەمە لە هەر کوێیەکی دونیا ڕوو بدات تاوانە و کارەساتە، بەڵام تا ئەو دەمەشی لەگەڵ دابێت، دیاردەی شەرەف و ڕوو سپیکردنەوە و ئابڕوکڕینەوە، یان شۆردنەوە لە تەواوی خۆرهەڵات و ئەفریقیا و تەنانەت ئەمریکای لاتینیش هەن و بگرە لە سایکۆلۆجیای پەرەسەندنی داریونیانەدا، بە دیاردەیەکی بژاردەکاریانەی سرووشتی خراوەتە ڕوو، تەرخانکردنی کارەکتەرە کوردەکان بۆ بینینی ئەم ڕۆڵە، هاوهەڵوێستی شەفەق نییە لەگەڵ ئێمەی خوێندەوار و لە نەریتە کلاسیک و توند و خوێناوییەکەی خۆمان، ئەو بە زمانێکی پۆست مۆدێرن بە کوردی گوتووە، ئێوە مایەی شەرمن هەم بۆ تورکیا و هەمیش بۆ دونیا، ئەمەیان خزمەتی شەفەق ناکات، لە بەرزبوونەوەی کارە ئەدەبییەکانیدا، بەقەد ئەوەی بەرزکردنەوەی ڕەگەز و نەتەوەکەی خۆی تیایە لە هزر و تێگەیشتنی ناسیونالیست و ڕەیسیستەکاندا.

من خوێندەوارێکی هیومانیستم، نە باوەڕم بە ناسیونالیزمی سیاسیی و ڕەیسیزم هەیە. نە باوەڕ و قەناعەتە هزرییەکانی خۆشم خستۆتە نێو چوارچێوەی ئایدیۆلۆژی جیاجیا و سەیر سەیرەوە.

لەوانەیە بەر لە زۆر کەس و زۆر لە مێژتریش هەرچی ئایدیۆلۆژیا بێ تووڕ و دوورم هەڵدابێ، هەرچی مرۆڤ هەیە لای من بەڕێزە و هەرچی نەتەوە و گرووپیش هەن ڕاستین و هەمان مافی ئینسانبوونی خۆمیان دەدەمێ، بە هەمان شێوە پەراوێزنشین و ژیاوەکانیش مرۆڤن بەڵام پشتگیریی لە مانەوەیان تا هەتایە لە پەراوێز ناکەم و پێموایە تا ماوەیەک پەراوێزبوون ئاساییە و دواتر، کە تاک، یان گرووپ، یان هەر دەستە و تاقمێک هەناسەی ئاسایی هاتەوە بەر و بووەوە بە هاوسەنگ، ئەوا دەخرێتەوە پاڵ گشت و داینامیکیانە لەنێو کۆدا هەڵدەسووڕێتەوە.

ئەم نووسینە لە ڕوانگەیەکی ئینسانیی و زانستیی باڵاوە نوسراوە و پەیوەست نییە بە ناسیونالیزم و هزر و بیرکردنەوەی چوارچێوە گیراوەوە و تەنیا خستنەڕووی ستراتیجێکی شافاکە لە دەرکەوتن و بوون بە دیاردە لەسەر حیسابی نەتەوەیەک، کە نەک تاکە بەرگریکارێک لە خۆی، لەم دونیایە شک نابات، بەڵکو خۆیشی بەرگری پێ لە خۆی ناکرێت، هەربۆیە ئێشە ئەدەبییەکانی شافاک، هەم شەبەقییەتێکی ئەلێکترایانەیە بۆ دایکی، هەمیش ڕقێکی ئۆدیبیانەیە لە باوکی، هەمیش ڕقێکی تورکانەیە لە باوکە تورکەکانی، کە چۆن نەیانتوانیوە ترادیسیۆنی کوردەکانی ئەم وڵاتە وەک خۆیان لەبەریان داماڵن.

# شیعر بە ڕاڤەکردنی سێنتیمنت
# ئیسماعیل بەرزنجی وەک نموونە

عەبدولموتەلیب عەبدوللا

گەڕانەوەی ئیسماعیل بەرزنجی بۆ هەستی غەریبی، هەر تەنیا شیعریی نییە، ئەو جەختکردنە لە گەڕانەوە بۆ ڕابردوو، دەکرێ وەک بارێکی دەروونی تەماشای بکەین. کەواتە پرسیارەکە ئەوەیە، ئایا خۆ نەگونجاندن و دڵتەنگی دەروونی وا دەکات لەنێو نیشتمانی خۆت هەست بە غەوارەیی بکەیت؟ یان غەریبوونی نیشتمان، وا دەکات بگەڕێتەوە بۆ باری دەروونی و ڕابردوو؟ ئایا ئاوارەیی و هەتەرەبوون لە ماڵ وا دەکات، هەست بە لە دەستدانی ئازیزان بکەیت؟ یان لە دەستچوونی ئازیزان وا دەکات گۆرانی خەمبارانە لە ماڵی خۆتدا بڵێیت. ئەوەی غەریبە نیشتمانە، یان شاعیر باری دەروونی باش نییە و ناگونجێ؟

بابلۆ نیرۆدا دەڵێت: لەوەتەی هەم هەرگیز هەستم نەکردووە، کە «شیلی» نیشتمانی منە، من هێندە نامۆم بە وڵاتەکەی خۆم و دونیا، ئەسڵەن من ناچمە سەر وەچەی ئادەمیزاد، من منداڵی مانگم.

دەشێ جیاوازیی نێوان ئیسماعیل بەرزنجی و بابلۆ نیرۆدا ئەوە بێت، یەکەمیان نیشتمانێکی غەریبی لەنێو خۆیدا هەڵگرتبێت، دووەمیان هەستێکی دیکەی بەرانبەر نیشتمان هەبێت، یەکەمیان خۆی بە کوڕی ڕابردوو دابنێت و دووەمیان خۆی بە منداڵی سەردەم بزانێت، یەکەمیان خەمی خۆرهەڵاتنی هەبێت، دووەمیان خەمی خۆراوابوون.

> ***دەشێ جیاوازیی نێوان ئیسماعیل بەرزنجی و بابلۆ نیرۆدا ئەوە بێت، یەکەمیان نیشتمانێکی غەریبی لەنێو خۆیدا هەڵگرتبێت، دووەمیان هەستێکی دیکەی بەرانبەر نیشتمان هەبێت***

(١)

ئیسماعیل بەرزنجی خەمی مانا پێش دەخات، لە پشت هەموو شیعرێکی دا بونیادێکی حیکایی و خەمی لە دەستچوون و لە دەستچوونی ئازیزانی هەیە! شاعیری سێنتیمنتاڵ (سۆز) هەستی لیریکی بە ویستی گوتن و خەمی دەروونەوە گرێ دەدات، ویستی گوتن بە خۆشەویستی مانا و چێژەوە دەلکێنێت، پێمان دەڵێت جەوهەری ئاگامەندی بە گوتنی جوان و ماناکانی سێنتیمنتاڵەوە بەندە، تایبەتمەندی جوانی مرۆڤ لە گەڕانەوە بۆ ڕابردوو سەرچاوە دەگرێ، مرۆڤ دەژی بۆ ئەوەی هەنگاو بەرەو گوتن و مانا بنێت. جوانی گوتن و جوانی مانا بە هەستی سێنتیمێنتاڵەوە گرێ دەدات، بایەخ بە فەزا، مانا و ڕیتمی شیعریی دەدات، بەهای هونەری شیعر لە ئاوێتەبوونی هەستی گەڕانەوە بۆ ڕابردوو و ویستی مانا و ڕیتمی تێگەیشتن هەڵدەگرێتەوە، دالی حەقیقی لای شاعیری سێنتیمنتاڵ (سۆز) لە سۆز و جوانی و گەڕانەوە و تەماشاکردنی

خەمە کەسییەکاندایە، لە نێو ڕابردوودا هەست بە خۆشی دەکات و شانازی بە ژیانی ڕابردوو دەکات، هەمیشە بیر لە پیری و مردن دەکاتەوە.

(٢)

گوێ لە ئاستی گوتن بگرن، سەیری ئاڵای خەم بکەن، کە بەردەوام لە شیعری سێنتیمنتاڵ لە هەڵکشاندایە، ئاستی گوتن و خەمی هەڵکشاو پێمان دەڵێن ئیسماعیل بەرزنجی بە تەنیا خەون دەبینێت، دەسووتێت بێ ئەوەی لە بەرانبەر جوانی، جوانی ئافرەت دەم بکاتەوە، دەسووتێت بێ ئەوەی لە بەرانبەر ڕابردوو، لە بەرانبەر لە دەستچوونی ئازیزان (کە لە جوانی گوتن و جوانی مانادا نەفی کراون) جگە لە بێدەنگی هیچ بڵێت!



ئەو کەسەی لەگەڵ کتێب و خۆرهەڵات و ڕابردوو شەونخوونی دەکات، هەمیشە هەوڵ دەدات دوورەپەرێزی و تەنیایی بە هەرای بێدەنگیی پڕ بکاتەوە! ئەوە تەنیاییە، خەونبین و بێدەنگیی بە یەکەوە دەلکێنێت، ئەوە سرووەی دەنگە هەستی تەنیایی کەم دەکاتەوە، ئەوە سۆزی شیعرە وا دەکات تەنیایی، خەونبین زێتر وەک بێدەنگیی هەستی پێ بکرێت، سۆزی شیعر و خەونبین وەک تەنیایی بێدەنگی دەڕازێنێتەوە، تەوێڵی خوێنەرانیش ڕۆشن دەکاتەوە. بەمجۆرە شاعیری نۆستالجیا پێی وایە سۆزی شیعر بۆ زۆرێک لە خەونبینان وێنەی دیاری تەنیاییە.

(٣)

***گوڵەکان دەبەمەوە شێخی چۆڵی***

***لە ژوور سەری گۆڕغەرییەکە***

***پەرداخەکە پڕ دەکەم لە ڕەشەڕێحانە***

***پێش زەردەپەڕ***

***تەڤسێک بۆ گریان***

***تەڤسێک بۆ ڕەشەڕێحانە سازدەدەم***

***فریشتەیەکی باریکەلە***

***کە لە ڕەنگاڵەیەکی باڵشکاو دەکات***

***دێتە سەر شانی تەپوتۆز لێنیشتووم***

***سەربووردەی مردنێکی ڕانەگەێنراوم***

***بۆ دەگێڕێتەوە و پێم دەڵێ***

***هەی غەریب خۆت، لە مردن خۆشتر مردنە***

***ل٥٣-٥٤ پەست، ئیسماعیل بەرزنجی.***

(٤)

ئێمە مرۆڤین و بە یەکەوە پەیوەستین، دنیای هەستپێکراوی مرۆیانە، مێژووبوونێکی دەرەکی نییە، بەڵکو خودیی و ناوەکییە، دەبێ بزانین ئەو خودیی و ناوەکییە چ مانایەکیان لەخۆدا هەڵگرتووە؟ هەموو ئەوانە لە ئەدەبدا بەو مانایە دێن، کە ئێمەی مرۆڤ دەکەوینە نێو زمان، بەو مانایەی، کە زمان ماڵی بوونە، کەواتە جیهان لە ئێمە دابڕاو نییە، جیهان، ئێمە

پێکدەهێنێت و ئێمەش لە ڕێگەی ماناوە جیهان پێکدەهێنین، بوونی ئێمە بەشێکە لەو، کەواتە هاوسۆزیی کۆمەڵایەتی و هاوژیانی کۆمەڵایەتی و پەیوەندییە گەرم و گوڕەکان بەشێکن لە هەستی مرۆییانە، بە دیوەکەی دیکەش دا ڕەگەزێکە لە ڕەگەزەکانی شیعر.

دەمەوێت بڵێم دونیای ئەدەب و فیکر نە دونیای شتە باوەکانە، نە دونیای داهاتوو، نە دونیای هەنووکەی لە دەستچوو. دونیای ئەدەب و فیکر نە سەر بە ڕابردووە، نە ئێستە.

دونیای ئەدەب و فیکر هیچ کاتێک ناکەوێتە دەرەوەی مرۆڤەکانەوە، مرۆڤیش هەمیشە لەنێو ئێستە و ڕابردوو بە شێوە جیاواز و پرسی جیاواز و تێگەیشتنی جیاواز، هاوژیانی جیاواز دەکات.

قسەکردن لە شیعری خۆرهەڵاتی، بەوەی توانیویەتی ڕەگەزی سێنتیمنتاڵ لە هەموو ڕەگەزەکانی دیکە زێتر بەرجەستە بکات، وەک دەزانین ئەو بەرجەستەکردنە لە شیعری خۆراوایی پێچەوانە دەبێتەوە. بەڵام هەردووکیان کێشەی خۆیان هەیە!

مەعریفەی شیعریی پەیوەندیی بە بەرز ڕاگرتن و هاوگونجانی ئاستی جوانیی و مانا و چێژ هەیە! ئیبداع هەرگیز ڕەگەزێک ناخاتە پێش یەکێکی دیکەوە، بەڵکو لە بەرز ڕاگرتنی ئاستی جوانیی کۆی ڕەگەزەکان دێتە بەرهەم. کەواتە نە سێنتیمنت بە تەنیا شیعر بەڕێوە دەبات، نە فیکر. هارمۆنیەتی ڕەگەزە شیعرییەکان نەبێت، باڵا دەستی هیچ ڕەگەزێک قابیلی قبوڵ نییە.

(٥)

***وەتەن***

***بە هەموو غوربەت و بێزاریی خۆیەوە***

***وەک سەرکردەیەکی تێکشکاو***

***لەبەر دەرگای (کیانی ویران)مان دەوەستێ***

***گەردەلوولی بێزاری***

***بە چوار دەوری (گۆڕی غەریب)ماندا هەڵدەکات***

***و***

***چرایەکی کز***

***لە (ژووری لاتەریک)مان دەکوژێتەوە***

***ئێمە هەمیشە***

***بە (کیانی ویران، گۆڕی غەریب، ژووری لاتەریک)***

***دەچینە ناو عەدەمەوە.***

ل٥٧-٥٨ پەست، ئیسماعیل بەرزنجی.

(٦)

لە دونیای ئەدەب و نووسین دا شتێک بە ناوی ڕەسەنایەتی بوونی نییە، چونکە داهێنان هەمیشە بڕوای بە سنووردارکردن و گەڕانەوە بۆ سەرچاوە و چوارچێوەدانان و جوگرافیای دیاریکراو نییە، جوانیی ئەدەب لە تێپەڕاندنی سەرچاوەکان و سنوورەکان دایە، لە تەجاوزکردنی ڕەنگ و ناسنامە و خودەکان دا دونیای خۆی بە شێوەیەکی هارمۆنی هەڵدەنێت. بۆ ئەوەی دەق ببێتە موڵکی هەمووان و ئەوی دیکە و بەشداری لە داهێناندا بکات، ئیدی لێرەوە منی (دیکارت)ی هەڵوەشاوە و لەشوێنی ئەو چەندان (من) هاتنە قسەکردن. دەقی ئیبداعی هەرگیز خاوەندارێتی قبوڵ نییە، چونکە خاوەندارێتی لە ڕێگەی ئەوەی، کە هەیەتی کەڵەگایی دەسەپێنی، ئەگەرچی سەرەتای خاوەنداریەتی بەپێی پێداویستییە کۆمەڵایەتییەکان بووە و لە زەرورەتێکی ئاسمانیی سەری هەڵداوە، بەڵام لە جەوهەردا زۆرداری بووە و پاشان بە پیرۆز کراوە. لە دونیای ئەدەبدا ئەوەی کەسایەتی خودیی و ناسنامە بونیاد دەنێت، خوێندنەوەیە. خوێندنەوە بەرەو ئاگامەندییەکی خودیی قوڵترمان دەبات و یارمەتیمان دەدات، بۆ ئەوەی بتوانین بگەینە دونیابینییەکی قوڵتر لە بارەی ناسنامەی تایبەتیمانەوە.

دواجار ئەوەی خودیی مرۆڤایەتی هەڵدەنێ ئازادیی و خۆشەویستیی و پەیوەندییە.

• سێنتیمنت_ سۆز

> **دەمەوێت بڵێم دونیای ئەدەب و فیکر نە دونیای شتە باوەکانە، نە دونیای داهاتوو، نە دونیای هەنووکەی لە دەستچوو**

## وڵامێکی دۆستانە بۆ تاریق کارێزی هاوڕێم

# ڕۆمان بە ئاسانی نانووسرێ

بەدواداچوون و وەڵامدانەوە

## خوێندنەوەیەکی قووڵتر بۆ دەقی کوێت



تاریق کارێزی




112 دیوان ژمارە (٢٤) جوزەردانی ٢٠٢٣



د. نەجم ئەلوەنی

کاتێ ڕۆمانێک دەخوێنینەوە، سەرەتا پەی بە واتا گشتییەکەی دەبەین. ئەم قۆناخەش لای خوێنەری ئاسایی کۆتایی پێ دێ و چی دی ئەو ڕۆمانە ناخوێنێتەوە بۆ ئەوەی پەی بە لایەنە هونەرییەکانی ئەو بەرهەمە بەرێ. بەم جۆرە خوێنەرە دەگوترێت، خوێنەری بەکارهێن. بەڵام جۆرێکی دیکەی خوێندنەوەی ڕۆمان هەیە کە ئەویان شۆڕبوونەوەیە بەنێو واتاکانی دەقی ڕۆمان دا. لەم قۆناخەش دا خوێنەر دەبێت بزانێ ڕۆمان هەمیشە دوو واتا لە خۆی دەگرێت: مانایەکی ئاشکرا و مانایەکی قووڵ، کە پێویستی بەوەیە ئاستی ڕۆشنبیریی خوێنەر باڵاتربێ و خاوەنی پاشکۆیەکی مەعریفی فراوان بێ بۆ ئەوەی ئەو مانا شاراوانە بدۆزێتەوە. بێ ئەم توانایەش هەرگیز خوێنەر ناگاتە قووڵایی دەقەکە و زەینی تەنیا لە چوارچێوەی واتا ئاشکراکان دا دەسووڕێتەوە. دوا قۆناخی خوێندنەوەی ڕۆمان دوو ئاراستە لە خۆی دەگرێت: یەکەمیان گەڕانە بەدوای ئەوەی نووسەر لە دەقەکەدا نەی درکاندووە و پێویستە خوێنەر بیدۆزێتەوە، یان بە خۆی دایمەزرێنێ، بەم جۆرەش کارلێکی نێوان خوێنەر و دەق دروست دەبێ و ئەوەی نووسەر نەیگوتووە، دەبێ خوێنەر دەستی بگاتێ و بە خۆی بنیاتی بنێ. بەهۆی ئەمەشەوە تیۆری خوێندنەوە سەری هەڵداوە. لە قۆناخێکی دیکەی خوێندنەوەدا وەک ژاک دریدا لە پەرتووکی نووسین و جیاوازی دا شیکاری بۆ کردووە، دواخستنی واتایە. بەمانایەکی دی هەندێک وشە و دەستەواژە و دەربڕین هەن بەردەوام ناگەنە قۆناخی کۆتایی، وەک کەوانەی بەتاڵ دەمێننەوە و پێویستە خوێنەر ئەوپەڕی زیرەکی و هۆشیاری خۆی بخاتە کار بۆ گەیشتن بە گونجاوترین ماناکانی ئەو وشە و دەستەواژە و دەربڕینانە و پڕیان بکاتەوە بەو مانایانەی دەشێن بۆ ئەم مەبەستە شیاوبن، بەتایبەتی لەو ڕۆمانانەدا، کە نووسەر زمانێکی قووڵی پڕ خواستن بەکاردەهێنێ، چونکە هەمیشە خواستن کۆمەڵێ واتا لە خۆی دەگرێت، کە هیچ کەسێک ناتوانێ بگاتە دوا واتای وشە و دەربڕینەکانی.

بەهۆی ئەو دۆخانەی نووسینەوە، دیاردەی فرە واتایی و فرە ڕاڤەیی دەق هاتووەتە ئاراوە. هەر ڕۆمانێ تەنیا یەک واتا بەدەستەوە، بدات ئەوا بە دەقێکی کاڵ و کرچ لە قەڵەم دەدرێت. دەقی کاڵ و کرچیش، دەقێکی ئایدیۆلۆژییە و دیلی یەک ڕوانگەیە، کە نووسەری کەم ئەزموون لە بواری ڕۆمان دا پەنای بۆ دەبات.

هەرکەسێک شارەزای دونیای ڕۆمان بێ و ئەم پەرتووکەی کاکە کاریزی بخوێنێتەوە، کە بەناوی (کوێت) چاپی کردووە، تێ دەگات هێشتا نووسەری ئەم پەرتووکە لە ئەلف و بێی ڕۆمان تێنەگەیشتووە و لەبەر ئەوەشە نەیزانیوە لەژێر ناوی کام ژانری ئەدەبیدا بە خوێنەری بناسێنێ. من پێشتر لە گۆڤاری (دیوان) ژمارە (٢٣)ی نیسانی (٢٠٢٣) وتارێکی ڕەخنەییم لەسەر ئەو پەرتووکە بەناوی (جەنگی کوێت لە گەواهی نامەکەی تاریق کاریزی دا) بڵاوکردووەتەوە بە مەبەستی ئەوەی ڕۆشنایی بخەمە سەر ئەو پەرتووکە. دواتر هاوڕێی بەڕێزم کاکە کاریزی بە وتارێک لە ژێرناوی (خوێندنەوەیەکی قووڵتر بۆ دەقی کوێت) لە ژمارە (٢٤)ی ئایاری (٢٠٢٣)ی هەمان گۆڤاری ناوبراو وڵامی ڕەخنەکەی منی داوەتەوە. ئەم کردارەش زۆر سروشتی و زۆر باشە، بەڵام تەنیا بۆ داکۆکی کردن لە نووسینەکەی، لە چەند شوێنێک

**کاکە کاریزی لە وڵامی ڕەخنەکانی من دا پەنا بۆ قسەی کاسبکارێک و شۆفێرێکی تەکسی دەبات، بۆ ئەوەی بۆ من و خوێنەرانی بسەلمێنێ، کە گەواهینامەکەی نەک تەنیا ڕۆمانە، بەڵکو تەنانەت ڕۆمانێکی سەرکەوتووشە**

ئاماژەی بەوەداوە، کە گوایە بەگومانە لەوەی من تەواوی ئەو پەرتووکەم خوێندبێتەوە، ناچاری کردم جارێکی دی بەم وتارە ڕەخنەییە وڵامی بەڕێزیان بدەمەوە.

ئاماژەی بەوەداوە، کە گوایە من تەنیا لەڕێی چەند بۆچوونێکەوە، کە دەکەونە لاپەڕە (٢٦٣) و (٢٩٤) وە، هەڵسەنگاندنم بۆ پەرتووکەکەی ئەو کردووە، بێ ئەوەی بە ڕوونی و بە ئاشکرا ئەو بۆچوونانە بخاتە بەر دیدی خوێنەرانی وتارەکەیەوە، بۆ ئەوەی ڕاستی بۆچوونەکانی من لە خوێنەر بشارێتەوە. لەو دوو لاپەڕەدا من دوو بۆچوونی ئەوم دەستنیشان کردووە، کە خۆی لە پەرتووکەکەی دا بەکاری هێناون. لە لاپەڕە (٢٦٣) دا بە خۆی دەڵێ (لەم ڕۆمانە دا) و لە لاپەڕە (٢٩٤) یشدا دەڵێ (هەرچی گوتراوە گەواهی و ئەزموونی تاکە کەسێکە) کە لێرەدا مەبەستی لە خۆیەتی، چونکە بەخۆی

لەو کاتەدا سەربازبووە و شایەتێکی زیندووی ڕووداو و کارەساتەکانی ئەو جەنگە دۆڕاوە بووە. واتە خودی نووسەری پەرتووکەکە نەیزانیوە ئەوەی نووسیویەتی بیخاتە خانەی چ جۆرە ژانرێکی ئەدەبییەوە. بێجگە لەوە درکی بەوە نەکردووە جیاوازی چییە لەنێوان زاراوەی (ڕۆمان) و زاراوەی (گەواهینامە) بۆیە وەکو یەک لەم بەرهەمەدا بەکاری هێناون. دانانی زاراوەی ڕۆمان لەسەر بەرگی هەر پەرتووکێک وامان لێ دەکات وەک دەقێکی خەیاڵی وێناکراو خوێندنەوە بۆ ئەو بەرهەمە بکەین و لەڕێی لۆجیکەوە هەڵسەنگاندن بۆ قسەو ڕەفتاری کارەکتەرەکان نەکەین. ئەمە یەکێکە لە خەسڵەتە گرنگەکانی دەقی ڕۆمان. بۆ نموونە دەکرێت لە ڕۆمان دا مردوو قسە بکات، درەخت بزێ، یان ببێتە ئافرەت، بەرد پێبکەنێت، مرۆڤ بفڕێ. کەچی لە ڕوانگەی لۆجیکەوە

**هەر ڕۆماننووسێکیش خوێنەری ناچارکرد بۆ ئەو مەبەستانە بگەڕێتەوە بۆ سەرچاوەکانی دەرەوەی ئەدەب، بە یەقینی دەڵێین ئەو نووسەرە لەپیشەی ڕۆماننووسین نەگەیشتووە و وەک مێژوونووسێک سەودای لەگەڵ ژیاننامەی کارەکتەرەکانی دا کردووە**

هەرگیز ئەوانە پەسند ناکرێن. لەبەر ئەوە ئەگەر وەک ڕۆمان بڕوانینە کارەکتەرەکان، تەنانەت ئەگەر یەکێک لەوانە ناوی ناپلیۆن بێت، یان قەیسەری ڕووسیا، یاخود میر و پاشایەکی کورد بێت، ئەوا ئێمە لە ڕەخنەی ڕۆمان دا، بەهەمان شێوەی ڕاستەقینەی ئەو کەسانە بیر لە قسە و ڕەفتار و کردەوەکانی ئەوان ناکەینەوە. بە هاتنیان بۆنێو ڕۆمان دەبنە کۆمەڵە بوونەوەرێکی زمانیی و هونەریی و پەیوەندییان لەگەڵ خودی دەرەوەی دەقی ڕۆمان دا نامێنێت. ئیدی ئەوان ئەو کەسانە نین، کە مێژوونووسەکان باسیان دەکەن. ڕۆمان ناچار نییە وەک مێژوونووس بیر لە کارەکتەرەکانی بکاتەوە و ئەوە بگێڕێتەوە، کە مێژوونووسێک لە بارەی ئەوانە گوتوویەتی. لەبەر ئەم هۆیە خوێنەری ڕۆمان پێویستی بەوە نییە بگەڕێتەوە بۆ سەرچاوە مێژووییەکان بۆ یەکلاکردنەوەی ڕاستی

و ناڕاستی بۆچوون و قسەکانی ئەو کارەکتەرانە. هەر ڕۆماننووسێکیش خوێنەری ناچارکرد بۆ ئەو مەبەستانە بگەڕێتەوە بۆ سەرچاوەکانی دەرەوەی ئەدەب، بە یەقینی دەڵێین ئەو نووسەرە لەپیشەی ڕۆماننووسین نەگەیشتووە و وەک مێژوونووسێک سەودای لەگەڵ ژیاننامەی کارەکتەرەکانی دا کردووە.

ئێمە بۆ هەڵسەنگاندنی دەقی ڕۆمانێک پەنا دەبەینە بەر زانایانی زانستی گێڕانەوە و پشت بە میتۆدێکی ڕەخنەیی دەبەستین، کە ڕێمان بۆ ڕۆشن دەکاتەوە. دەبێ ڕۆماننووسانیش وەک ئێمە شارەزاییان لە بارەی ڕەخنەی ڕۆمان و توێژینەوەی زانا ناودارەکانی بواری گێڕانەوە ناسی هەبێت، وەک باختین و لۆکاش و تۆماشیفیسکی و بارت و ژێرار ژنێت و تەنانەت ئەو نووسینانەی گەورە ڕۆماننووسەکانی دونیا سەبارەت بە ئەزموونی ڕۆماننووسین و تیۆری ڕەخنەی ڕۆمان نووسیویانە، وەک فۆرستەر و جیرمی هۆترن و پێرسی لەبووک و ئۆرهان پاموک و گابریل گارسیا مارکیز و میلان کۆندێراو ...هتد. بێ خوێندنەوەی ئەمانە زۆر دڵنیام ناتوانی دەقێکی سەرکەوتوو بنووسی.

جارێک کەسێک دەچێتە لای مارکیز و داوای لێ دەکات فێری بکات چۆن ڕۆمان بنووسێت، ئەویش لە وڵامدا پێی دەڵێت جارێ برۆ هەزار ڕۆمان بخوێنەوە ئەوسا وەرە قسەیەکی لێ دەکەین. کەچی کاکە کارێزی لە وڵامی ڕەخنەکانی من دا پەنا بۆ قسەی کاسبکارێک و شۆفێرێکی تەکسی دەبات، بۆ ئەوەی بۆ من و خوێنەرانی بسەلمێنێ، کە گەواهینامەکەی نەک تەنیا ڕۆمانە، بەڵکو تەنانەت ڕۆمانێکی سەرکەوتووشە. من لەگەڵ ئەوپەڕی ڕێزم بۆ ئەو دوو کەسە و کاکە کارێزی، دەڵێم ئەوە باشترین بەڵگەیە، کە تۆ نازانی هەڵسەنگاندنی ڕۆمان کارێکی زۆر زەحمەتە و پێویستی بە دەیان ساڵی خوێندنەوە و کەڵەکە کردنی زانیارییەکی فراوانە. بێ ئەمەش هەرگیز ناکرێت کەسێک ببێتە ڕەخنەگر و خوێنەر پشت بە بۆچوونەکانی ببەستێت بۆ هەڵسەنگاندنی ڕۆمانێکی دیارکراو.

کاکە کارێزی وادەزانێت گێڕانەوەی ڕووداو، یان بەکارهێنانی دیالۆگ و هەبوونی چەند کەسێک، کە پێکەوە گفتوگۆبکەن، ئیدی ڕۆمان لە دایک دەبێت. بەڵام درکی بەو ڕاستییە زۆر سادەیە نەکردووە، کە هەموو قسەیەکی ڕۆژانە دەکرێت گێڕانەوەی ڕووداوێک لە خۆی بگرێ و لەم ڕووداوەش دا بەلای کەمەوە

پێویستە دوو کەس، یان زیاتر بەشداری تێدا بکەن. کەواتە ڕۆمان تەنیا بریتی نییە لە ڕووداو و گێڕانەوەی ڕووداو و گفتوگۆی کەسەکان لەسەر ئەو ڕووداوە. گرنگترین ئەرکی ڕۆماننووس چۆنیەتی بنیاتانی هونەری گێڕانەوەیە. گێڕانەوەش سەرکەوتوو نابێت، ئەگەر توخمە پێکهێنەرەکانی وەک کارەکتەر و ڕووداو و شوێن و کات لە ڕووی هونەرییەوە لە وێنەی ڕاستەقینەی خۆیان جیاواز نەبن. واتا نابێت کارەکتەر هاوشێوەی کەسەکانی واقیع بێ، ڕووداو وێنەیەکی کۆپیکراوی ڕووداوەکانی ژیانی ڕۆژانە بێ. هەروەها نابێت شوێن بریتی بێت لە وێنەیەکی دەقاودەقی شوێنە ڕاستەقینەکانی سەر زەوی، چونکە ڕۆمان پەرتووکێکی جوگرافی، یان ڕێبەرێکی گەشتیاریی نییە، ڕۆمان دەقێکە خەیاڵی نووسەر بەرهەمی دێنێت، ئەگەرچی لەم پرۆسەیەدا دەکرێ بە شێوەیەکی هونەریی سوود لە واقیع وەربگرێ. کاتیش هەمان کاتی سروشتی نییە و ڕۆماننووس دەتوانێت بە گوێرەی جووڵەی کارەکتەر و پەرەسەندنی ڕووداوەکان پاش و پێشیان پێ بکات، بەڵکو زۆرجار کات دەبێتە دیاردەیەک و بە گوێرەی باری دەروونی کارەکتەرەکان کورت و درێژ دەبێ. لەم دۆخەش دا ڕۆماننووس کۆمەڵێ تەکنیک بۆ ڕێکخستنی کات بەکاردەهێنێت، وەک کورتکردنەوە، لابردن، وەستان.

کاکە کارێزی وەک ڕۆژنامەنووسێک هەوڵیداوە ڕووداوەکانی جەنگی کەنداوی دووەم بۆ خوێنەر بگوازێتەوە، نەک وەک ڕۆماننووسێک، کە بە ئاگایی و هۆشمەندییەکی زۆرەوە ڕووداو دروست دەکات، چونکە کاری ڕۆماننووس گواستنەوەی ڕووداو نییە، بەڵکو دروستکردنی ڕووداوە. تەنانەت ئەگەر ویستی ڕووداوێکی ڕاستەقینە بگێڕێتەوە، هەرگیز وەک خۆی وەری ناگرێت، بەڵکو بەسوود وەرگرتن لە ڕۆشنبیریی هونەریی و ئەزموونەکانی لە بواری نووسین دا ئەوەندە گۆڕانکاری تێدا دەکات، کە هیچ لە ڕووداوە ڕاستەقینەکە نەکات. هەروەها خەیاڵی خۆی دەخاتە کار بۆ دامەزراندنەوەی ئەو ڕووداوە، بۆ ئەوەی شێوە و بنیاتێکی پێ بدات، خوێنەر هەست بەوە نەکات ڕووداوێکی دووبارەکراوەیە، بەڵکو گواستنەوەی ئەزموونێکی نوێیە، کە پێشتر تێیدا نەژیاوە. لەم ڕوانگەیەوە ڕابەرانی ڕۆمانی نوێ، وەک میشال بێتوور و ئالان ڕۆب گرێ، ئەوە دووپات دەکەنەوە، کە ڕۆمان بریتی نییە لە باسکردنەوەی ئەوەی ڕوویداوە، چونکە ئەمە پیشەی مێژوونووسە، بەڵکو دەبێ ڕۆمان باسێکمان بۆ بگێڕێتەوە، کە پێشتر گوێمان لێی نەبووە. کەچی کاکە تاریق کارێزی لەم پەرتووکەدا، کە ناوی لێناوە (کوێت) ئەو ڕووداوانە دەگێڕێتەوە، کە بەهۆی داگیرکردنی ئەو وڵاتە لەلایەن سووپای ڕێژیمی بەعسەوە ڕوویانداوە و بەخۆیشی تێدا سەرباز بووە.

هەروەها بەخۆی پاڵەوانی سەرەکی و بگێڕەوەی تەواوی دەقەکەیە و بەشێکی گەورەی دەقەکە بریتییە لە گێڕانەوەی چەند ویستگەیەکی ژیانی خۆی، کە لە نەخواردنەوەی چایەکەوە دەست پێ دەکات و بەگەڕانەوە بۆ هەولێر کۆتایی پێ دێ پاش ئەوەی سوپای سەددام لە بەرانبەر سوپای هاوپەیمانان شکستی هێنا و بەشێوەیەکی زۆر دراماتیکی تێکشکێنرا.

لە باسی جۆرەکانی گێڕانەوەدا، ئەرستۆ ئاماژەی بۆ سێ جۆری سەرەکی کردووە:
١- گێڕانەوە وەک خۆی.

**ڕۆمان تەنیا بریتی نییە لە ڕووداو و گێڕانەوەی ڕووداو و گفتوگۆی کەسەکان لەسەر ئەو ڕووداوە. گرنگترین ئەرکی ڕۆماننووس چۆنیەتی بنیاتانی هونەری گێڕانەوەیە**

٢- گێڕانەوە وەک ئەوەی مەزندە دەکرێ ڕووی دابێ.
٣- گێڕانەوەی ئەوەی، کە هێشتا ڕووی نەداوە.

شێوەی سێیەمی گێڕانەوە لە تیۆری نوێی گێڕانەوەدا بایەخێکی زۆری پێدراوە و بە بناغەی ڕۆمانی نوێ دادەنرێت. کەچی کاکە کارێزی شێوەی یەکەمی لە گێڕانەوەی ڕووداوەکانی داگیرکردن و پاشان ڕزگارکردنی دەوڵەتی کوێتدا پەیڕەو کردووە، کە ئەمەش دواکەوتووترین و خراپترین شێوەکانی گێڕانەوەیە.

نووسەری ئەم پەرتووکە شارەزای هونەرەکانی گێڕانەوە نییە، و نازانێت چۆن جیاوازیی لەنێوان ڕۆمان و ژیاننامە و گەواهی نامە و دەقی بەڵگەنامەییدا بکات، بۆیە زۆر بە سانایی هەرسێ جۆرەکەی تێکەڵ کردووە و لە وڵامی ڕەخنەکەی من دا پێداگیری لەسەر ئەوە کردووە، کە ئەم پەرتووکە ڕۆمانە و ناولێنانی بۆ

خوێنەر جێهێشتووە. لەکاتێکدا تەواوی لاپەڕەکانی ئەم پەرتووکە ناچنە خانەی ڕۆمانەوە و هیچ هونەرکارییەکی ڕۆمانی تێدا نییە. تەنانەت درکی بەوە نەکردووە، کە نابێ نووسەری ڕۆمان، پاڵەوان و بگێڕەوەی ڕۆمانەکە بێت، کەچی زۆر ئاساییە لە ژیاننامەی خودی و گەواهینامە و هەروەها لە دەقی بەڵگەنامەییدا، خودی نووسەر ببێتە پاڵەوان و بگێڕەوەی، ئەوەی دەیەوێت بەنووسین بۆ خوێنەری ئاشکرا بکات. لەم جۆرە دەقانەدا هەر لادانێک لە هەقیقەت، نووسەر دەخاتە ژێر پرسیارەوە و گومان لە ڕاستی وتنەکەی دێتە ئاراوە. بەڵام لە ڕۆمان دا، کەس ڕۆماننووس بە لادان لە ڕاستی تاوانبار ناکات، چونکە خودی ڕۆمان دەقێکی خەیاڵییەوە و درۆیەکە نووسەر دەیکات، بۆ ئەوەی لەڕێی ئەو درۆیــەوە، گەمەیەکی هونەری لەگەڵ خوێنەردا بکات و فریوی بدات، بەوەی گوایە گوزارشت لە واقیع دەکات، لەکاتێکدا ناشێ و نابێت نموونەی کارەکتەرێ لە ژیانی واقیعیدا بدۆزینەوە.

***جارێک کەسێک دەچێتە لای مارکیز و داوای لێ دەکات فێری بکات چۆن ڕۆمان بنووسێت، ئەویش لە وەڵامدا پێی دەڵێت جارێ بڕۆ هەزار ڕۆمان بخوێنەوە ئەوسا وەرە قسەیەکی لێ دەکەین***

بۆ نموونە لە ڕاستیدا کەس لە باوکە گۆریۆی بەلزاک و دۆنکیشۆتی سیرڤانتس و جەمشید خانی بەختیار عەلی ناچن. کەچی کاکە تاریق، کە پاڵەوان و نووسەر و بگێڕەوەی ڕووداوەکـانی نێو پەرتووکی (کوێت)ە کەسێکی ڕاستەقینە و برادەرەکی ئازیزی منە و منیش ئاگاداری بەشێکی ژیانی ڕاستەقینەی ئەوم. وەک ئەوەی، کە لە پەرتووکەکەش دا باسکراوە، کە فەرمانبەری ئەنجوومەنی تەشریعی و تەنفیزی بــووە، هـەروەهـا شوقەیەکی حکوومی لە گەڕەکی ( ڕووناکی) لە شاری هەولێر پێدرابوو، لەبەر ئەوە ناچار بووە ببێتە سەرباز و بچێتە کوێت، نەبادا شوقەکەی لێ بسەنرێتەوە. هەروەها بە خۆی باسی ئەو چایەی بۆ گێڕامەتەوە، کە دەبوایە لەماڵی باوکی لە کەرکووک بیخواتەوە، بەڵام نە لەوێ و نە لە گەراجی کەرکووک بۆ بەغدا و نە لە گەراجی بەغدا بۆ بەسرە دەرفەتی نەبوو بیخواتەوە، هەتا دەگاتە سەنگەرەکانی سوپای عێراق لە وڵاتی کوێت.

ڕۆماننووس بۆی هەیە بە سوود وەرگرتن لە خەیاڵ و زانـیـاری خـۆی بچێتە نێو مـاڵ و نێو دەروونــی کارەکتەرەکانییەوە. قسەو باس و ڕازی ئەوان لەڕێی گفتوگۆ و مۆنۆلۆگی ئەوانەوە بۆ خوێنەر بگوازێتەوە. هـەروەهـا بۆی هەیە لەنێو جەرگەی شـەڕەکـان دا، لە سایەی دیکتاتۆرە خوێن ڕێژەکان دا، لە زیندان و لە گەڕەکی شـارەکـان دا، گفتوگۆ لەنێوان بـەرە و هێزە دژەکـان و دۆستەکان دابمەزرێنێ. ئەگەر دەرفەتیش نەبوو ئـەو پرۆسەیە بە ئاشکرا بـەڕێوە بچێت، ئەوا ڕۆماننووس دەتوانێ لە شوێن و کاتی تایبەت دا ئەو کـارە ڕێک بخات، کەچی کاکە کارێزی بیری بۆ ئەوە نەچووە، کە بەم شێوەیە بۆچوونە جیاوازەکان بخاتە ڕوو. بۆ نموونە لە وڵاتێکی داگیرکراوی وەک کوێت، دەبووایە نووسـەر بچێتە نێو ماڵ و نێو دڵ و نێو زەینی خەڵکی ئەو وڵاتـەوە و لە ڕێی قسە و گفتوگۆی نێوان ئەوانەوە باسی دۆخی دەروونیی و ترس و خولیاکانیان بکات. لەڕێی وێنەی دەروونیی ئەوانەوە دۆخی شلەژان و خەم و تێکشکانی ئەوانی ئاشکرا بکردایە، ئەوەی پیشان بدایە، کە ئەوان چۆن بیر لە ئازادیی و خۆڕزگارکردن لە ستەمی سوپای داگیرکەر دەکەنەوە، بەڵام بەداخەوە، چونکە ئەزموونی لە بواری ڕۆماننووسین دا نییە، بیری بۆ ئەو ڕێگەیانە نەچووە، کە دەکرا بەکاریان بهێنێ بۆ ئەو جۆرە مەبەستانە.

لـەدوا قسەم دا ئـامـاژە بـەوە دەکـەم، کە بـەداخـەوە کاکی کارێزی، لەباتی ئەوەی سوود لە ڕەخنەکانی من وەربگرێ بۆ ئـەوەی لە داهـاتوودا نووسینی باشتر و سەرکەوتووتر بنووسێ، کەچی وای لێکداوەتەوە، کە من دەرفەتم نەبووە تەواوی دەقەکەی ئەو بخوێنمەوە و تەنیا سەرپێییانە گوتوومە ئەم دەقە ڕۆمان نییە، کەچی خۆیشی بـاش دەزانـێـت، من ئـەگـەر، دەقێک بە وردی نەخوێنمەوە هەرگیز قسەی لەسەر ناکەم، چونکە لای من نووسین بەرپرسیارێتییە و نابێ سەرپێییانە بڕیار لەسەر دەق بدرێت، هەروەها لە نووسین دا من تەنیا لە دەق دەڕوانم و هەرگیز بایەخ بە هەستی تایبەتی نادەم.

ئازاد ئەرگوشی



# دوو کورتە چیرۆک

## بۆنی هەناسەیەک

دایکم ئافرەتێکی باڵابەرزی بەژن زراڤی بە خۆوە بوو. لە کاتی ڕۆیشتن، دەتگوت زەلامێکی شان و مل تێک هەڵکێشراوە، سنگی دەدایە پێشەوە و بە بستەیی هەنگاوی دەنا. زۆر جار دەیگوت: کوڕم هەست دەکەم مرۆڤی ئەو سەردەمە بچووک بۆنەتەوە.

ئەم ژنە بەتوانایە، ماوەیەک بوو تووشی نەخۆشییەکی کوشندە هاتبوو. باری تەندروستیی رۆژ بە ڕۆژ بەرەو خراپی دەڕۆیشت. تا وای لێ هات ناچار بووین دوو هەفتە جارێک بیبەینە نەخۆشخانە، بۆ وەرگرتنی چارەسەری کیمیاویی. کاتێک بۆ دواجار بردمە لای دکتورەکەی، دکتور پێی گوتم: ئەگەر ئەوە دایکی من بێ چیتر ناهێنمەوە بۆ نەخۆشخانە، لێی دەگەڕام تا خوا ڕەحمی پێ دەکر. چونکە ئەم چارەسەرییە زیاتر بە ئەشکەنجەدان دەچێ، تا چارەسەر کردن.

ڕۆژێکیان لە ڕێگەی نەخۆشخانە، قسەی دکتورەکەم وەبیرهاتەوە، بەڕاستیش لەکاتی دانانی دەرزییەکان دایکم زۆر تێک دەچوو، کاتێک ئەو دیمەنانەی دایکم لەسەر تەختەی نەخۆشخانە دەهاتنەوە بەر چاو، هەناوم ژانی دەکرد. بۆیە ئەو ڕۆژە بڕیارم دا ئامۆژگاری دکتورەکە جێبەجێ بکەم و چیدی نەیبەم بۆ نەخۆشخانە.

پێش ئەوەی بگەمە نەخۆشخانەکە، ڕێگەی خۆم گۆڕی و بەرەوە پارکی شار بەرێکەوتم. زۆری پێنەچوو دایکم هەستی بەوە کرد، زانی کوڕەکەی ناڕواتە نەخۆشخانە، بۆیە بە زەردەخەنەوە لێی پرسیم: کوڕم مەگەر ئەمڕۆ نۆرەی لێدانی دەرزییەکانم نییە، ناڕۆین بۆ نەخۆشخانە؟

بە بێدەنگی تەماشای ڕووخسارێم کرد. دایکم نیگای پەرییە نێو چاوانم، پاشان بە دەنگێکی پڕ لەسۆز و میهرەبانییەوە گوتی: ماندوو بووی کوڕم؟

خۆم پێ ڕانەگیرا فرمێسکم بە چاواندا هاتنە خوارێ، دایکم بە بینینی فرمێسەکەکانم بە تاسەوە گوتی: کوڕم تەحەمول کردنی ئەم نەخۆشییە زۆر ئاسانترە لە بینینی فرمێسکەکانت، دایە بە قوربانت بێت. خەم مەخۆ بایی ئەوەندە عومری خۆم کردووە.

لەبەر دەرگـای پارکەکە ئۆتۆمبێلەکەم ڕاگـرت و کورسییەکەم هێنایە خوارەوە، دایکم لە باوەش کرد و بە هێمنی لەسەر کورسییەکەم دانا، گوتم: دایەگیان بۆ هەوا گۆڕینێک دەڕۆینە نێو پارک. دایکم بە زەردەخەنەوە گوتی: چۆنت پێ باشە وابکە کوڕم. دوای ئەوەی دەمێک بە بێدەنگی بە نێو پارکەکەدا سووڕاندمـەوە، لەژێر سێبەری دارێک وەستاین و گوتم: دایەگیان دەڕۆم لە دوکانەکەی نێو پارک شەربەتێکت بۆ دێنم. ئیدی چاوەڕێی ئەوەم نەکرد بزانم دایکم ڕای چییە خێرا ڕۆیشتم. زۆری نەخایاند گەڕامەوە لای دایکم. بەڵام بە سەرسووڕمانەوە بینیم دایکم لە شوێنی خۆی نەماوە. لەگەڵ نەبینینی دایکم، هەستم کرد دونیا بەسەرمدا ڕووخاوە، لە ترسی تەنیایی و بێکەسی خەریک بوو ڕۆحم دەردەچوو، هەستم کرد لە بیابانێکدا تەنیا و بێکەس ماومەتەوە، ئەو دونیا گەورەیەم لێ بچووک بۆتەوە، لە ترسان نەمدەزانی پەنا بۆ کێ ببەم. شێتانە بەشوێن دایکمدا دەگەڕام. قەت خۆم ئەوەندە بێ کەس نەدیبوو، ترس لە بێکەسی و تەنیایی سەری لێ شێواندم، کەچی دایکم چەند هەنگاوێک لەولاتر خەریکی بۆنکردی گوڵێک بوو! خێرا خۆم گەیاندێ و لێم پرسی: چدەکەی لێرە دایەگیان؟

سەری بەرز کردەوە بە چاوی فرمێسکاوی گوتی: بۆنی زۆر خۆشە!

بە بینینی فەرمێسکەکانی دایکم کزە لە هەناوم هات، لە ناخەوە ئاگرم تێبەربوو، بەبێ دواکەوتن کورسی چەرخدارەکەی بەرەو ئۆتۆمبێلەکەم پاڵدا و گوتم: با دوانەکەوین دایەگیان نۆرەی لێدانی دەرزییەکانتە!

٢٠٢١/٣/١٩

# من فریشتە بووم

فریشتەیەک عاشقی هەتاو بوو! بەڵام هەمیشە تیشکی بەهێزی هەتاو دەبووە هۆی ئازاردانی چاوەکانی! ڕۆژێک فریشتەکە پێی گوت: «تیشکەکانت زۆر بەهێزە، چاوەکانم ئازار دەدەن، ناتوانم بە ئاسوودەیی تەماشات بکەم»

خۆر لەپێناوی خۆشەویستیی فریشتەکەدا ڕووناکییەکەی کز کردەوە. ئیدی لەو ڕۆژەوە فریشتە بە ئارەزووی خۆی لە دیار خۆرەکە دادەنیشت، سەرەتای هەموو ڕۆژێکی بە بزە دەستی پێ دەکرد، ئێوارانیش بە فرمێسک کۆتایی پێدەهات. ئەو ماوەیە خۆشترین سەردەمی ژیانی فریشتەکە بوو، بەڵام زۆری پێنەچوو لەبەر ساردبوونی کەش و هەوا، زەوی کەوتە مەترسییەوە، دونیا بەرەو ساردی دەڕۆیشت، سرووشت خەریکبوو بەرگێکی زەرد و کاڵی لەبەر دەکرد. گشت بوونەوەران نیگەران بوون لەوەی، کە گۆی زەوی بەرەو بەستەڵەک دەڕوات. بەتایبەتی ژیانی ئادەمیزاد لەبەر بێهێزبوونی تیشکی خۆر کەوتبووە مەترسییەوە. سەختیی ژیان تەنگی بە مرۆڤ هەڵچنی، بەردەوام خەریکی دوعا و نزاکردن بوون، لەبەر خوای گەورە دەپاڕانەوە بۆئەوەی زەوی لەو بەڵایەی بەسەریدا هاتووە بپارێزێت و لێیانی دوور بخاتەوە. فریشتەش نیگەرانی ئادەمیزاد بوو، دەیویست کارێکیان بۆ بکات.

بەرەبەیانییەک خۆر لەو دیوی کێوە سەرکەشەکانەوە چاوی هەڵێنا و فریشتەش دوای ستایش و چەند پێ هەڵگووتنێکی عاشقانە لێی پرسی: «ئەرێ پێم نالێی ئەو سەرمایە لە کوێوەوە هاتووە؟ خەریکە دونیا لەناو دەچێ!»

هەتاو گوتی: «هۆیەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کە من بۆ پاراستنی چاوەکانت تیشکی خۆمم کز کردەوە، ئەمەش بووە هۆی بێ هێزبوونی گەرما لەسەر زەوی، خەریکە دونیا وێران دەبێ لە پێناوی خۆشەویستیی تۆدا!» فریشتە بەبیستنی ئەو وەڵامە خەم دایگرت و هەستی کرد فریشتەیەکی خۆپەسەندە، خەریکە دونیا لە پێناوی خۆشەویستیی نێوان ئەو و هەتاودا لەنێو دەچێت. بە خەمبارییەوە گوتی: «ئەگەر بگەڕێیتەوە سەر دۆخی جاران، کێشەکە چارەسەر دەبێت؟»

هەتاو گوتی: «بەدڵنیاییەوە، بەڵام کێشە بۆ تۆ دروست دەبێت»

فریشتە گوتی: «من ئامادەم لەپێناوی ئەو بوونەوەرەی کڕنۆشم بۆ بردووە چاوەکانم بکەمە قوربانی. تۆ بگەڕێوە سەر دۆخی جارانت، منیش تا ئادەمیزاد لەسەر ئەم زەوییە ماوە پەنا بۆ ئەشکەوتێک دەبەم، تەنیا لە دواساتەکانی ئێواران و دەمە کورتەکانی بەرەبەیانیاندا بە بینینی تۆ شاد دەبمەوە».

بەمشێوەیە تیشکی خۆر گەڕایەوە سەر دۆخی جاران و بەرەبەرە سەقای گۆی زەوی گۆڕا و بەرەو گەرمی ڕۆیشت، بەهارێکی نوێ سەرتاسەری زەویی گرتەوە، ئادەمیزاد خۆشحاڵ بوو لەوەی کە لەو میحنەتە ڕزگاری بووە، بێ ئاگا لەو فیداکاری و خۆبەختکردنەی فریشتەکە. تەنیا دڵخۆشیی فریشتەکە ساتە کورتەکانی بەرەبەیان و ئێواران بوو. ڕۆژێک نیوەڕۆ خۆرگیرانێک ڕووی دا، ڕەنگی خۆر سوور هەڵگەڕا، دەتگوت خوێنی لێ دەبارێت. فریشتە ڕووی لە ئاسمان کرد و لە خۆری پرسی: «خێرە وا ڕەنگت سوور هەڵگەڕاوە؟!» خۆر بە گریانەوە گوتی: «هەر مەپرسە ئەوەی لێی دەترسام ڕووی دا».

فریشتە بە گریانەوە گوتی: «چ قەوماوە؟!» خۆر گوتی: «ئادەمیزاد خوێنی برای خۆی ڕشت. زەوی بە خوێنی مرۆڤ ئاڵوودە بوو. ئیدی تا ڕۆژی قیامەت شایەتی فرمێسکی گەرم و خوێناویی من دەبی لە دەست ئەم ئادەمیزادە»

فریشتە بە بۆڵەبۆڵەوە گوتی: «دەمزانی وای لێدێت، بەڵام نیگەران مەبە من چارەسەری دەکەم». فریشتە خێرا خۆی گەیاندە شوێنی ڕووداوەکە بە هیوای پاککردنەوەی زەوی لە خوێنی ئادەمیزاد. ویستی دەست بە خواردنی خوێنی ڕژاوی ئادەمیزاد بکات، خۆر پێی گوت: «ئەگەر خوێنەکە بخۆی کوێر دەبیت». فریشتە گوتی: «ئەو چاوانەی نەتوانن بە ئازادی تەماشای جوانی بکەن، بۆ مردن باشن»

لەگەڵ خواردنی خوێنەکە فریشتەکە بینایی چاوەکانی لەدەست دا. بەمشێوەیە یەکەم شەمشەمەکوێرە لە دایک بوو!

٢٠٢٣/١/١٥

# ١٥ كورتیلە چیرۆك

## كوژان

بە پەنجە پچوكەكەی ئاماژەی بۆ شۆستەكەی ئەوبەر شەقامەكەی بەرانبەری كرد و بە ڕوخسارێكی تەژی لە كوژان و دەنگێكی كزەوە گوتی:

ئەو ژنە ڕەشپۆشە دەبینی، كە منداڵە ساواكەی لە باوەشە، ئەوە دایكمە. دوای مردنی باوكم ژیان ناچاری كردین، من واز لە خوێندن بێنم و بە یارمەتی خێرخوازان ئەو ژیانە قورسە بگوزەرێنین!

## چارەنووس

ئەو بە قاتێكی شین و بۆینباخێكی سوورەوە لە پشت لاپتۆپەكەوە دانیشتوە و لەو مەملەكەتە بێچارەدا بڕیار لەسەر چارەنووسی گەلێك دەدا، دواجار شازادە ئەو بڕیارەی دەركرد، كە بۆ خۆی و داروودەستەكەی بە قازانج گەڕایەوە و چش لە هاوولاتی مەملەكەت!

## جیكلاس

لەم ولاتە جەنجاڵەدا كاروپیشە قاتییە و دەست ناكەوێت؛ پێچەوانەی ئەوە، هاوڕێكەم گوتی:

ئەو ڕۆژە كچە مۆدێلێك لە ڕاگەیاندنەكاندا ئاماژەی بە ئارامی مەملەكەت و زۆربوونی هەلی كار دەكرد، بەوەی كە لە ماوەی یەك ساڵدا چەند دەفتەرێك دۆلاری ئیش كردووە و ئۆتۆمبێلێكی جیكلاسیشی كڕیوە!

## گۆشەگیر

ڕۆژانە لە چایخانە بچووكەكەی سەری بازاڕەكە دەمبینی.

لە گۆشەیەكدا بەدەم جگەرەكێشانەوە دەردە دڵ و بێزاری خۆی دەردەبڕی و گلەییەكانی ئاراستەی كاربەدەستانی شارەكە دەكرد، هەنگاوێك لێی نزیك بوومەوە لێم پرسی چ كارەی؟ ئاهێكی پڕ بە سییەكانی هەڵكێشاو گوتی: دەرچووی زانكۆم و بێ كارم.

## بەرپرس

لە ڕیزی پێشەوەی هۆڵی كوڕەكە دانیشتبوو، كۆمەڵ كۆمەڵ خەڵك دەهاتنە نێو هۆڵەكە لە ماوەیەكی دیاریكراودا، هۆڵەكە پڕ بوو لە نووسەر و ڕۆشنبیرانی شارەكە، هەموویان چاوەڕێی بەرپرسێكی باڵایان دەكرد، كە بڕیار بوو گوتارێك بخوێنێتەوە!

دوای چەند خولەكێك كاكی بەرپرس گەیشت، ئەوانەی لە ڕیزی پێشەوە دانیشتبوون هەموویان لەبەری هەستان، تەنیا ئەو نەبێت! بەرپرسەكە هەستی بە كەموكورتی كرد و دلگران بوو، كە بینی ئەو كەسە لەبەری هەڵنەستاوە! بێ ئاگا لەوەی، ئەو كەسە لەپێناو خۆشگوزەرانی و مانەوەی ئەو و سەدان بەرپرسی دیكەی تازە هەڵتۆقیو كەم ئەندام بووە.

## ڕەزیل

لە گەڵ ئەوەی باخێكی فراوان و جێوڕێیەكی باشیشی هەبوو، جۆرەها پەلەوەر، دارودرەخت و حەوزی ماسی لە باخەكەیدا هەبوون، بەڵام دەستبەرداری ڕەزیلی و قرچۆكییەكەی نەدەبوو. ببووە جێی باسوخواسی هاوڕێكانی، لە ڕۆژێكی هاوینی تاقەت پڕوكێندا بڕیاری دا لە باخەكەیدا سێ هاوڕێی بە ماسی داوەت بكات. پێش زەردەپەڕ لەگەڵ هاوڕێكانی شاریان بەرەو



هێدی گەلالی

باخەکە جێهێشت، لەنێوەی ڕێگاکەدا پێی گوتن: هاوڕێیان دەزانن ماسی برژاو بە هاوینان خۆش نییە، با لەو قەسابەی سەر جادەکە کیلۆیەک گۆشتی گوێرەکە بکڕین!

## عەتر

دوای سڵاوکردن و خواردنەوەی چایەکی شیرین، لە چایخانە بچکۆلەکەی نزیک عەتر فرۆشەکە گوتی: ئێستە لە مەزرەعەکەم گەڕاومەتەوە و زۆر ماندووم!

گوتم: بەخێر بێیتەوە من دەچم بۆ لای هاوڕێ عەتر فرۆشەکە، تۆش دێیت؟

گوتی: هەرچەندە ماندووشم، بەڵام قەیناکە دێم

گوتم: تۆش عەتر دەکڕی؟

گوتی: نا ... بۆنەکەی ئەوسام ماوە!

گوتم: ئەها... بیرمە ئەو بۆنەی سەرەتای ئەو زستانە کڕیت!

گوتی: بەڵێ.. بەڵێ. ئا!

## نوشتە

هەمو جەژنێکی قوربان، ئەو کابرا کەڵەگەتە دەبینم بەهەمان بالاپۆش، کە مەلا و شێخەکان دەیپۆشن، ئەو جەژنی قوربانەی ڕابردوو لە ماڵێک دانیشتبوو باسی چارەسەری نەخۆشی دەروونــی بە نزا و نوشتەوە دەکرد! پێشتر خۆی وەک سەید ناساندبوو، کارتێکی بچووکی لاکێشی دەرهێنا و دای بەو نەخۆشەکە و گوتی:

ئەوە ناوونیشان و ژمارەی تەلەفۆنی منە هەرکاتێک ویستت پەیوەندیم پێوەبکە.

دوای چەند چرکەیەک، ڕووی لە هەمووان کرد و گوتی: نزا و نوشتەکانی من جیاوازترە لە شێخ و مەلا و سەیدەکانی دی!

یەکێ لە ئامادەبوان وەڵامی دایەوە و گوتی:

مام سەید نزا و نوشتە باشترین و خراپترینی لە کوێ بوو؟!

## ئیجە

هەرچی ئاڵتوون و کەلوپەلی ماڵەوەیان هەبوو لە پێناو گەیشتنی کوڕەکەیان فرۆشتیان! ئەوەی کۆیان کردبۆوە بڕێک پارە بوو. لێرەوە کوڕەکەیان بە پیر مەرگەوە بەڕێکرد لە دەریای ئیجەدا بووە خۆراکی نەهەنگ و ماسی!

## قەرز

هەموو ڕۆژێک لە دوکانی دراوسێکەیاندا پاکەتێکی بە قەرز دەبرد! کاتێک گەیشتە هەندەران بە ماوەیەکی کەم بە ئۆتۆمبێلێکی دوا مۆدێل گەڕایەوە. لە پیاسەکانیدا لە پێش دوکانی هاوسێکەیاندا تێدەپەڕی و زۆر بە خێرایی لێی دەخووڕی بۆ ئەوەی نەیناسنەوە، کە ئەوە کوڕە قەرزارەکەیە!

## نهێنی

یەکەم جاری بوو پێی نابووە زانکۆ، کە هاتە حەوشەکە، بە شەرمەوە تەماشایەکی ئەملاو ئەولای کرد! بە سیمایەکی شێواوەوە دەردەکەوت. پاش چەند ڕۆژو مانگێک لە خوێندن، دەرکەوت گورگە لە پێستی مەڕدا.

## ژیان

ئەو، بە بەردەوامی گلەیی لە ژیانی خۆی دەکا. بێزاری حەوسەڵەی لا نەهێشتوە، ڕۆژانە لەگەڵ خۆی لە گفتوگۆ دایە؛ با کۆڵنەدا ململانێی ژیان بکا، کەواتە بەربەرەکانێ بەردەوامە.

## هاوڕێ

بۆ ئەوەی ڕاستگۆ بێت لەگەڵ خۆشەویستییە ئەبەدیەکەی، هەموو ڕۆژێ، لە کتێبخانەکە سەردانی دەکردن. بە درێژایی ئەو ڕۆژانە بۆی دەرکەوت ڕاستگۆترین و خۆشەویسترین هاوڕێ، کە هۆگری بوو کتێب بوو!

## سووتان

ئەوینی پەپوولە بۆ چرا بە چرکەساتی مەرگ دەست پێدەکات، لە چرکەساتی یەکەم ژوان جەستەی بێگەردی دەسووتێت! بۆیە پێناسەی ڕۆشنایی بۆ پەپوولە سووتانە!

## سەگەڵ

ڕوو لەهەر شارێک دەکەیت سەگەلێکی برسی و بێ لانە لەسەر شۆستە و بەردەم دووکانەکان و سەری فەرعی کۆڵانەکان دەبینیت. لە ئەزەلەوە سەگ بۆ مرۆڤ ئەمەکدار بووە، کوا ئەمەکداری مرۆڤەکان بۆ سەگ؟

من دەڕۆم
وەک ئەو سێبەرەی
هەتاوی لێ ون بوو
وەک ئەو زەویە وشکەی
بۆ دڵۆپێک باران دەنوزایەوە
من دەڕۆم و جێی پێی خۆم
لە دوای خۆم جێ ناهێڵم
وەک ئەو کۆترەی لەسەر دارتەلی کارەبا
کە ناتوانێ چرایەک داگیرسێنێ
بەردەبمەوە و دەمرم
دەمەوێ دوور دوور بڕۆم
تا لە کەوتن دەکەوم
دەمەوێ مردنێک تەجرەبە بکەم
دوور لە کەوتنی فڕۆکەیەک
لە وەرگەڕانی **ماشێنێک**
**لە** گوللەی سەربازێک
لە نەشتەرگەری بەهەڵەی دکتۆرێک
لە خۆپیشاندانێکی نارەزایەتی
لە گران بوونی نان
نامەوێ مردنێک تەجرەبە بکەم
چەکدارێک کە یەکەمین جاری بێت
گوللە بتەقێنێ و بمکوژێ
نامەوێ مردنێک تەجرەبە بکەم
**ژنەکەم موچەیەکی** زەبەلاحی **شەهیدانە وەربگرێت**
**کەواتە** بۆ مردنێک تەجرە بکەم کە **مردنی** من نییە
زۆر جاران کە لە ڕابوردوو دەڕوانم
سێبەری فرمێسکەکانم
چیرۆکی خۆش و هەندێ جاریش غەمگین دەگێڕنەوە
ئەوکات دەمەوێ مردنێک بمرم
ئارام ئارام
مردنەکەم ببێتە چیرۆکێکی درێژ
ئەما هێشتا زیندووم
سێبەری فرمێسکەکانم

چەند گەورەن
کاتێ سپێدەیەکی زوو
خۆم ئامادە دەکەم بۆ سەفەرێکی دوور
زەنگی بۆ لێدەدەم
هەواڵی دەپرسم
دواتر بۆنێکی شانێل
لە لاملم دەدەم و دەڕۆم
پێکێ شەرابی فەرەنسی و
هەندێ فستەقی عەنتاب
بەدەم ڕێگاوە
گوێگرتن لە گۆرانییەکی فەیرۆز
کە هیچی لێ تێناگەم
ئەو هەموو چێژە چییە
لێی دەبینم خودایە
لە ڕێگایەک دەڕۆم
جگە لەئاسمان و چیا
چیدی نابینم
بەهارێک ڕسکاوە
**لە جوانی**
**لە ژنێکی خەوتووی** بەرتیشکی هەتاو دەچێ
تۆ لەگەڵ من نی و من تەنیام
درەختەکان باڵا باڵا هەلزناون
لوتم پڕ لە بۆن دەکەن و
حەز لە پێکردنی جگەرەیەک دەکەم
دەمارەکانم تەڕ تەڕ دەبنەوە
فشاری خوێنم جێگیرە هەستی پێدەکەم
سەرئێشەم نییە و چاوم ڕوونتر
بەربینابیم دەبینێ
ئێستا تەنها تۆ لەگەڵم نیت
دەزانی چەندم پێویست پێتە
دەزانی بۆ نامەوێ بمرم
**دەمەوێ مردنێک تەجرەبەبکەم هی من نەبێت**

# ڕۆشنبیریی گشتیی

- **کاتێک فەرهاد گریا .. یان کاتێک دەبێت بە نیتچە**

سمکۆ عەبدولکەریم

- **با منیش قسەی خۆم بکەم! (بەشی دووەم و کۆتایی)**

عەبدوللا زەنگەنە

- **ئاراستە نوێیەکان لە هونەر و جوانیدا (بەشی سێیەم)**

د. راویة عبدالمنعم عباس   و: سەرتیپ ئاغا واحد بەگ

# کاتێک فەرهاد پیرباڵ گریا

# یان کاتێک دەبێت بە نیتچە


سمکۆ عەبدولکەریم

(١)

لەوێ ژنێک نیتچە دووچاری نائومێدییەکی گەورە دەکات، بەڕاست نائومێدی نەخۆشییە؟ ئێمە چی لە بارەی نەخۆشییەوە دەزانین، تۆ پێت وانییە مرۆڤەکان هەر یەکەو بەدەست نەخۆشییەکەوە دەناڵێنن.

کاتێک ژن دەچێتە خوێنی ئینسانەوە، ئەو پیاوە چی بەسەردێ، ئێوە چۆن دەتوانن لەوشتانە تێبگەن، مەگەر ئەزموونتان کردبێ، مەرجە ڕەنگدانەوەی ژن لەسەر هەموو ئینسانێک وەک یەک بێت؟

لەوێ ژنێک لە شێوەی چەقاوەسو دەبینم، بەڵام میهرەبان، لەوێ ژنێک کە ویستویەتی لە پێناو ئامانجەکانی خۆیدا بچێتە نێو دڵ و دەروونی نیتچەوە، بەڵام ناهێڵێ ئەو لە گیانی نزیک بکەوێتەوە.

تۆ سەیرکە کاتێک ئەو ژنە بەدەردی نیتچە دەزانێ، فریای دەکەوێ، من کارم بەوە نییە ئەو فریاکەتنە زیاتر پەیوەندی بە چییەوە هەبووە، چەندە پەیوەندی بەلایەنی سۆزدارییەوە هەبووە؟ نا من وای بۆ دەچم ئەو ژنە کاتێک دەزانێ نیتچە مرۆڤێکی گەورەیە، کاتێک تێدەگات خۆکوشتن و مردنی نیتچە کارەساتێکی گەورەیە، هەم بۆ ئاسوودەیی ویژدانی، هەم بۆ مرۆڤایەتی بڕیاردەدا فریای بکەوێت.

لەوێ ساڵ ١٨٨٢- ە، ئێستا ساڵ ٢٠٢٣-یە جیاوازیی کات زۆر زۆرە وەک چۆن جیاوازی ویژدانەکانیش زۆرتر.

تۆ سەیرکە یەک ئینسان دوو کەس تۆ بڵێ سێ کەس لەنێو چەندین ملیۆن ئینساندا بەسە بۆ دەرباز کردن و چارەسەرکردنی ئینسانێک، بەڵام کە ئەو مرۆڤەش نەبێ چی.

نیتچە گەورەییەکەی فریای دەکەوێ، نیتچە فەلسەفەکەی فریای دەکەوێ، نیتچە ژنێک فریای دەکەوێ، نیتچە دکتۆرێک فریای دەکەوێ. نیتچە شانسی ئەوەی هەبووە لەسەردەمی سیگمۆند فرۆیددا ژیاوە، نیتچە لەسەردەمێکدا ژیاوە خەمی پەرەپێدانی زانست و مەعریفە خەمێکی جدی و گەورە بووە.

(٢)

تۆ سەیرکە ئەو ژنەی نیتچەی دووچاری ئەو نائومێدییە گەورەیە کردووە، بەبێ ئاگایی ئەو، بێ ئەوەی ئەو پێی بزانێت نامەیەک بۆ دکتۆرێکی ناوداری ئەو سەردەمەی نەمسا دەنووسێت:

(دکتۆر برویر، دەبێ لەمەڕ بابەتێکی گرنگەوە لەگەڵتاندا بدوێم ئایندەی فەلسەفەی ئەڵمانی لە مەترسی دایە، سبەی (کات ٩) لەکافێی سۆرینتۆ چاوڕوانتان دەبم).

من ناڵێم فەلسەفەی کوردیی لە مەترسی دایە، کە نیەتی، من ناڵێم ئەمنی قەومی لە مەترسی دایە، کە نیەتی، من ناڵێم فیکر و مێژووی کورد لە مەترسی دایە، کە نیەتی، من تەنیا پێم وایە مرۆڤێک لە مەترسی دایە، مرۆڤێک وەک چۆن لای هەندێک کەس هیچ بەهایەکی نییە ئاوەهاش لای هەندێک کەسی دیکە وەک کەسێکی بلیمەت لێی دەڕوانرێ، بەڵام بەچی دەچێ کەسێک نەبێ فەرهاد پیرباڵ لەڕووە مەعنەوییەکەیەوە وەک نیتچە و بگرە باڵاتریش ببینێ، یان ئەوکەسەی وەک خۆشەویستەکەی نیتچە فەرهادی دووچاری ئەو نائومێدییە کردووە، بۆ ئارامی ویژدانی دکتۆرێک بدۆزێتەوە چارەی دەروونی

پڕ حەسرەتی فەرهاد بکات. ئەو فەرهادەی، وەک نیتچە گریانێکی بەسە بۆ ئەوەی ئارام بێتەوە. ئەو دکتورەی دوای هەوڵێکی زۆر توانی نیتچە بگریێنێ،

(ئەمە هەستێکی شکۆمەند و بزوێنەر و ساتێکی پیرۆزە. هەر بەو هۆیەشەوە گریام، هەر لەبەر ئەمەشە ئێستە دەگریم، تا ئێستە هەرگیز نەمتوانیوە ئەم کارە بکەم. دەمبینێ ئیدی ناتوانم بەر لە فرمێسکەکانم بگرم) بەڵام داخەکەم لێرە کەس نییە فەرهاد بگریێنێ.

فرهاد ئازارێکی زۆری فرمێسکەکانی داوە و ئازادیی لێزەوت کردوون، فرمێسکەکان ئەبێ برژێن، تا فرمێسکەکان نێنە خوارێ مرۆڤ ئارام نابێتەوە، چونکە ئەو کەسانەی ناتوانن بگرین دەبێ گومانیان لە خۆیان هەبێت.

(٣)

کاتێک دکتور بروێر لە نیتچە دەپرسێ: فریدریک هۆی ئەم فرمێسکانە چین؟

نیتچە دەڵێ: هۆیەکەی سەدای ئێوە بوو لە دەربڕینی (دۆستی ئازیزدا)

دۆستێک، کە سەرەنجام توانی، دوای هەوڵدانێکی زۆر سێبەری (لۆ ئەندریاس سالۆمێ) لە ژیانی نیتچەدا لەنێو ببات.

لێرە، کەسێک نییە بتوانێ یان بیەوێت ئەو سێبەرەی ژیانی فەرهادی داگرتووە لەنێو ببات، یان هیچ نەبێت شتێک لێی دوور بخاتەوە. چونکە تا ئەوکاتەی ئەو سێبەرە بەسەر سەری نیتچەوە بوو، ئەو باوەڕی بەو وتەیە نەبوو (چارەنووسی خۆت هەڵبژێرە) بە لادانی سێبەری «سالۆمی» نیتچە قەرزباری خۆی بۆ خێزان و میواندۆستی دکتورەکەی بروێر دەربڕی.

ئەمە چ زەمەنێکە ئێمە تێیدا دەژین ناتوانین باوەڕ بە هیچ بێنین، هەرکەسە و دوای باوەڕ و نەفسی خۆی کەوتووە، سپاردنی فەرهادێک بە قەدەری خۆی چ کارەساتێکە، مرۆڤی ئەم سەردەمە تەنیا خەریکی وێنەگرتنی کارە درندەییەکانی خۆیەتی، بۆ ئەوەی دواتر بە یەکەوە سەیریان بکەینەوە، وەک چۆن دواتریش دەبینین نووسەران و ئەدیبان وتار و چیرۆک و ڕۆمانەکانیان دەنووسن (کێ فەرهادی کوشت؟)

هەریەکەو سیناریۆیەک دادەڕێژن یەکێک دەڵێ: سالۆمێ خۆشەویستەکەی نیتچە کوشتی، یەکێکی دەڵێ: خۆی، خۆی کوشت، یەکێکی دی دەڵێ: حزبەکەی کوشتی، ئەوەی دیش دەڵێ: میللەتەکەی کوشتی، هاوڕێکانی کوشتیان، نەخێر بێ ئەقڵ، خۆی، نا

سەرەنجام کەس نازانێ
چی ڕوویدا؟ بۆ
ڕوویدا؟



## (٤)

بۆ ئـەوەی لـە داهـاتوودا کـەس ئـەو پرسیارە نەکات فەرهاد بۆ وای لێهات؟ بۆ کەس لایەکی لێنەکردەوە؟ باشتر وایە کەسێک لەنێوەی ڕێگەوە بەهانایەوە بچێت، واز لەو قسە پڕوپووچانە بێنن، وەک لە زۆر کەس گوێم لێ دەبێ، چونکە ئەو جۆرە قسەو ئەو جۆرە تێگەیشتنانە هەر دەبن، وەک چۆن ئەگەر منیش گوێم بەو قسانە دابووایە نەمدەتوانی ئـەو چـەند دێـرە لـەسـەر فـەرهـاد بنووسم.

من لەوانەش نیم ئەمڕۆ وابڵێم و بەیانی بە دوو قسەی قزرووت پێچەوانە بابدەمەوە، من باسی ئەوەم نەکردووە ئەو پێشتر بۆ گیراوە؟ ئێستا لەسەرچی وای لێ دەکەن؟

من دەمـەوێ بڵێم ئەو دەبێ بە زووترین کات

**پێم وایە مرۆڤێک لە مەترسی دایە، مرۆڤێک وەک چۆن لای هەندێک کەس هیچ باهایەکی نییە ئاوەهاش لای هەندێک کەسی دیکە وەک کەسێکی بلیمەت لێی دەڕوانرێ**

چارەسەر بکرێت.

هـەروەک (لۆ سالۆمێ) بەزووترین کات خۆی گەیانـدە دکتۆر (بـروێر) دوای خـواردنـەوەی قاوەیـەکی بەشیر، بـە دکتۆرەکـەی گـوت: (من دۆستێکم هەیە کە زۆر نائومێد و نارەحەتە، ترسی ئەوەم هەیە، کە ڕەنگە لە داهاتوویەکی نزیکدا خۆی بکوژێت، ئەم بابەتە بۆ من لێدانێکی زۆر گەورە و پڕ ئازارە، جگە لەوەی بەهۆی ئەوەی، کە گوایە منیش بەشێکم تێیدا هەیە «بەڕادەیەکی زۆر خەمباری منە» بەهەر حاڵ من دەتوانم بچمە ژێرباری ئەمە و بەسەریدا زاڵ بم، بەڵام ئەو لە دەستدانێکی گەورەترە، باوەڕ بکەن مەرگی ئەم پیاوە بۆ ئێوە بۆ کلتوری ئەوروپا، بۆ هەموومان داهاتوویەکی دژواری لێ دەکەوێتەوە).

لۆ سالۆمێ دەزانێ نیتچە هەر شتێکی بەسەر بێ جگە لەوەی ئەو ئازارێکی زۆری پێوە دەچێژێ، ئەورووپاش کەڵە نووسەر و فەیلەسووفێکی زۆر گەورە لە دەست دەدات.

بۆیە ئەو بەو بیرکردنەوەیەی هەم خۆی دەرباز دەکـات، هـەم نیتچە، هـەم کلتور و ڕۆشنبیریی ئەوروپا.

بەڵام لێرە کێ وابیردەکاتەوە؟ کێ ئەوە دەکات؟

## (٥)

لێرە کێ لە توانای دایـە لـەوە تێبگات هەستی مـەزنایـەتی چـۆنـە؟ ژن چ ڕۆڵێک دەگێڕێ لە پێدانی ئەو مەزنایەتییە، یان لەمەزنایەتی خستنی مرۆڤ. ئەنیشتاین وتەنی: (ژنان نەبن کێ دەتوانێ وامان لێبکەن تایبەتمەندییە سروشتییەکانی وەک ئازایەتی و بەرچاوڕوونی و دووربینی و ئەقڵمان لە دەست بدەین).

هەروەک فرۆیدیش پێی وایە مرۆڤ هەموو ئەو شتانەی دەیکات یەکێ لە پاڵنەرەکانی (حەزی مەزنایەتی)یە.

فرۆید دوای سی ساڵ لێکۆڵینەوە نەیتوانی وەڵامی ئەو پرسیارە بداتەوە (ئافرەت چی دەوێ؟).

بەومانایەی ژن کائینێکی زۆر غەریبە لە جەستەی پیاودا.

ئەگەرچی بۆدلێر پێی وایە (ژن کائینێکی مرۆییە، توانای ئەوەی نییە جیاکاری لە نێوان جەستە و ڕۆح بکات).

کاتێک ژن لە جەستەی فەرهاد جیا دەبێتەوە، جارێکی دی لـە ڕێگەی ڕۆحـەوە دەگەڕێتەوە و تووشـی ئـەو سـەر شێتییەی دەکـات، کە بە ئۆتۆمبێلەکەی مل لە جامخانەی فەرمانگەیەکی حکومی بنێ و عەگالی عەرەبێک بەزەوی دادا و کەرامەتی هەندێک کەس بشکێنێ، کە پێی وایە دەتوانێ لەم ڕێگەیەوە مەزنایەتی خۆی نمایش بکات و پێمان بڵێ ئەو چۆک دانادات، بەڵام ئەمە تاکەی بەردەوام دەبێت، بەدڵنیاییەوە کۆتایی دێت، بەڵام چ کۆتاییەک، کۆتاییەک، کە فەرهاد خۆی دەیـەوێ، یـان کۆتاییەک کە لـەدەرەوەی توانا جەستییەکەی ئەودایە، یان کۆتاییەک، کە کەسێک

پێی هەڵدەستێ و فریای فەرهاد دەکەوێ.

ئەمە لە کاتێکدا، کە دەروونی فەرهاد پڕیەتی لە شڵەژان و خەیاڵکردن، زۆربەی ئەوانەی لە خەیاڵی پووچدا دەژین، ئەگەر خودا، یان فریادڕەسێک لەو خەیاڵە پووچانە دەربازیان نەکات، ئەوا ڕێگەی سەرە و لێژی تاوان و (شێتی) دەگرن. فروێد کە لە دواوەی شانۆکە ڕۆڵی گەورەی هەبوو لە چارەسەرکردنی نیتچە، وا دەڕوانێتە ئەو جۆرە دۆخانە.

هەروەک لە بینەو بەردەی نێوان نیتچە و دکتۆرەکەشی دەردەکەوێ، هەروەک فرۆیدیش وای لێکداوەتەوە، کە حەزی خۆ چارەسەرکردن و ترسان لە چارەسەر دوو بیرۆکەی دژ بە یەکن و هەر یەکێکیان ئەوی دیکە بۆ لای خۆی ڕادەکێشێ، ئەم بینە و بەردەیەش نەخۆش دەخاتە ژێر زەمین لەرزەیەکی دەروونیانەی زۆر توندەوە.

بۆیە فەرهاد بەدەر نییە لەم دۆخە، بەلام دەڵێی چی بۆدلێر لە دۆخێکی ئاوای فەرهاد، (گوڵەکانی شەڕ) دەنووسێ و فەرهادیش خۆ دەرخستنەکانی سەر شەقام

## (٦)

فەرهاد وەک بۆهیمیەت، فەرهاد سەر بە چ قوتابخانە و فەلسەفەیەکە؟ دونیا بینیەکەی لە کوێوە سەرچاوەی گرتووە؟ زانین و وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانە گرنگن، چونکە لێیەوە دەتوانرێ لە ناخی فەرهاد نزیک کەوینەوە، بەو مانایەی دۆزینەوەی فەرهاد گرنگە، دۆزینەوەی ئەو سەرەتایەکە بۆ چارەسەر، سەرەتایەکە بۆ ناسینی ڕۆحی فەرهاد.

وەک چۆن لەکاتی چارەسەری نیتچەدا (لۆ سالۆمێ)ی خۆشەویستەکەی دوو کتێب لە کتێبەکانی نیتچە دەداتە دکتۆرەکەی بۆ ئەوەی بیانخوێنێتەوە.

بۆ بیانخوێنێتەوە؟ بۆ ئەوەی زیاتر بتوانێ لە ڕۆحی نیتچە نزیک بێتەوە و بە ئاسانی بتوانێ باوەڕی پێبێنێ کە پێویستی بە چارەسەر هەیە، بۆ ئەوەی بتوانێ بەزمانی خۆی قسەی لەگەڵ بکات.

بەلام لێرە کەس ئامادە نییە ئەوە بکات، کەسە هەرە نزیکەکانی سەرزەنشتی دەکەن، تاکە شتێک، کە تا ئێستە وەک چارەسەر بە خەیاڵیاندا هاتووە هێشتنەوەیەتی، ئەوانەشی کە لە خەمیدان تاکە چارەسەر، کە هەوڵی بۆ دەدەن دەربازکردنیەتی، لە کاتێکدا هیچیان چارەسەر نین.

سەرەتای چارەسەر ناسینی فەرهادە، ئایا دەتوانین بڵێین فەرهاد وەک بۆدلێر سەربەخۆیەتی، وەک بۆدلێر هەڵگری (بیری بوهیمیەتە) چونکە بۆدلێر (سەر بە هیچ شتێک نەبوو، بەڵکو کەسێکی سەربەخۆی بوو، خاوەنی خۆی بوو، لە هەر جێگەیەک بیویستبایە کاری خۆی دەکرد، هەرچۆنێک و هەرچییەکی پێی خۆش بووایە ئەنجامی دەدا، ئەمەش جەوهەری بنەڕەتی کەسایەتییەکەی بوو، کە لێوانلێو بوو لە بیرۆکەی (بۆهیمیەت) کە سەرەنجام لە پێناوی

***دەروونی فەرهاد پڕیەتی لە شڵەژان و خەیاڵکردن، زۆربەی ئەوانەی لە خەیاڵی پووچدا دەژین. ئەگەر خودا، یان فریادڕەسێک لەو خەیاڵە پووچانە دەربازیان نەکات، ئەوا ڕێگەی سەرە و لێژی تاوان و (شێتی) دەگرن***

ئەوەدا خۆی بەخت کرد و ژیانی خۆی لەدەستدا)

فەرهاد کە دۆخەکەی نزیکە لە بۆدلێر، ئایا کەوتووەتە ژێر کاریگەری ئەو؟ چونکە ئەو پەرەگرافەی لە سەرەوە هێناومەتەوە، وەک خۆی لەسەر فەرهاد جێبەجێ دەبێت.

**• تێبینی/ بەداوای لێبوردنەوە کەسێک ئەو ڕۆمانە ( کاتێ نیتچە گریا) وفیلمەکەی نەبینیبێ ناتوانێ لەو نووسینەی من لەسەر فەرهاد پیربال تێبگات؟**

**جارێکی تر بە داوای لێبوردنەوە کەسانێکی دیکەش هەن ئەگەر فیلمەکەشیان بینیبێ و ڕۆمانەکەشیان خوێندبێتەوە هەر ناتوانن تێبگەن، ئەمەش نە خەتای منە و نە گوناهی ئەوان.**

**• ئەم وتارە لە ساڵی ٢٠١٩ نووسراوە**

# با منیش قسەی خۆم بکەم!



عەبدوڵڵا زەنگەنە

**لەگەڵ ڕەحمەتی ئەحمەد محەمەد ئیسماعیل-دا**

ئەو مامۆستا بەڕێزە، کە ئێستە بە ڕەحمەتی خوا چووە، لە ڕۆژی ٢٧/ ٤/ ٢٠٢٣ پرسەکەی لە مزگەوتی «ئەبووبەکر صدیق»ی هەولێر لە گەڕەکی کوێستان بۆ دانرابوو، ئەگەرچی لە ژیانی خۆمدا ئەوەندە لێی نزیک نەبووم، بەم حاڵەیشەوە ماوەی سەعاتێکی ڕێک لە پرسەکەی دانیشتم. من لە کایەی ڕۆشنبیریی کوردیدا، دەبێت لە کۆتایی ساڵی ١٩٦٨، یان لە ناوەڕاستی ١٩٦٩، دوای نامیلکەی «لێوی ئاگرین»ی «ئەمینی میرزا کەریم» ئەو نامیلکە ناوونیشانە سەیرەی ئەویش، واتە (دارەکەی بەرماڵمان) سەرنجی بۆ خۆ ڕاکێشاوم خستوومیە دونیای نوقسانان، کەواتە لە پاڵ ئەرکە کۆمەڵایەتییەکە، ئامادەبوونی هەموو نووسەرانیش بە ئەرکێکی هەموو ئەو کەسانە زانیوە، کە خۆیان بەم بوارەوە خەریک کردووە.

بەر لە کۆچی دوایی، وا دیارە کاکە (سمکۆ عەبدولکەریم)یش، وەک ئەرکێکی ڕۆژنامەنووسیی، بە مەبەستی پێداچوونەوەی هەندێک لە زانیارییەکان و جارێکی دی ڕا وەرگرتنی لەسەر چەند قسەیەکی بەر لە بڵاوکردنەوەی دیمانەکە، چووەتەوە لای ڕەحمەتی، وا پێدەچێت «سمکۆ» دوای تەئکیدکردنەوە، لە بۆچوونەکانی دڵنیا





بووبێتەوە، بۆیە دەستەواژەی (من بە قەد بەژنی تۆ کتێبم نووسیوە)ی لەسەر زاری ئەو هێناوەتە سەر بەرگی ژمارەی ئاماژەبۆکراوی «دیوان».

لە ڕاستیدا من لە دوای بڵاوبوونەوەی ئەو ژمارە، نەپەرژابوومە سەر خوێندنەوەی ناوەرۆکی (دیدار)ەکە، بەڵام ئەمیشم لە سرەی ئەو کتێب و گۆڤار و ڕۆژنامانە دانابوو، تا دواتر لە هەلێکدا هەر نەبێت چاوێکیان پێدا بخشێنمەوە، ئەوەبوو ئەو ڕۆژە، بۆ ڕێکخستنی گۆڤار و ڕۆژنامەکانی کتێبخانەی ئەکادیمیای کوردی، لەگەڵ تارا خانی کارمەندی ئەکادیمیا، مشووری کتێبخانەکەی ئەو دەزگایەمان دەخوارد، لە ناکاو «زیاد عالایی»ی بەرپرسی ڕاگەیاندنی ئەکادیمیا هاتە لامان، ڕاستەوخۆ ڕووی لەمن کرد و گوتی: بۆ لە گۆڤاری دیوان وا بەم شێوە توندە قسەیان لەسەر کردووی! ئەوەبوو هەر لەوێ گۆڤارەکەیان هێنا و لاپەڕەکەی بۆ دەستنیشان کردم. دوای خوێندنەوەی دەقەکە، ڕووم لە ناوبراو کرد، گوتم: هەقی خۆیەتی، ئەگەر من وام گوتبێت، ئەوە هەقی خۆیەتی، نەک هەر ئەوەندە، دەبووا لەوەش توندتر بێت، چۆن دەبێت بەم شێوەیە خەڵکی بئاخێوم، بەڵام بڕواش ناکەم بەو شێوەیە قسەم کردبێت، ئەوەبوو دواتر چوومەوە سەر ئەو دەقەی پێشووتر نووسیبووم، پێی ناوێت بڵێم وام گوتووە و مەبەستم لێی ئەوە بووە، وا لێرەدا دەقەکەی ئەو ڕەحمەتییە و ئەوەی خۆم دەنووسمەوە، ئینجا ناچار دەبم پێتان بڵێم کێشەکە لەسەر چی بووە؟

ڕەحمەتی دوای ئەوەی ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، گوایە ئەو لە ساڵی ٢٠٠٠ توێژینەوەیەکی لەسەر تایبەتمەندییەکانی گۆڤاری «شەفەق» نووسیوە، پاشان ئاماژەش بۆ ئەوە دەکات (چەندی لە کەرکووک و چەندی لە چەمچەماڵ و چەندی لە سلێمانی دەرچووە) بە کورتی دوای خۆهەڵنانێکی زۆر، ئینجا دەڵێت: (شتێک هەیە دەمەوێت لە ڕێی ئەو چاوپێکەوتنەوە بیڵێم. ئەو چەند ساڵەی ڕابردوو لە ئەکادیمیای کوردی سەردانی دکتۆر جەبارم کرد، یەکێک لەوێ دانیشتبوو، ناوی عەبدوڵڵا زەنگەنە بوو، تازە کتێبێکی لەسەر گۆڤاری شەفەق دەرکردبوو، لە پێشەکی کتێبەکەیدا ئاماژەی بە من کردبوو، نووسیویەتی (یەکێک،

گوێ بگرە یەکێک) پێش ئەم کتێبە شتێکی نووسیوە کە شتێکی ئەوتۆ نییە.

کەچی هەر لەو کتێبەیدا کۆمەڵێک وتاری منی وەک سەرچاوە بەکار هێناوە، کە من ئەوکاتەی ئەندامی دەستەی نووسەرانی گۆڤاری بارش-ی تورکمانی بووم. دەربارەی ڕۆژنامەگەری کوردیی لە کەرکووک بە ناوی (وەیسە) نووسی بوونم، کەچی لە پێشەکی کتێبەکیدا بە کەسێک ناوی هێناوم.

بۆیە ئەوەم زۆر پێناخۆش بوو، پێمگوت من کەسێک نیم، من ئەحمەد محەمەد ئیسماعیل-م نزیکەی پەنجا کتێبم نووسیوە تۆ چیت کردووە، شت لە گۆڤار و ڕۆژنامەکان کۆدەکەیتەوە و دەیانکەیتە وتار و کتێب. لە کاتێکدا من بە قەد بەژنی تۆ کتێبم نووسیوە. (لە دەقەکەدا، تەنیا وشەی ئەندامەی ـ م گۆڕیوە وکردوومە بە ئەندامی)

دیارە من دواتر ئەو قسانەی ئەو ڕحمەتییەم هەر لە مێشک و خەیاڵ دەرنەچووە، تا ڕۆژی دواتریش هەر بیرم لێی کردووەتەوە، پرسیارم لە خۆم کردووە، تۆ بڵێیت من شتێکی وام نووسبێت، وا ناکەومەوە سەر کتێبەکەش تا سەیرێکی بکەم و کەمێک ئارام ببمەوە، ئی چی بکەم، منیش هەر چەندە ناوم بەسەر ئەو کتێبەی «شەفەق»ەکەوەیە کەوا ئاماژەی بۆ کراوە، بەڵام لە بنکەی ژین منیش تەنیا هەقی ئەوەندەی کەسانی دیکەم هەبووە بەوەی یەک دانەیان داومەتێ، بۆیە شەو خەوم لێزڕاوە و تا بەیانی بەناو کتێبخانەکەمدا گەڕاوم ئەمیش هەر نەدۆزراوەتەوە، دواجار بەوە دڵی خۆم داوەتەوە لەوانەیە کەسێک بردبێ و نەیهێنابێتەوە، ناچار بەیانی چوومەتە ئەکادیمیا و لەوێ هەرچەندە بەمەرامی خۆم گەیشتم، بەڵام سەد خۆزگەم خواستووە، مرۆ دوای مردنی هیچ کەسێک هەڵوێستی وا بە چاوی خۆی نەبینێ! فەرموون بیخوێننەوە و بزانن لەژێر ناونیشانە سەرەکییە: «شەفەق» کەرکووک شوێنی لە ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا، بە ناوی (ڕوونکردنەوەیەکی پێویست)، کە ئەو ناوی لێناوە «پێشەکی» چیم نووسیوە و چی دەڵێم: (سەرەتای ئاشنابوونم بەم گۆڤاری (شەفەق)ـەی بەردەستتان دەگەڕێتەوە بۆ کۆتایی ساڵی ١٩٦٨، ئەوسا دەمێک بوو گروگاڵم بە خۆخەریککردن بە خوێندنەوەی دەرەوەی خوێندنی قوتابخانە لێ وەدەرکەوتبوو، ئەوەبوو لە ساڵی دواتر حکومەتی عیراق بڕیاری (حقوق الثقافية للشعب الكردي)ی بڵاو کردەوە، کە دوای کودەتاکەی شوباتی ١٩٦٣ قەدەغەیان لەسەر دانرابوو، ئازاد کران و لە کتێبخانەکانی بازاڕ بەرچاوخران. زۆر چاکم بە بیرە هەر دەڵێی دوێنێیە، لە (کتێبخانەی خۆشناو)ی ئەوسا، کە شوێنەکەی لە جێگەی پارێزگای ئێستای هەولێر بوو و هێشتا نەیانگواستبووەوە دوکانەکانی بن قەڵات، چەند دانەیەکم لەم (شەفەق)ە کڕی! نایشارمەوە پارەکەشم لە پاڵ (٥) فلس و (١٠) فلسی ڕۆژانەی خۆم، بەبێ ئاگاداری باوکم، لە دەخیلەی دوکانەکەی ئەو بۆ کڕینی بردبوو، کە هەر خوا بۆ خۆی دەیزانی ئەگەر پێی زانیبا چی پێ دەکردم، دیسان هەر خوا بۆ خۆی دەیزانی چیرۆکی (چای شیرین)ی حوسێن عارف و ناوەڕۆکی بابەتەکانی دیکە چەندە ناخ و دەروونی هەژاندم، بڕوا بکەن ئەو چیرۆکە ئێستاش کاریگەریی لەسەرم ماوە، بۆیە لە ساڵی ١٩٩٨ کە هەندێ لە ژمارەکانی (شەفەق)م لە مەترۆکاتی مامۆستا جەلالی مەلا حەمەی سەیفوڵلا چنگ کەوت، یەکسەر بڕیارم دا ئێشیان لەسەر بکەم و نەوەی نوێیان پێ ئاشنا بکەم، ئەوەبوو سەرەتا لە ژمارە (١)ی گۆڤاری (هاواری کەرکووک) بە ناونیشانی (شەفەقی کەرکووک) لەسەرم نووسی، دیاربوو بابەتەکە کاری خۆی کردبوو، هەر ئەوکات برادەرێکی دەورووبەری (کەرکووک) داوای لێ کردم ژمارەکانی گۆڤارەکەی

**من نەمزانیوە ئەم نیمزایە هی ئەو بووبێت. دووەم کۆمەڵێک وتار نییە و تەنیا وتارێکە**

بخەمە بەردەست گوایە لێکۆڵینەوەیەکی لەسەر دەنووسێ و شتی نوێشی لەبارەوە دەڵێ، ئەوەبوو نەک هەر هەموو ژمارەکانی گۆڤارەکەم دایە، بەڵکو هەر خۆیشم نامە و ڕاسپاردەم لە نێوان پەیوەندیداران بۆ دەگۆڕییەوە تا بە زانیاری نوێ یارمەتی بدەن، بەڵام کە ئەو بابەتەی خۆی نووسی و بڵاوی کردەوە، نەک هەر ئەو لێکۆڵینەوەیە نەبوو کە ئێمە مەبەستمان بوو، بەڵکو هەموو ژمارەکانی ساڵی یەکەمی گۆڤارەکەی لێ ماندوو کردبووین و بە کەتیرە و کاغەز لێکی دابوون، گۆڤارەکانیشی ماوەی پتر لە نیوە ساڵێک لە لای خۆی هێشتەوە، تەنانەت بەم کارەیشی نەک هەر پرۆژەکەی لێدواخستین بەڵکوو ئەوسا دڵیشی زۆر ڕەنجاندین.

دوای گۆڕانکارییەکانی ساڵی ٢٠٠٣ و گەڕانەوەی کەرکووکییەکان بۆ شارەکەی خۆیان، ئەوەبوو (دەزگای شەفەق) لە کەرکووک دامەزرا و گۆڤاری (نەوشەفەق)یان بڵاوکردەوە، (حەمە کەریم عارف)ی سەرنووسەری گۆڤارەکە داوای لێ کردین لەسەر

(شەفەق) شتێکی بۆ بنووسین. دیارە تا ئەوکات زانیاری زۆرترمان لە بارەی گۆڤارەکە لەلا کۆببووەوە، بەتایبەتی کە دەمێک بوو (بەدران ئەحمەد حەبیب)ی بەرپرسی (دەزگای ئاراس) چەند جارێک داوای لێ کردبووم ئەو گۆڤارەی بۆ ئامادە بکەم تا لە دەزگاکەی چاپیان بکات، ئەوەبوو لە پێشەکی ئەو لێکۆڵینەوەی بۆ (نەوشەفەق)مان نووسیبوو، ئاماژەیەکی وام تیا کردووە، بەڵام ئەوکات و ئێستاش لەبەر ئەوەی گۆڕانکارییەکان ئەوەندە خێران، مرۆ تەمەنی نووحیشی هەبێت بەبەر هەموو ڕاناگات، بۆیە ماوەیەک دواتر کە سەرۆکی (بنکەی ژین) هەواڵی سکانکردن و چاپکردنەوەی (شەفەق)ی گەیاندمێ، نامەوێ بیشارمەوە و دەڵێم بەڕاستی ئەوسا لەسەر ئەم کارەی بەبێ پرس پێکردنم زۆر نیگەران بووم، چونکە لە لایەکەوە لە بارەی ئامادەکردن و چاپکردنەوەی گفتم بە یەکێکی دیکە دابوو و تا ئەمڕۆکەش کەس (پەیمانشکێنی) لە من نەدیوە، لە لایەکی دیکەوەش ئەویش هەقی خۆیەتی، چونکە ئێمە (بنکەی ژین) بە پێی بڕیار و یاسا دەبێ لە

**تا ڕۆژی دواتریش هەر بیرم لێ کردووەتەوە، پرسیارم لە خۆم کردووە، تۆ بڵێیت من شتێکی وام نووسیبێت**

شین و شایی شەریک بین. کوردیش دەڵێ (هەتا ماڵ پێی بوێ مزگەوت بەتاڵە) بەڵام بەداخەوە هێشتا کەرەستەی پێویستم نەهێنابووە بەردەست تا لێکۆڵینەوەیەکی دیکەی تێر و تەسەل لەسەر گۆڤارەکە بنووسم ئەوەبوو جارێکی دیکە سەرۆکی (بنکەی ژین) خستمییە بەر بەرپرسیارێتی تەواوکردنی بابەتەکەم، چونکە وا (شەفەق) لە چاپخانەیە و چەند ڕۆژێکی دیکە چاپ دەکرێ، ئەوەتا ئەم چەند ڕۆژە ناچاری کردووم کە بە زووترین کات لێکۆڵینەوەکەیان بۆ بنێرم گوایە ناوەڕۆکی گۆڤارەکە هەموو تەواو بووە و شوێن و جێگای لە چاپخانە گرتووە، دیارە ئێمەش گفتی کۆتایی هەفتەمان پێیان داوە، لە ژیانیشمدا حەزم نەکردووە (بەڵێن شکێن) بم، بۆیە ناچاربووم بە پەلەپرووزێ ناوەڕۆکی هەموو ئەو کۆنە کاغەز و چاوپێکەوتنانەتان وەک خۆی بخەمە بەردەست کە لە کتێبخانەکەم کەوتوونەتەوە بەردەست، ئەوانی دیکەش با بۆ کات و ساتی خۆی لێ بگەڕێین. هەر لەم ڕۆژانەدا بە تەلەفۆن قسەم لەگەڵ (مستەفا ساڵح کەریم) کرد و باسی چیرۆکی (چەندم لێ ئەسێنی) بۆ کردووم، لێرەدا دەقی قسەکانی ئەوم وەکو خۆی داناوە. (کاکە مەم بۆتانی)ی هەتا قورقوراگە یاخییش، بە کۆمەڵێک تێبینی و سەرنج ئەوەندەی دیکە بابەتەکەی بۆ دەوڵەمەند کردووین، هەر بۆیە دەقی بۆچوونەکانی ئەویشم وەکو خۆی داناوەتەوە.

هەروا بێتەوە کاتی خۆی یەک بە یەک لاپەڕەکانی گۆڤاری (هەتاو) و (هیوا) و ڕۆژنامەی (ژین)ی ئەوسام بۆ (شەفەق) هەڵداوەتەوە، وا دیارە لەم لێکۆڵینەوەیەمدا کە کاتی خۆی بۆ (نەوشەفەق)م نووسیوە نەکراوە سوودیان لێ وەربگرم، وا لەبەر پەلەپرووزێ دەقی نمایشی ئەو ڕۆژنامە و گۆڤارانەم، لەپاڵ چاوپێکەوتن و قسەکانی هەریەک لە (جەوهەر غەمگین) و (محەمەد سابیر مەحمود)، وەکو خۆی داناوەتەوە.

کاتی خۆیشی لەبەرنامەدابوو تەواوی ئەو نووسەر و ڕۆشنبیرانەشتان پێ بناسێنم کە لە (شەفەق)دا بابەتیان بڵاو کردووەتەوە، بەداخەوە وادیارە ئەو حەزەشم بۆ نەهاتووەتە دی، بۆیە وا لێرەدا هەموو ئەو ناوانەم بۆ نووسیونەتەوە و کەوانەم بۆ هەندێکیان کردووە و ڕوونکردنەوەم لەسەر داوە. لەبارەی ناوی (بەیان ـ شەفەق) و ئەو ژمارانەی هەیە، ئەگەر بۆم چووە سەر چەند دێڕێک و ڕوونکردنەوەیەکی لەسەر دەنووسم.

دواجار چوونمان بۆ سلێمانی پرسەکەی لە ٩/ ٦/ ٢٠١١دا، کە لە بەرنامەمان دابوو چاوپێکەوتنێکی ئەویش دابنێین، بەڵام وا دیارە لە کتێبخانەکەمان نەدۆزراوەتەوە، وای لێکردووین ئەم جارە بەڵێنەکەمان بشکێنین، ئەویش بە پاساوی دۆزینەوە و دانانی وێنەی هەندێک لە نووسەرەکانی (شەفەق) لەگەڵ لێکۆڵینەوەکەمان، دیارە سەرچاوەکەشمان بۆ گەیشتن بەم مەرامە، لە پاڵ ئەرشیفی تایبەتی کتێبی «اعلام الکرد»ی جەمال بابان بووە، دواتریش «ڕۆژگاری من»ی د. مارف خەزنەدارمان بەسەر کردەوە، هەموو ئەو دەقانەمان لێ وەرگرتووە کە پەیوەندی بە «شەفەق»ەوە هەیە، هەروەها وتارێکی جەمال خەزنەداریش، کە ئەوسا لە گۆڤارەکە وەکوو پەیامنێر کاری کردووە، شوێنی بۆ کراوەتەوە.

دوای هەموو ئەمانە، هاتوومەتە سەر «باری چاپ و چاپەمەنی لە کەرکووک» دواتریش باسم لە بزووتنەوەی ڕۆژنامەنووسیی لەو شارە کردووە، دیاریشە ناوونیشانی (بۆچی شەفەق) بۆ چ مەبەستێک دانراوە، زانیارییەکانی دوتۆی ناوونیشانی (دەزگایەکی چاپ و بڵاوکردنەوە)یش، بۆ ئەوسا زۆر نوێ و سەرنج ڕاکێش بووە، ناوونیشانی هەڵبژاردنی ناوی «شەفەق» و پایەی لای شاعیر و خوێنەرانی کوردیش، دڵنیام ئێستا بخرێتە

بەردەستی هەر توێژەرێکی کورد تاقەتی ئەوەی نابێت ئاوا بە وردی بەدواداچوونی بۆ بکات، بەشیر موشیر و باوەڕپێکراوەکانی شەفەق، ئەوەیان بەشێکی پرۆژەیەکی زۆر گەورەتری ڕۆژنامەنووسیم بووە، تاوەکوو ئەمڕۆش لە هەڵێنانی ئەو لوغزانەی ڕۆژنامەنووسی کوردی هەر خۆم بە تاقانە ماومەتەوە، دیارە ئامادەکردنی (ژیاننامەی شێخ عەبدولقادر بەرزنجی)ی خاوەنی گۆڤارەکەشم بە یەک لە ئەرکە سەرەکییەکانی خۆم زانیوە، جارێکی دیکە چەندەی هەوڵی بۆ بدەم ناکەوێتەوە بەردەست، هەر بەم شێوەیە پێدابڕۆ...

من لەسەرەوە پێشم بە هەموو ئەوانە گرتووە، خوانەخواستە ئەگەر ئەوەیان بە مێشکدا بێت، دوای مردنی کەسی وروژێنەری سەرەکی ئەو خەمانە، بپرسن نووسینی ئەم بابەتە لە پای چی؟ بۆیە لێرەدا ئەو گفتەم وەدی دێنم کە لەبارەی نهێنییەکانی ئەو پرۆژە، وا ئەوەشیان بۆ سوود لێوەرگرتنی بۆ ئەوانە دەنووسم، کە دوای من دێن:

١ـ وەکو دەبینن من لە دوورو نزیکەوە لەبری هیچ ناوێک، هەردوو وشەی (یەکێک یان کەسێک)م داناوە، بەڵکو نووسیومە برادەرێک، دیارە ئەوەش لای من ئەوپەڕی ڕێزگرتنە لە هەر مرۆڤێکی سەر ڕووی ئەم سەر زەمینە.

٢ـ من لە ڕوونکردنەوەکەی خۆم ناوی مامۆستایەکی بەڕێزم هێناوە، گوایە گۆڤارەکانم لە مەترووکاتی ئەوان چنگ کەوتووە. لێرەدا بۆ یەکەم جارە ئەوە ئاشکرا دەکەم و دەڵێم: نەخێر ئازیزانم، ئەم ڕستەیەم لەبەر ڕێز و بەرزی ئەو کەسە وا داڕشتووە، ئەگینا لە ئەسڵدا ئەوسا ئەم گۆڤارە و کۆمەڵێک گۆڤار و ڕۆژنامەی دیکەم، بە پارەیەکی زۆر، لە وەرەسەکانی ئەو بەڕێزە کڕیوە، پارەکەش دایکم بۆی دابین کردبووم، لە کۆتایی ساڵی ١٩٩٨ خەمی گەورەم ئەوەبوو چۆن بیانگەیەنمەوە هەولێر، ئەوەبوو چوومە لای (دڵشاد عەبدوللا) کە ئەوسا لە دەزگای سەردەم جێگری (شێرکۆ بێکەس)ی سەرۆکی ئەو دامەزراوە بوو، داوام لێی کرد خەمێکم بۆ بخوات، تا ئەو ئەرشیفە بگەیەنمە شوێنی مەبەست، ئەوەبوو نووسراوێکیان بۆ بازگاکانی ئەوێ ڕۆژێ پێیان دەگوت زۆنی سەوز بۆ کردم، دیارە بۆ زۆنە زەردەکەش پشتم بە شەهید «مەهدی خۆشناو» قایم بووە.

٣ـ دوای هێنانەوەی ئەمانە، ئینجا کۆمەڵێک گرفتی دیکەم بۆ هاتنە پێش، بەوەی چەند کەسێک خانەوادەکەی ئەو مامۆستایەیان هان دابوو گوایە ئەو ئەرشیفە پارەی زیاتر دەکات، دیار بوو هانایان بۆ (ڕاست نووری شاوەیس) کە ئەوسا بریکاری وەزارەتی ئەشغال و ئاوەدانکرنەوە بوو، ئەویش ڕۆژێکیان بانگی لای خۆی کردم و پەیامی ئەوەی دامێ، گوایە ئەو خانەوادەیە نایانەوێ ئەو ئەرشیفەیان بفرۆشن، منیش دڵنیام کردەوە، من ئەو شتانەم بۆ بازرگانی نەکڕیوە، جگە لەمەش، چ لە سلێمانی و چ لە هەولێر، کەس ئەوەندەی من پارەی پێنەداوە.

بەم حاڵەوەش، چ لەگەڵ دڵە حیزەکەی خۆم بکەم کەوا سۆزی بۆ هەموو کەسێک دەجووڵێ! بۆیە سەرەتا چوومەتەوە و پرسم بە دایکم کردووە، ئەویش پێی گوتم گەردنت ئازاد ناکەم بیاندەیەوە، دواتر چوومەتە لای مەلای مزگەوتەکەمان ئەویش دڵنیای کردوومەتەوە ئەو معامەلەیە دامەزراو بووە.

٤ـ بەم حاڵەیەوەش زۆربەی ناوەرۆکی ئەم ئەرشیفەم بەم و بەو دا کاری لەسەر بکەن. بۆ نموونە سێتێکی (٤٠٠) ژمارەیی ڕۆژنامەی (ژیان)ی ساڵانی ١٩٢٦ - ١٩٣٦)م لە سێ بەرگ ئامادە کردبوو، تا دواتر ئیشیان لەسەر بکەم، بەر لە دامەزراندنی بنکەی ژین، زانیبووم وا برادەرانم خەریکی ئامادەکرنی ئەم ڕۆژنامەیەن، هەموو

> من لە جیاتی سمکۆ عەبولکەریم ئەو دیدارەم سازدابا، دوای تۆمارکردنی ئەو بۆچوون و قسانە، بەر لە هەر شت هەوڵم دەدا پەیوەندی بە کەسی ناوهێنراوەوە بکەم

ئەو ژمارانەم خستە بەردەستی ئەوان، دڵنیام ئەو سێتەی من نەبووایە، هەموو ئەو ژمارانەیان، بەم شێوەیەی لەبەر دەستە، بۆ کۆ نەدەکرایەوە و هەموویشیان بەسەر یەکەوە بۆ چاپ نەدەبوو.

هەروا بێتەوە هەموو ژمارەکانی (شەفەق)م، وەکوو لە (ڕوونکردنەوی پێویست)یشدا ئاماژەم بۆی کردووە، خستە بەردەستی مەرحووم، کە لە هەمان ڕوونکردنەوەش نووسیومە: پتر لە نیوە ساڵێک لای خۆی هێشتەوە، ئێستە دەڵێم دەبووا بمنووسیبا: دەیەویست دەستی بەسەردا بگرێت، چونکە دواتر بە تکا و پاڕانەوە و هاتنە نێوانی ئەم و ئەو وەرم گرتوونەتەوە.

٥ـ ئەوە من نیم شت لە گۆڤار و ڕۆژنامەکان کۆدەکەمەوە، وەکوو مەرحووم فەرموویە، دەیانکەمە وتار و کتێب، بەڵکو ئەوە کەسانی دیکەن و منیش لەمێژە دژی ئەو فعلەم و لەبارەویەوە هاوار و دادم لێ هەستاوە و ڕەخنەم گرتووە! با خوێنەران و توێژەرانیش ئەوەیان لەبیر بێت، من بە دەیان جار گوتوومە و ئێستە و دوا ڕۆژییش

دەیڵێمەوە، لەبارەی چاپکردنەوەی هەر گۆڤار و ڕۆژنامە و هەر دەستنووسێکی دیکە، جا لە لایەن هەر کەسێک چاپ کرابێتەوە، ئەگەر بە تەنیا پێشەکییەک ناوی خۆی لەسەر نووسیبێت، لای من دەمێکە بە پاشماوەخۆری و گەندەخۆری دانراوە، لەسەر ئەمەش چەندان جار لە بارەی ناونووسینم لەسەر پرۆژەی هەریەک لە (هەتاو)ی گیوی موکریانی و (دەنگی گێتی تازە) گلەییم لە برادەران کردووە، ئەوە بە چاوپۆشین لەوەی ڕۆڵی سەرەکیم لە پەیداکردنەوەی زۆربەی ژمارەکانی ئەو گۆڤار و ڕۆژنامانە هەبووە، زۆریش بە دووبارە چاپکردنەوەیانەوە ماندوو بووم، خۆ ئەگەر مەراقم بووایە ناوم بکەوێتە سەر بەرگی ئەو جۆرە کتێبانە، ئەوە بۆ من لەوە زۆر ئاسانتر بوو کەوا بیری لێ دەکرێتەوە، هەر پێرار بوو لێژنەی ئامادەکردنی سەرجەمی بەرهەمەکانی (د. کەمال مەزهەر) چەند جاران ڕوویان لێنام بەشداریان لەگەڵ بکەم، زۆر بەراشکاوی گوتم: ئەگەر هەموو بەرهەمەکانی دەنووسنەوە و پێیدا دەچنەوە و پەراوێزی بۆدەکەن، ئامادەم لەگەڵتان بم، ئەگینا من کارێکی لەو شێوەیە بە.... دادەنێم.

دەمێکیشە گوتوومە: من دەمەوێ تەنیا (٤) کتێبم هەبێت و بخوێنرێتەوە، نەوەک (٥٠)م هەبێت شوێنیان لەسەر تاقچەی کتێبخانەکان بێت!

٥. ئەو مەرحوومەی گلەیی ئەوەی لێکردووم کۆمەڵێک وتاری ئەوم وەک سەرچاوە بەکار هێناوە، کە ئەو پێشووتر ئەوکاتەی ئەندامی دەستەی نووسەرانی گۆڤاری بارش - ی تورکمانی بووە، گوایە بە ناوی (وەیسە) نووسیونی. جارێ بەر لە هەر شت دەڵێم: من نەمزانیوە ئەم ئیمزایە هی ئەو بووبێت. دووەم کۆمەڵێک وتار نییە و تەنیا وتارێکە، ئەمیش هی نووسەری تورکمان (عەتا تەرزی باشی)ی بووە و ئەو وەریگێڕاوە، لە سێ شوێنی لێکۆڵینەوەکەم، بە دێڕ و نیوە دێڕ سوودم لێی وەرگرتووە زۆر بە ئەمانەتیشەوە لە نێو سەرچاوەکان ئاماژەم بۆی کردووە.

٦. مەرحوم لە دووتوێی ئەو شتەی گوتوویە، گوایە «شەفەق» لە «چەمچەماڵ»یش دەرچووبێت، ئێستەش نازانم ئەو زانیارییە سەیر و سەمەرەیەی لە کوێوە هێناوە!

٧. سەرباری گردوکۆی ئەم هەموو ئەو زانیارییانەی لەبارەی (شەفەق) کۆم کردبوونەوە، ئەوە چەندین جارە دەبینم بەرهەمەکانی من لە نەخشەسازیدا ناهەقیان تێدا دەکرێت و بە نیوە ناچڵی چاپ و بڵاو دەکرێنەوە، بە نموونە، بە تەنیا لە بەشی یەکەمی ئەو لێکۆڵینەوەی لەسەر گۆڤارەکەم ئامادە کردووە (١١٦) ژمارەی پەراوێزی بۆ دانراوە، کەچی لە کۆتایی بەشەکەدا، واتە لە (سەرچاوە و پەراوێز) بە تەنیا ناوی (٢٣)یان دانراون، جگە لەوەش ئەو وێنانەی لە کۆتایی کۆڵینەوەکە دانراون، هەر هەموویان بایەخی ئەوەیان نەماوە مرۆ لێیان بڕوانێت.

**دوا وتەم**

دیارە گەلێ دەردەڵ و بەراوردی دیکەم مابوو، ناکرێت چیدیکە بە گێڕانەوەیان ماندووتان بکەم، بەڵام ئەوەشم لە دڵ دەرناچێت، وا ئەو مەرحوومە چووەتە جێی حەق، بەمەش هەموو جەرگی منی کون کون کرد، ئێستە نازانم گلەیی خۆم لە کێ بکەم، یا ببەمە لای کێ؟، دڵنیام تا مردن دەبێت هەر لە چۆکی خۆم بدەم، بۆیە ناچارم بۆ کەمێک ڕەواندنەوەی ئەم خەمە و بۆ ئەوەیش ببێتە وانەیەک بۆ ڕۆژنامەنووسانی داهاتوو، دەڵێم من لە جیاتی (سمکۆ عەبولکەریم) ئەو دیدارەم سازدابا، دوای تۆمارکردنی ئەو بۆچوون و قسانە، بەر لە هەر شت هەوڵم دەدا پەیوەندی بە کەسی ناوهێنراوەوە بکەم، هەر هیچ نەبا بۆ ئەوەی لە وردوبارێکی مەسەلەکە بگەم، جا ئەو کەسە هەر کێ بووایە؟! خۆ ئەگەر بە ناوی نهێنی پاراستنی ناوەرۆکی بابەت، یان دیدارەکەش بووایا، دەکرا بە شێوەیەک لە شێوەکان، ئەو جۆرە هەڵوێستە لە لایەنی دووەم بگەیەنرابا، ئەگەر ئەوەشیان لاریبوونی لەسەر بووایە، دەچووم درۆیەکی سپیم دەکرد و دەمگووت فلان کەس نەخۆشە و ناوی تۆ دەهێنێت بۆ ناچی سەردانێکی بکەیت و کوڵی دڵی دامرکێنێت. دیاریشە چارەی دیکەی ئەم جۆرە خەمانە زۆرن، هەر ئەوەندەم بۆ ماوەتەوە بڵێم: لە خوا دەپاڕێمەوە، تەمەنم بەوەندە نەگەیەنێ بکەومە سەر جێگا و هوڕێنان بکەم، ئێوەش گەردنتاد ئازاد و وڵاتیش ئاوەدان.

٢٠٢٣ /٦ /١٢

**● (ئێمە وەک گۆڤاری دیوان وەڵامدانەوە و ڕوونکردنەوەی پێویست لەسەر هەر بابەتێک، بە مافێکی ڕەوا دەزانین، لەم ڕوانگەیەوە بڵاوکردنەوەی ئەو بابەتەمان بە پێویست زانی، ئەگەرچی کاک عەبدوڵڵا زەنگەنە سروشتی خۆی وایە لە نووسیندا درێژ دادڕە و لق و پۆپی زۆری لێ دەکاتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر لاریمان نییە.**

**بەڵام ئەوەی پەیوەندی بە دوا وتەکەیەوە هەیە، دەبووایە من، کە چاوپێکەوتنەکەم لەگەڵ مەرحووم ئەحمەد محەمەد ئیسماعیل کردووە، سەبارەت بەو قسانەی کە پەیوەندی بەوەوە هەیە، ئەوم لە ڕاستیی و دروستیی قسەکانی ئەو ئاگادار بکردبووایەوە، ئەوە لە کاری ڕۆژنامەوانیدا بە هیچ شێوەیەک پەیڕەوکراو نییە، مەگەر لەبەرانبەر قسە و زانیاری زۆر هەستیار نەبێت- سەرنووسەر)**



# ئاراستە نوێیەکان له هونەر و جوانیدا

بەشی سێیەم

نووسینی: د. راویة عبدالمنعم عباس
و. له عەرەبییەوە: سەرتیپ ئاغا واحد بەگ

**بومگارتن (١٧١٤ - ١٧٦٢)**

بومگارتن بە دامەزرێنەری ڕاستەقینەی فەلسەفەی نوێی جوانیی، یان ئەو جوانیناسەی بە وشەی ئیستاتیکا ناوبراو دەژمێردرێت، مەبەست لەم ناوە جوانیناسییە، ئەو زانستەیە لە دیاردەکانی جوانیی دەکۆڵێتەوە.

دیکارت لە بەرهەمەکەیدا، پوختەیەک لە میوزیک ئاماژەی بۆ هیچ توێژینەوەیەکی تایبەت، یان سەربەخۆ بۆ لێکۆڵینەوەی جوانی نەکردووە، لەگەڵ ئەوەیشدا وەک دیاردەیەک ئاماژەی بە جوانیی کردووە.

باشەی بەکارهێنانی وشەی ئیستاتیکا بۆ بومگارتن دەگەڕێتەوە. لە بەرهەمەکەیدا، کە ساڵی (١٧٣٥) دەرچووە، ئاماژەی بەم زانستە کردووە، دیدگایە نوێیەکەی خۆی لەبواری لێکۆڵینەوەی دیاردە جوانییەکانەوە، تێیدا پرسەکانی چێژی هونەریی ئەوانەی پەیوەستن پێیەوە خستووەتەڕوو، وەک چۆن هەوڵی داوە لۆژیکێک بۆ چێژی مرۆڤ لە چەشنی لۆژیکی وێنەیی ئەرستۆیی دابنێت و خزمەتی هزر بکات. کاتێک بومگارتن قوتابی کریستیان و وۆڵف بوو لە زانکۆی هالا، وای بینی بوونی کەموکوڕی لە دابەشکارییەکانی فەلسەفە لە زانستە فەلسەفییەکاندا تەواو بکات، ئەمەیش لەگەڵ دیدی مامۆستاکەی وۆڵف، کە پێی وابوو بوونی هێزێکی باڵا و کۆکە، ئەوی دیکەش نزمە بۆ زانین وای بینیوە لۆژیک تایبەتە بە لێکۆڵینەوەی هێزێکی باڵا، لەکاتێکدا پەی پێبردنی هەستەکی توێژینەوەیەکی تایبەتە بە هێزێکی نزمەوە، ئینجا وای لە جوانیناسی کردووە توێژینەوەیەکی تایبەتمەند بێت بە بڕیاردان و هەڵسەنگاندن بەسەر پەی پێبردنی هەستەکییەوە، ئەم ئاراستەیش لە هزردا بەشێوەیەکی شاراوە ئاماژە بەوەی پێشووەوە، کە لە فەلسەفەی جوانیی لەلای دیکارتەوە خستوومانەتە ڕوو دەکات.

بومگارتن بەیەکێک لە شوێنکەوتووانی فێرگەی دیکارت دەژمێردرێت، کە لە مێژووی فەلسەفەدا بەسەر دیکارتیزمە بچووکەکاندا تێپەڕبوون، ئەگەرچی لەدایک بووی ئەڵمانیایە (لە٧ی تەمموزی ساڵی ١٧١٤لە بەرلین لەدایک بووە) لە سەرەتای ژیانیدا بە وۆڵف و لیبنتز کاریگەر بووە، ئێمەش ناتوانین لە کاریگەری هزری دیکارت لەسەر دوایین فەلسەفەدا بێ ئاگابین. دابەشکاریی زانستە فەلسەفییەکان بەو پێیەی گەشەسەندێکی سروشتیی هزری دیکارتی بوو، لەبارەی ئاوەز و پەی پێبردنی هەستەکییەوە هات، لەلای وۆڵف و بومگارتنەوە دەگۆڕدرێن بۆ دوو هێز، یەکەمیان بەرز و ئەوی دیکەیان نزم، هەردووکیان لۆژیکیان بەزانستی لێکۆڵینەوە لە هێزی

بـالادا دارشـت، لەکاتێکدا پـەی پێبردنی هـەسـتـەکـیـیـان کـردە تـوێـژیـنـەوەیـەکـی تایبەت بۆ هێزی نزم، وەک چۆن لیبنتز بیرۆکەکانی دیکارتی گەشەپێدا، بە دانانی وێنە بیرۆکەیی و چۆنییەتیی مەبەستەکان، دەبینین بومگارتن جوانیناسی لە بارێکی نـوێ و گـەشـەسـەنـدوو دادەنـێـت، لە دابەشبوونی پـەی پێبردنی هەستەکیی مـرۆڤ دەکۆڵێتەوە. بومگارتن لە ناوە دیارەکانی بواری جوانیناسییەکانە، پایەی مامۆستای فەلسەفەی لـە زانکۆی هال هەبووە، پاشان لە فرانکفۆرت. ژمارەیەکی زۆر بەرهەمی، کە گەواهیدەریی داهێنان و قووڵین لە بواری فەلسەفە و خوداناسیدا چاپکردووە، وەک پەرتووکی (میتافیزیکا) ڕاڤە و شییان دەکاتەوە و کۆمێنتیان بۆ دەکات لەمیانەی کارکردنی وەک وانەبێژ لە زانکۆدا، پاشان بەرهەمی (ئیستاتیکا) کە دوو بەرگ لەخۆ دەگرێت و تیۆری جوانییە تایبەتەکەی خۆی تێیدا خستووەتەڕوو، بەشێوەیەک لێکۆڵینەوە جوانیناسییەکانی کردووە بە توێژینەوەیەکی سەربەخۆی فەلسەفە.

بومگارتن شوێنی قوتابخانەی لیبنتز دەکەوێت و بیرۆکەکانی بە گواستنەوەیەک بۆ فەلسەفەی جوانیناسیی ڕۆمانسیی گـوزارشـت دەکـرێـت، وامـان لـێ دەکـات کەمێک لـەسـەری بوەستین، بـۆئـەوەی بیرۆکەکانی شی بکەینەوە، وای بینیوە هێزی دەروون بۆ دوو ئاست دابـەش دەبێت: ئاستی یـەکـەم: خـۆی لە توانای بـەرزبـوونـەوەی (بـالا)دا دەنوێنێت، کە تێگەیشتنە و بـە چییەتی شـتـەکـانـەوە بەوپەڕی ڕوونی و وردییەوە پێیان دەگات، واتە بە بنەمای کامڵ بوونیان دەگەن، بەڵام ئاستی دووەم: لە هێزێکی نزم پێک دێت و سەر بە هەستیارییە، دەشێت لە ڕێگەی زەیـنـڕوونـیـی کـامـڵ بـوونـەوە پێشبینی بکات، بەڵام ئەم زەین ڕوونییە بەنادیاریی دەمێنێتەوە، بەڵام بەشێوەیەکی ناڕوون ئەو زانینە بەدەست دەهێنێت و بە توانای تێگەیشتن بەشێوەیەکی ڕوون و دیاریکراو دەگـات. ئـەم جـۆری زانینە بلیمەت پێی دەگـات، کە بومگارتن پێناسەی کردووە «توانا نزمەکانی هزرە ئاراستەی بەرەو زۆرترین هێزەکانی خۆیەتی» ئەگەرچی ئـەم جـۆری زانینە نـاڕوون و نـادیـارە، کەچی بەرهەمدار و پێویستە بۆ فەلسەفە، ئەمەیان خۆی لەو جوانیناسییەی پێشتر باسمان کرد دەنوێنێت، بەو پێناسەیەی پەیوەستە بە هەستکردن، کە لە یۆنان وەرگـیـراوە، بـەم شێوەیە جوانیناسیی بـەو واتـایـە دەبێتە زانستی هەستکردن (هەستناسی) لـەلای بومگارتن-ەوە، کە بەڵگەی بینینی هەستیارییە، ئەویش ئەوەیە بە بیرۆکەی شتێک، واتـە بنەمای کامڵ بوونی دەگات، وەک تێگەیشتنی تەواوەتی، ئینجا فەلسەفەی جوانیی لـە پێناسەی بومگارتن واتایەکی نوێ وەردەگرێت، ئایا ئەویشیان پەیوەست بە جوانییەوە نابێت.

لـەڕاسـتـیـدا فـێـرگـەی بـومـگـارتـن لە جوانیناسییەکاندا هونەر و چێژ وەرگرتنی جـوانـیـی لـە سـنـووری هـەسـتـیـاریـی (هەستکردن و هەست)دا قەتیس دەبێتەوە، بـەڵام چـاکـەیـەکـەی لـە گـرنـگـیـدانـی بە لێکۆڵینەوە و توێژینەوەکانی پەیوەست بە جوانیی و پێویستیی سـەبـارەت بە فـەلـسـەفـەوەوە بۆ ئـەوە، دەشـێـت ببێتە میتۆدێکی زانستیی بەهێزی ڕێکخراو. لە ساڵی (١٧٥٠)ەوە وشەی جوانیناسی تەنیا واتایەکی نوێی پەیوەست بە جوانیی و هونەرەوە وەرنەگرت، بەڵام جوانیناسی وەک مـیـتـۆدێـکـی تـایـبـەت دانــاو چەند بیرۆکەیەکیشی بۆ زیاد کرد.

# دیدار

# عومەر فەرهادی

عومەر فەرهادی ساڵی ١٩٣٨ لە هەولێر لەدایکبووە، هەوراز و نشێوی زۆری دیوە، خەم بەردەوام بەرۆکی گرتووە، بەڵام کەسێکی خۆڕاگربووە و کۆڵی نەداوە، ئێستەش ئامادە نییە کۆڵ بدات،
ڕۆژگارێک پێیان دەگووت «شێخی پەیامنێران» ، بەڵام ئێستە بۆتە شێخی باخی شاری خانەنشینان

# عومەر فەرهادی:

# پۆلی سێی ناوەندیی بووم، وەک ئەو زەوییە کێڵدراوە وابووم، کە تەنیا ئەوەی مابێت تۆ بکرێت



لەو ڕۆژانەی لە ڕۆژنامەی الاتحاد گۆشەی (هنا سنلتقی) دەنووسی من عومەر فەرهادی دەناسم، ڕەنگە وەک پیرە قەڵا یەکێک بێت لەوانەی جەستەی جووڵەی ژیانی تێدا ماوە، تا ئەو کاتانەی پەیامنێری بەشی کوردیی دەنگی ئەمریکا بوو، لەنێو پەیامنێرە گەنجەکانا بە شێخی پەیامنێران بانگ دەکرا، ئەوەشیان ڕێزێک بوو بۆ کەسایەتی ئەو، تا ئەودەم بە تەمەنترین پەیامنێر بوو. وەک بۆخۆی دەڵێت، ئەو ئێستە خولق و شەوقی جارانی نەماوە، هەست بەبێ تاقەتی دەکات، بەڵام کۆڵ نادات، چاوەکانی بە زەحمەت ئەو وشانە دەبینن کە ڕۆژگارێک بە عیشقەوە دەینووسین، هەموو بەیانییەک بەر لە کرانەوەی باغی شاری سەنتەری خانەشینان ئەو لەوێ ئامادەیە، ئێستەش سەبووری بە ڕۆژنامەکان دێت.

ڕۆژگارێک پێیەکی لە هەولێر بوو، پێیەکی لە سلێمانی، دیتنی ئەو بۆ هەندێک کەس، وەک ئەو چرایە وابوو، کە ژوورێکی تاریکی ڕووناک دەکردەوە. تا لاپەڕەکانی ژیانی ئەو جۆرە کەسانە هەڵنەدەیەوە نازانی چی تێدا تۆمارکراوە، بۆیە دواجار بڕیارمان دا چەند لاپەڕەیەک لە ژیانی هەڵدەینەوە و بە یەکەوە سۆراخێک بەنێو کاروانی ژیانی عومەر فەرهادی دابکەین.

**سمکۆ عەبدولکەریم**

**-هێمنی شاعیر لەپێشەکی کتێبەکەی (چیرۆکەکانی حەسەنی قزلجی) باسی بنەماڵەی قزلجی دەکا، دەڵێ بنەماڵەی قزلجی هەر لە ئەساسدا وەکو بێچکە مراوی وابوونە، هەر کە لەدایک بوونە مەلەوان بوونە، ئێوەش وەکو بنەماڵەی فەرهادی وان، وەک ئەوەی تێبینیم کردووە، باپیرت، بابت، مامەکانت، ئامۆزایەکانت، زۆربەیان کەسانی دیاری نێو کۆمەڵگەن، لەبوارەکانی ڕۆشنبیری، سیاسی و ئاینیی. دەکرێت باسێکی بنەماڵەکەتمان بۆ بکەی؟**

+ پرسیارەکەت زۆر بە جێیە، باوکم ناوی مەلا محەمەد بوو پێیان دەگوت (مەلا محەمەدی فەرهادی) واتە کوڕی فەرهادی، باپیرم ناوی فەرهاد بووە، برا گەورەی پێنج برایان بووە، برایەکانی لەخۆی بچووکتر (مەلا سادق، مەلا سەعید، مەلا ئیبراهیم و مەلا عەبدوڵلا) هەموویان مەلا بوونە، وەکو لێیانم بیستووە، فەرهادی باوکیان کوڕی مەولوود مەمان بوو، مەمان عەشیرەت بوونە لە ناوچەی دەشتی هەولێر، فەرهادی باپیرم وەک زانیتم، خوێندەواریی نەبووە، بەڵام پیاوێکی زۆر زیرەک بووە، زۆربەی قورئانی پیرۆزی لەبەر بووە، مەیلی خوێندەواریی هەبووە، هەر زوو کوڕەکەکانی دەخاتە بەر خوێندنی مەلایەتی، چونکە ئەوکاتی زیاتر خوێندنی مەلایەتی باو بووە، منیش کە لەدایکبووی چواری نیسانی ساڵی ١٩٣٨-م واتە هەشتاو پێنج ساڵ و چەند مانگێک پێش ئێستە، چاوم لەنێو کتێباندا کردەوە.



**- واتە ئەو سەردەمەی باپیرت، فەرهاد بۆ ساڵی چەند دەگەڕێتەوە؟**

+ باوکم ساڵی (١٨٩٢) لەدایکبووە، واتە لە کۆتایی سەدەی نۆزدە. لەساڵی ١٩٢٢ دێتە هەولێر، بۆ ماوەیەکی کەم لە گوندێک بووەتە مەلا، یەکەم کەسی بنەماڵەکەمان بووە، کە ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە.

**- ئەی بیرتە، کەی و چۆن هاتوونەتە نێو شاری هەولێر؟**

+ نازانم، بەڵام وەک

دواتر بۆیان گێڕاوەتەوە، ڕۆژێکیان لەگەڵ ئاغای گوندەکەی، کێشەیەکیان لەنێوان دروست دەبێت و باوکم تورە دەبێت، ئیدی ماڵەکەی بار دەکات و دەچێتە گوندی سۆربەش.

(سۆربەشی عەلی مەحموودی کاکە خانی) دیارە لەگەڵ وی بەینی خۆش بووە، دەڵێت بمبەنە وێندەرێ، دەشڵێت من چیدی مەلایەتی ناکەم (ئەوەی غیرەتی هەبێت نانی مەلایەتی ناخوا، ئاغا ئەمرت لەسەر بکات و کرمانج-یش خێرت پێ بکات) لەسەر ئەو قسەیەی، هەتا مەلایەکانیش لێی تورە بوونە، پێیان گوتوە بۆ ئێمە غیرەتمان نییە، گوتوویەتی بابە من لەگەڵ خۆممە، من خۆم بە غیرەت دەزانم و ئەو نانەی ناخۆم، غیرەتم ئەوە قبوڵ ناکات.

دێتە لای مەحموودی کاکە خانی، دیارە پێشترێ ناسیتی ئەویش پیاوەکی کراوە بووە، وەکو باسی دەکەن، بە زاراوەی ئەورۆ، واتە پیاوەکی پێشکەوتووخواز بووە. چەند ڕۆژەک لەوێ دەبێت، دواتر دێتە گەڕەکی سەعدوناوە-ی هەولێر، خانوویەک بەکرێ دەگرێت. لە بازاڕی قەیسەریش دووکانێک دادەنێت.

لەقەیسەریی گەورە، لەلای باشووری، سێیەم دووکان بەلای دەستە ڕاست دەچوویە ژووری، دووکانی باوکم بوو. ساڵی ١٩٢٩ کە دێتە هەولێر لەوێ دووکانی دانا، شەکر، چا و قوماش و ئەو شتانەی دەفرۆشت. تا ئەوکاتەی لە لەگەڵ برایەکی لە خۆی بچووکتر، کە ناوی (مەلا برایم) بوو لە ١٩٤٨/٦/٢ لەگەڵ کۆمەڵێک لەو نیشتمانپەروەر و کوردپەروەرانەی ئەودەمی، کە شیوعی و پارتی بوون دەستبەسەرکران و گیران.

**- بەدیاریکراوی لەسەر چی گیران؟**

+ بەناوی ئەوەی خۆپیشاندانیان دژی ئینگلیز کردووە، دژی پەیمانی (پۆرتسمۆس) تۆمەتی ئەوەیان دەدەنە پاڵ، کە ئەوانە دژی حکوومەت ئیشیان کردیە، دەیانبەنە مەحکەمەی عورفی لە کەرکووک، وەک لەبیرمە هەر هەمان ساڵ وابزانم مانگی هەشت، یان نۆ، هەموویان بەربوون، دوو کەسیان نەبێت، کە حوکم دران. عەونی یووسف، کە پارێزەر بوو، لەسەر پارتی حیساب بوو، ئەویان وابزانم بە ساڵێک و شەش مانگ حوکم درا. ئەوی دیکەش شێخ محەمەد بوو، کە بە (شێخە شەل) ناسرابوو بە یەک ساڵ حوکم درا، ئەویشیان لەسەر حزبی شیوعی حیساب بوو.

هەر لەو ماوەیەش، کە باوکم گیرا، ئەبو بەکر-ی برا گەورەم، کە چوار ساڵ لە من گەورەتر بوو، لە دایکبووی ساڵی ١٩٣٤ بوو، بە وەرگەڕانی ئۆتۆمبێلەکەی مامم، مەلا برایم (پەست قەمەرە) یان پێی دەگوت مرد، دوای ئەو ڕووداوە باوکیشم لە (١٩٥٠/١٢/٩) کۆچی دوایی کرد. من ئەوکاتە قوتابی پۆلی شەشی سەرەتایی بووم، لەقوتابخانەی (اربیل ثانیە) کە خوێندن لەوێ بەزمانی عەرەبی بوو.

**- فەرهاد ناوی ئەسلی باپیرت بوو؟ ئەی دواتر چۆن بووە نازناوی بنەماڵەکەتان؟**



مەلا محەمەد باوکی عومەر فەرهادی

+ پێشان دەیانگوت لەنێو کۆمەڵگەی کوردەوارییە، مەلا بەناوی گوندەکەی دەناسرا، پێیان دەگوت مەلای ئەو گوندەی، کە لێی بووە. وەک لەبیرمە چەند مەلایەک هەبوون (مەلا خەلیلی دووسەرەی، مەلا سەید محەمەدی پیرداودی) مەلا محەمەدی

> **"فەرهاد کوڕی پیاوەکی بووە بەناوی مەولود مەمان، پێیان گوتووە (مەمان) مەولوود وەکو سەرۆک عەشیرەتی مەمان وابووە"**

بابم، بە هۆی ئەوەی لە گوندێکی دیاریکراو نەماوەتەوە، بۆیە بە ناوی هیچ گوندێک نەناسراوە و بووە بە مەلا محەمەدی فەرهادی، واتە کوڕی فەرهادی، فەرهاد-یش پیاوێکی دیاربووە.

دواتر کوڕەکانی دیکەشی هەر بە ناوی فەرهادی بانگ کراون. دەیانگوت مەلای جدیدە کێیە؟ دەیانگوت مەلا سادق، برای مەلا محەمەدی فەرهادی. لەوەتەی چاوم کردووەتەوە پێمان دەڵێن فەرهادی، ئیدی بووە بە نازناوی بنەماڵەکەمان.

**- چۆن لەو سەردەمە زووە باپیرت ناوی فەرهاد بووە، چونکە ئەو وەختە ئەو جۆرە ناوانە زۆر دەگمەن بوون؟**

+ پێم وایە فەرهاد ناوەکی کوردیی نییە، زیاتر خۆرهەڵاتییە، ئەو ناوە ئێستەش لە وڵاتی فارس و لە هیندیش هەیە، لە کازاخستان، ئۆزباکستان، لە ئازەربایجان، هەتا لەنێو عەرەبیش هەبوو.

بەبیرمە پارێزەرێک هەبوو ناوی (عەدنان فەرهاد) بوو، کەسێکی ناسراوی بەغدا بوو، ڕۆژەکی ساڵی ١٩٦٢ لە بەغدایێ بە قیتارێ دەهاتمەوە هەولێر، کە تا ئەوکاتە ماڵم لە حللەی بوو، ئەگەر لە دەرەجە یەک و دوو قیتاری بنووستبای ناویان دەنووسی، هات لێی پرسیم ناوت چییە؟ گوتم عومەر فرهاد یەکسەر گوتی تۆ خزمی (عەدنان فەرهاد)یت، گوتم پارێزەرەکە، گوتی ئا، گوتم نا، من کوردم ئەو عەرەبە. ئەو پارێزەرە بە ئەسڵ خەڵکی ڕەمادی بوو.

**- ئەی فرهاد کوڕی کێ بووە، یان تۆ چەند پشتی خۆتت بیرە؟**

+ فەرهاد کوڕی پیاوەکی بووە بەناوی مەولود مەمان، پێیان گوتووە (مەمان) مەولوود وەکو سەرۆک عەشیرەتی مەمان وابووە.

**- چی سەرەتای منداڵیی خۆتت بیرە، بیرتە چۆن ئاشنای خوێندنەوە بوویت و چوویتە قوتابخانە؟**

+ من، هەرکە چاوم کردەووەتەوە، لە ماڵمان کتێب هەبووە، بۆیە دەکرێت بڵێم هەر لە منداڵییەوە ئاشنای کتێب و خوێندنەوە بوومە. ساڵی ١٩٤٤ تەمەنم دەبێت بەشەش ساڵ و چوومەتە قوتابخانە. ئەبوبەکری برا گەورەم، منی بردووەتە مەکتەبی (ئیبن مستەوفی) لە گەڕەکی تەیراوە، کە تازە هاتبووە ئەو گەڕەکەی، خانوویەکی گەورەیان بەکرێ گرتبوو، چوار پۆل بوو.

**- هیچ کام لە مامۆستاکانت بیرە، کە ئەو سەردەمە دەرسیان پێ گوتوویت؟**

+ کەماڵە فەندی هەبوو کەمال عەبدولقادر نەشئەت جەلیلزادە، لە بنەماڵەیەکی کۆیی بوون، کەسێکی زۆر کوردپەروەر و نیشتمانپەروەر بوو، بەڕاستی مامۆستا بوو. ئەو مامۆستا کەمال-ە قوتابییەکانی فێری کوردایەتی دەکرد، سبەینان ڕێزی دەکردین سروودی [کوردستان جێگای بەچکەی شێرانە، جێگای هەوارگە و کورد و گۆرانە، خوایە هەر خۆش بێ، بۆمان تا سەر بێ، پاشماوەی خاکی ماد و بابانە.....]ی پێ دەگوتین ئەوە سەرەتای دروستبوونی هەست و بیری نەتەوەیمان بوو.

**- ئەوکاتە خوێندن بە زمانی عەرەبیی بوو؟**

+ خوێندنمان بەرەسمی بەعەرەبیی بوو، بەڵام


عومەر فەرهادی

"

***یەکێ لەو کتێبانەی لە بیرمە کتێبێک بوو بەناوی (إرشاد العباد إلی سبیل الرشاد) بۆ دایکم و ئەو چەند ژنەی جیرانەکانمان، کە دەهاتنە ماڵمان، وەکو وەعزی مەلایان، بۆیانم دەخوێندنەوە و بۆشم تەرجوومەی کوردیی دەکردن***

"



مديرية الشرطة العامة

شهادة الجنسية العراقية

ساڵی ١٩٥٦ کاتێ تەمەنی عومەر فەرهادی دەبێتە ١٨ ساڵ
ڕەگەزنامەی عێراقی پێدراوە

شەرحکردنەکەی بەکوردیی بوو، لە (اربیل ثانیە) ئەوها نەبوو، کە چوومە ئەوێ هەمووی بەعەرەبی بوو.

**- چ بیرەوەریی و بەسەرهاتێکی ئەوکاتانەی خوێندنی سەرەتاییت بیرماوە؟**

+ بە بیرمە مامۆستا (حەیدەر عوسمان) هەبوو، کە بە (حاجی حەیدەر) ناسرابوو، مامۆستای وەرزش بوو، ڕۆژێک هاتە پۆل ناوی هەموو ئەوانەی خوێندەوە، کە لە پۆلی شەش داخیلی بەکەلۆریا ببوون، منیش لە پێشەوە دانیشتبووم، لەگەڵ (کامەران قەرەداغی) کە دواتر بووە ڕۆژنامەنووسیکی لێهاتوو و بەناوبانگ، من و کامەران لە پۆلی شەش لە تەنیشت یەک دادەنیشتین، ناوەکانی خوێندەوە و گوتی بۆ بەیانیی سەرو وێنەیەک و سەد فلس لەگەڵ خۆتان بێنن، کارتی بەشداربوونتان لە ئیمتیحانی بەکەلۆریای بۆ دەکەین، ئەو وەختە گاڵتە نەبوو، لە هەموو عێراق ئیمتیحان لەیەک کاتدا دەکرا پرسیارەکان لەوەزارەتی (مەعاریف)ەوە دەهات.

کە تەواو بوو گوتی: ئەتو عومەر غەمی مەخۆ ئەتو داخیل نەبووی. گوتم لۆ گوتی: ئەتو گچکەی ناجیحیش بی لە سانەوی قبوڵت ناکەن، ئەمن نەمزانی مەوزوع چییە. هێواریێ هاتمەوە بۆ مامم، مەلا ئیبراهیم، خودا عەفوی بکات گێڕامەوە. گوتی: ئەوە ویستیتی ئەتو عاجز نەبی.

بەڵام دوای چەند ساڵێک ئەوجا زانیم، بۆ ئەو ساڵە لە بەکەلۆریا وەرنەگیرام، من لە شەش ساڵی وەرگیرابووم، کە دەبوو لەحەفت ساڵی وەرگیرێم، بۆیە دەبوایە ساڵێک بمێنمەوە، واتە وەرنەگیرانەکەم لەبەر خراپیی و تەمبەڵیی نەبوو، لەبەر ئەوە بوو، کە من ساڵێک زووتر نێردرابوومە بەر خوێندن.

ئەو ساڵە مامەوە، ساڵی پاشترێ لە بەکەلۆریا دەرچووم و چوومە ناوەندی سانەوی، هەینێ یەک سانەوی هەبوو (ثانویە أربیل للبنین) لەصەفی یەک وەرگیرام. لە دەرسە عیلمییەکان (کیمیا، فیزیا، بیرکاری و ئەحیا) خراپ بووم دەرنەچووم، بۆیە وازم لەخوێندن هینا.

**- ئەو سەردەمە چ جۆرە جلوبەرگێکت لەبەر دەکرد؟**

+ بەرگێکمان لەبەر دەکرد لە هەولێرێ پێیان دەگوت عەزیە، وەکو دشداشەی عەرەبیی وابوو، پاشان بووە دشداشە، لەساڵانی جەنگی دووەمی جیهانیی جلوبەرگی حازر نەبوو، دەبوو بە ڕادان بدرێ. ساڵی (١٩٤٥) کە لە صەفی دووی سەرەتایی بووم لە قوتابخانەی (ئیبن مستەوفی) بابم، کە مەلا بوو، من و برا گەورەکەم ئەبوبەکری بردە لای خەیاتەک، ناوی حەسەن ڕەزا بوو، دوو

برا بوون (دیان) بوون، دوو دووکانی خەیاتیان هەبوو لە تەنیشت چاپخانەی ئێستەی مەچکۆی، تازە هاتبوونە هەولێرێ جلکیان دەدوری، لە بۆ من و برایەکەم چاکەت و پانتۆڕی بەڕادان دا، بەبیرمە ڕەنگیشی مۆرێکی سادە بوو، پێشی گوتین: ئەبوبەکر، عومەر، ئەوە جلکی ئێوەیە، ئەنگۆ دەبنە مـوەزەف، دەبنە موعەلیم، دەبنە دختۆر و موهەندیس. ئەنگۆ لەمەوپاش ئەو جلوبەرگانە لەبەر دەکەن، لەو کاتییەوە فێری ئەو چاکەت و پانتۆڕەی بوویمە و ئێستەشی لەگەڵدابی هەر حەزم لە چاکەت و پانتۆڕیە.

**- واتە جەنگی دووەمی جیهانیت لە بیرە؟**

+ بەڵێ لەبیرمە ساڵی ١٩٤٥ کە جەنگ تەواو بوو، تەمەنم حەوت ساڵ بوو. هەتا ساڵی ١٩٤١ بزووتنەوەکەی ڕەشید عالی گەیلانی-شم لە بیرە، کە دەیانگوت مەلیک فەیصەڵ و دایکیان هاتوونەتە گوندی (بـاداوان) لای مـەلا فەندی، ئەوکات من تەمەنم سێ ساڵان بوو.

**- کـەی دەسـتت بـە خوێندنەوە کـردووە، ئەو کتێبانەی لە سەرەتادا خوێندووتەوە چی بوون؟**

+ ئەو کتێبانەی لە ماڵی باوکم هەبوون زیاتر کتێبی عـەرەبـیـی ئایینیی بـوون، یـەکێ لـەو کتێبانەی لە بیرمە کتێبێک بوو بەناوی (إرشاد العباد إلى سبيل الرشاد) بۆ دایکم و ئەو چەند ژنەی جیرانەکانمان، کە دەهاتنە ماڵمان، وەکو وەعزی مەلایان، بۆیانم دەخوێندنەوە و بۆشم تـەرجوومـەی کـوردیی دەکـردن. کتێبی دیش هـەبـوون دەمـخـوێـنـدنـەوە وەک (فتح القريب) کتێبەکی دیکەش هەبوو بە عەرەبیی و کوردیی بوو (ڕەئس سـەرە، عەین چـاوە، بـەدەن قالب، ئیسم ناوە) ئەویشم دەخوێندەوە.

**- سەرەتای هەستی سیاسیت بۆ کەی دەگەڕێتەوە، دەکرێ بزانم چۆن تێکەڵی کاری سیاسیی بووی؟**

+ لە ساڵی ١٩٤٨، ئەوکاتە تەمەنم دە ساڵان بوو، باوکم و مامم مەلا ئیبراهیم، کە لەخۆی بچووکتر بـوو، لە ئەنجامی ئـەو خۆپیشاندان و ناڕەزایەتیانەی دژی پەیمانی پۆرتسمۆس و ئینگلیز کران گیران، دواتر زانیم، ئەو مامەم ئەندامی پارتی بـووە، ئـەو وەختـە هەموویان بەناوی شوعییەت دەگیران، بەپێی قانوونێک، کە پێیان دەگوت (مكافحه نشاط الهدام) لەساڵی ١٩٥٣ پۆلی سێی ناوەندیی بـووم، وەک ئەو زەوییە کێڵدراوە وابووم، کە تەنیا ئەوەی مابێت تۆ بکرێت. من دژی ئینگلیز، ئیستیعمار، دەرەبەگ و زوڵمی ئاغا بووم.

ئەوکاتەش تەنیا یەکێتیی گشتیی قوتابیانی عێراق هـەبـوو، کە یەکەم ڕێکخراوی حزبی شیوعی بـوو لـەسـەر ئاستی عێراق، لە ١٤-ی نیسان ساڵی ١٩٤٨ دامەزرا بوو. ساڵی ١٩٥٣ش پارتی، یەکێتیی قوتابیانی کوردستان-ی دامەزراند.

> **“ دەیانگوت وەکی مام عومەر چووە سلێمانی ئەوە مەعنای وایە یەکێتی مەعاشی تەوزیع دەکا ”**

ئـەودەم لەقوتابخانە قوتابییەکمان لەگەڵ بوو ناوی (ئیبراهیم حەمەد مەخمووری) بوو، لە ساڵی ١٩٦٥ لەلایەن حکوومەتی بەعس شەهید کرا. ئەو منی بردە ڕیزی (یەکێتیی گشتیی قوتابیانی عێراق) ئەمە دەروازەیـەک بوو، بۆ چوونە نێو حزبی شیوعی، بەڵام بەگوێرەی نیزامی داخیلی حزب دەبوو تەمەنت لە هەژدە ساڵ کەمتر نەبێ، ئەگەرنا هەروەکو لایەنگر دەمایەوە، دواتر زۆر لە برادەرەکانم وەک (جەوهەر غەمگین-ی شاعیر و نووسەر، شاخەوان نامیق و تاهیر عەلی والی) ئەوانە چوونە نێو یەکێتیی قوتابیانی کوردستان. ئێمە کۆمەڵێک بووین مابنەوە وەک (خەلیل ئیبراهیم، جەمیل عەبدوللەتیف و فەقێ ئەحمەد) و زۆری دیش، کە ئێستا ناوەکانیانم لە بیرە نەماوە. من مامەوە نەگۆڕام برادەرەکانم هەموو گۆڕان، من پێم جوان نەبوو، باوەڕم بە شتێک هەبوو، ئەوبەر ئەوبەریشم نەکرد، بەڵام تا وازیشیم لە



پارتییە، ئەوە حکوومەت داینایە، داوامان لە یەک دوو کەسی دیکەش کردیە، بچنە نێو ئەو حزبەی، نامانەوێت و پێمان خۆش نییە حزبی بەعس سەیتەرەی تەواوی لەسەر بکا و هەمووی سەر بە ئەمن و ئەوان بن، حەز دەکەین ئەتو وەکو نوێنەری ئێمە بچیتە نێویان و ئاگامان لەیەک بێت، چونکە سیقەمان بەتۆ هەیە.

**- جا چوویت، واتکرد؟**

+ بەڵێ چووم و وەرگیرام، دوایی بوومە ئەندامی لق-یش، هەتا ئینقلابیشیان لەسەر عەزیز عەقراوی کرد هەر مامەوە.

**- کێ ئیقلابی بەسەر عەزیز عەقراوی-دا کرد؟**

+ هاشم عەقراوی کردی، بەڵام من پەیوەندیم لەگەڵ عەزیز عەقراوی هەر مابوو، هاشم بەوەی دەزانی، هەتا نهێنییەکانی منیشی دەزانی. هاشم عەقراوی بەڕەحمەت بێت، ڕاستە لەگەڵ حکوومەتی بەعس بوو، بەڵام زۆر بێزار بوو، دەیزانی من بەعسی نیمە. زۆرجار تەلەفۆنی بۆ دەکردم، دەیگوت حەز دەکەم بێی پێکەوە دانیشین، لە ماڵەکەی مەمەرەکی سڕی دروست کردبوو، لەوێ پێکەوە دادەنیشتین و دەردە دڵی خۆی دەکرد.

**- هەتا کەی لەگەڵیان مایەوە؟**

+ هەتا ساڵی ١٩٧٩ مامەوە، دوایی وازم هێنا.

**- یەکەم نووسین، یان کەی دەستت بەنووسین کرد، چیت نووسی؟**

+ یەکەم نووسینم لەسەر هەولێر بوو، باشم لەبیر نییە، بەس دەزانم بەعەرەبیی بوو، بەڵام دوای ڕاپەڕین زیاتر هاتمە نێو دونیای نووسین و ڕۆژنامەگەریی، سەرەتا لە ڕۆژنامەی خەبات جارجارە لە شێوەی گۆشە بەناوی (من أعماق الذاكرة) دەمنووسی، وابزانم شەش حەفت ئەلقەیەکم نووسی.

ئەوکاتە نووسینگەی عەقاراتم هەبوو، نازانم فەریدوون عەبدولقادر بوو، یان فریاد ڕواندزی لە نووسینگەی هاتە لام داوای لێ کردم هەفتانە لە ڕۆژنامەی الاتحاد، کە ڕۆژنامەیەکی هەفتانە بوو، یەکێتیی نیشتمانی کوردستان دەری دەکرد،



حزب هێنا، بە تەواوی نەچووبوومە نێو حزب.

**- بۆ کەی وازت لەحزبی شیوعی هێنا؟**

+ ڕاستییەکەی لە ساڵی ١٩٦٤

**- لەبەر چی؟**

+ ساڵی ١٩٦٤ خەتێکی جیاواز لە نێو حزبی شیوعی بەناوی (قیادەی مەرکەزیی) دروست بوو، لە حزبیش دەرچوون، بەو هۆیەوە من وازم هێنا، ئەگەرچی لە حزبیش نەمابووم، بەڵام پەیوەندیم لەگەڵ (شەهید عادل سەلیم)ی سەرکردە، کە ماوەیەک مەسئولم بوو، هەر مابوو.

**- واتە لە نزیکەوە دەتناسی؟**

+ لەنزیکەوە دەمناسی، زۆر متمانەشی پێم هەبوو، هەتا جارێکیان داوای شتێکی لێ کردم، نازانم باسی بکەم، یان نا؟

**- ئا ئا باسی بکە، دواتر ئەگەر پێت باش نەبوو، بلاوی ناکەینەوە.**

+ ساڵی ١٩٧٤ دوای تێکچوونی پەیوەندی نێوان پارتی و حزبی بەعس، یادی بەخێر عەزیز عەقراوی حزبێکی بە ناوی پارتی دیموکراتی کوردستان دامەزراند، عادل سەلیم، کە تا ئەوکاتەش پەیوەندیم لەگەڵی مابوو، ناردییە دوام، کەچووم گوتی: ئەو حزبەی بەناوی پارتی دامەزراوە، ئەوە پارتی نییە، ئەوەی سەرەوە

> **عەونی یووسف یەک لەو کەسە ناودارانەی شاری هەولێر بوو، کە خەڵکی فێری (ڕۆژباش) کرد**

گۆشەیان بۆ بنووسم، بەڵام ئەگەر هەڵە نەبم فریاد رواندزی بوو، ئەوەبوو لەوێ دەستم بە نووسینی گۆشەکەم کرد بەناوی (هنا نلتقي كل السبت) دواتر (السبت)ەکەمان لادا بووە (هنا نلتقي) تا ٣١ی ئاب بەردەوام بووم، بیرمە دوا گۆشەم بەوناونیشانە بوو(هل نقرأ الفاتحة على البرلمان) دواتر ئەو ژمارەیەی ڕۆژنامەکەم لە سلێمانی دەست کەوت. دواتریش هەموو ئەو گۆشانەم کردە کتێبێک بەناوی (خواطر والذكريات) و هەر ئەو کتێبەشم هەیە.

**- چۆن، چما فەریدوون عەبدولقادر-ت دەناسی؟**

+ لەگەڵ فەرەیدوونی ساڵی ١٩٦٦ لە بەغدایی لە (المشاريع العامة)ی سەر بەوەزارەتی بەلەدیات بە یەکەوە فەرمانبەر بووین، من پێشتر لەوێ بووم، ئەویش گواسترایەوە ئەوێ، هەردووکمان کاتب تابیعە بووین. دوایی ئەو نەقلی دیوانی وەزارەت بوو، منیش نەقلی بەشی بەلەدیات-ی دیوان بووم هەر لەتەنیشت یەک بووین، بەوشێوەیە بووینە برادەر، زۆرجار فەرەیدوون عەبدولقادرم لەگەڵ خۆم دەبردە (ناوەندی ڕۆشنبیریی سۆڤیەتی)

**- بۆ لە بەغدا فەرمانبەر بوویت، ئەی ساڵی چەند دامەزرایت؟**

+ من لە مانگی ١٢-ی ساڵی ١٩٥٨ وەکو (قارئ المقياس) ئەوانەی سەعاتی ئاو و کارەبای دەخوێندەوە، لە تەمەنی بیست ساڵی بە مووچەی مانگانەی ٢١ دینار لەدائیرەی کارەبا دامەزرام، بەڵام دوایی ناچار بووم خۆم نەقل بکەم و بچمە بەغدایێ، چونکە لە هەولێرێ زۆر موزایەقە دەکرام، لەگەڵ یەکەکی گۆڕیمەوە، ئەویش کاتب تابیعە بوو، تا ساڵی ١٩٧٠ لەگەڵ فەریدوون عەبدولقادر فەرەج لەوێ ماینەوە، پاشی بەیانی (١١)ی ئازار زرووفی کوردستان خۆشتر بوو، گەڕامەوە هەولێر لە شارەوانی هەولێر دەست بەکار بووم. فەریدوون-یش چووەوە سلێمانی.

**- وەک لەو وێنانەی بڵاوت کردوونەتەوە دیارە، پێدەچێت ماوەیەکیش لە شاری حلە بووبیت؟**

+ دوای دامەزرانم خۆم نەقلی بەلەدیەی عەنکاوە کرد، ساڵی ١٩٦١ لە عەنکاوەی بە بڕیاری حاکم عەسکەریی بۆ شارەوانیی شاری حلە دورخرامەوە لەوێ بوومە نووسەر لەبەشی هونەریی، دوو ساڵ و شەش مانگ لەوێ مامەوە، لە ٤-ی نیسانی ساڵی ١٩٦٣ لە تەمەنی ٢٥ ساڵی لەلایەن (دەزگای حەرەس قەومی حزبی بەعس) دەستگیر کرام.

**- لەسەر چی؟**

+ لەسەر شیوعیەت، بەو ناوە گرتمیان، نۆ مانگ و دە ڕۆژ گیرام، هیچم لەسەر ئیسپات نەبوو، بەربووم، نووسرابوو (إفراج مع غلق التحقيق) بەو هۆیەوە لە وەزیفەش فەسڵ کرام و بۆ ماوەی یەک ساڵ بێ ئیش بووم، تا دواتر لە ساڵی ١٩٦٥ گەڕێندرامەوە.

**- لەژیانتدا چەند جار گیراویت؟**

+ ئەوجارە و جارێکیشیان لە هەولێر لەسەر شەڕێک، شتێکی وانەبوو چوار پێنج ڕۆژێک گیرام.

**- بیرتە چ ساڵێک تێکەڵی کاری ڕۆژنامەگەریی بوویت؟**

+ زۆر زوو خولیای خوێندنەوەی ڕۆژنامە بووم، ڕۆژنامەی (البلاد) هەبوو، هەفتەی جارێک لە بەغدا دەردەچوو بە بیست فلس بوو، منیش ڕۆژانەم بیست فلس بوو، ئەو ڕۆژە ئەو پارەیەم بەو ڕۆژنامەیە دەدا (الكلمات متقاطعة)ی تێدا بوو، حەلم دەکرد، زۆر مەراقم بوو، وابزانم هەر ئەو

> ***نازانم فەریدوون عەبدولقادر بوو، یان فریاد رواندزی لە نووسینگەی هاتە لام داوای لێ کردم هەفتانە لە ڕۆژنامەی الاتحاد، کە ڕۆژنامەیەکی هەفتانە بوو، یەکێتیی نیشتمانی کوردستان دەری دەکرد، گۆشەیان بۆ بنووسم***



هە ولێر - عومەر فەرهادی لەگەڵ کوڕی گەورەی - ئازاد و ئاواز کچی گەورەی لە ٥-٢-١٩٦٧

**عومەر فەرهادی لە گەڵ کوڕەکانی نەبەز و خوالێخۆشبوو ئازاد- باخچەی ئوممە- بەغدا ١٩٧٠/٧/١٤**

سالی، لە پاش سالی ١٩٥٨ رۆژنامەی (الزمان) هەبوو، لەبەغدا دەردەچوو ئاگادارییەکیان بلاوکردەوە، کە پێویستیان بە پەیامنێرێک هەیە لە هەولێر، لاپەڕەکیان هەبوو (الصفحة الطلبة) بۆ ئەو لاپەڕەیان بوو، منیش ئەوکات لە یەکێتیی گشتیی قوتابیان بووم، نامەیەکم بۆ ناردن، منیان کردە پەیامنێری ئەو لاپەڕەیە، هەواڵی قوتابیانم بۆ دەناردن، هەتا بەبیرمە ناوەکەمیان بلاوکردەوە، نووسیبوویان (عومەر فەرهادی).

**- یانی تۆ هەر لەسەرەتاوە بە ناوی عومەر فەرهادی بابەتت بڵاوکردووەتەوە؟**

+ بەڵی

**- هەست دەکەم زۆر هاتووچۆی بەغدا و شارەکانی دیکەی عێراق-ت کردووە، ئەمە خولیا بووە، یان بەهۆی کاری وەزیفیت بووە؟**

+ من پێش ئەوەی ببمە فەرمانبەریش، زۆر هاتووچۆی بەغدام دەکرد، بەشداری کۆنگرەی (الإتحاد النقابات العمال)یشم کردووە، کە ئەوکاتە فەرمانبەر بووم لە دائیرەی ئاو و کارەبا، بوومە ئەندام، دواتر بوومە سەرۆکی نیقابەکەش.

**- یەکەم جار، کە چوویتە بەغدا سالی چەند بوو، بۆچی چوویت؟**

+ سالی ١٩٥١ بوو، تەمەنم سێزدە ساڵ بوو. دوو مامم (مەلا سەعید و مەلا ئیبراهیم) بەڕەحمەت بن دەچوونە بەغدایێ، مەلا سەعید دووکانی هەبوو، مەلا ئیبراهیم-یش هەروا نازانم لەگەڵی دەچوو ئیشەکی لەوێ هەبووە، دەیانویست کوڕەکانی خۆیان ببەن (ئیحسان و عەبدولقادر) منیش بابم نەمابوو، گوتیان عومەر ئەتوش لەگەڵ خۆمان دەبەین، مامم بوون لەجێی بابم بوون، ئەوە یەکەم جارم بوو بەغدا ببینم، لە ئوتێلەکی دابەزین بە ناوی (فندق الفرح) لە (شارع الرشيد)

**- لە وێنەکانتدا دەردەکەوێت زۆر لەگەڵ عەبدولقادر-ی ئامۆزات سەفەرت کردووە؟**

+ ئاخر عەبدولقادر-ی ڕەحمەتی، هەم ئامۆزام بوو، هەم خوشکی گەورەی وی خێزانی من بوو، خوشکی منیش خێزانی ئەو بوو، دوایی عەبدولقادر، لە بەغدا لە وەزارەتی مەعارف بوو منیش، کە لە بەغدا بووم بەردەوام پێکەوە سەفەرمان دەکرد ڕەنگە ئەوە هۆکاربن، کە زیاتر تێکەڵاوی یەکدی بووینە.

**- یانی ژن بەژنیتان کردبوو؟**

+ نا ژن بەژنی نەبوو، وای لێهات، ئەمن دوو خوشکم هەبوو هەردووکیان بوونە خێزانی ئەو دوو برایە (عەبدولقادر و مەعرووفی برا

بچووکی)

**– سالّی چەند ژنت هێنا، خۆت هێنات، یان بۆیان هێنای؟**

+ بە بیرمە لە ١٠/٢٩ ی سالّی ١٩٥٩ تەمەنم ٢١ سالّ بوو ژنم هێنا، لە ٢٢ سالّیش بوومە باوک، دایکم هەر دەیگوت حەزم لێیە تا نەمردیمە منداڵت ببینم، مەراقی بوو، کوڕی گەورەی بووم و بابم نەمابوو. برا گەورەشم نەمابوو، منیش وەکی برێی بەخێوکەری مالّەکەی بووم، حەزیان کرد ژنی بینم.

**– چەند منداڵ، چەند کچ و چەند کوڕت هەن؟**

+ زۆر سەیر بوو (کوڕ + کچ + کوڕ + کچ +کوڕ) ئەوها بوو، کوڕی گەورەم (ئازاد) لە ٢٠١٥ کۆچی دوایی کرد، کوڕی دوایشم ناوی (فەرهاد) بوو بەناوی باپیرە گەورەم کردبوو، ئەویش بەنەخۆشی لە سالّی ١٩٩٥ کۆچی دوایی کرد، ئێستە دوو کچ و کوڕێکم ماون و لەگەڵ کچەکانم بە یەکەوە دەژین.

**– بەردەوام وابینراوە و هەستکراوە، کە زۆر لە یەکێتی نیشتمانی کوردستان نزیکیت، ئایا تۆ ڕۆژێک لە ڕۆژان یەکێتی بوویتە؟**

+ نەخێر حزبی نەبوویمە، بەلاّم دەتوانم بلّێم بیروباوەڕ و فیکری چەپڕەوی و بوونی هەندێک برادەر وایان کردووە لە یەکێتی نزیک بم. دژی پارتیش نەبوویمە، بەلاّم پارتی نەبوویمە، کە کاتی خۆشی هەر شیوعی و پارتی هەبوون، من شیوعی بووم.

**– باشە ئێستە هەستت بۆ حزبی شیوعی چۆنە؟**

+ ئەو حزبی شیوعییەی، کۆن ئەمە تێیدا ئەندام بووین لە (پەنجاکان، شەستەکان، حەفتاکان و بلّێین هەتا هەشتاکانیش) شتێک بوو، ئێستە بارودۆخی هەموو دونیا گۆڕاوە، کوا چما شیوعییەت وەکو جاران ماوە؟.

**– واتە باوەڕت بە گۆڕان و گۆڕانی مرۆڤ هەیە؟**

+ تەبعەن، گۆڕانکاریی قۆناغە، کە شیوعییەت پەیدابوو پێشی وی شتی وانەبوو، شتەکی نوێ بوو، ئێستە بارودۆخێکی دیکەیە، بەلاّم من هەر خۆم بە قەرزاری ئەو قوتابخانەیە دەزانم، کە لەوێ چاوم کردەوە و هاتمە نێو دونیای سیاسەت.

**– شەڕی ناوخۆ، وەکو بیرەوەرییەکی تاڵ چی لای تۆ جێهێشتووە؟**

+ زۆر ناخۆش بوو زۆر، دوو بەشی، دوو ئیدارەیی، سنوورێک تا دیگەلەی لەو لایە پارتی و لەولای یەکێتی، سالاّنی پاش ١٩٩٦، کە دوو ئیدارەیی ڕووی دا من زۆر هاتوچۆی سلێمانیم دەکرد.

**– ئەو هاتووچۆیەی تۆ چۆن بوو، بە چ مەبەستێک دەچوویتە سلێمانی؟**

+ دەچووم سەردانی ئەو برادەرانەم دەکرد، کە لە ڕۆژنامەی الاتحاد بە یەکەوە کارمان کردبوو، سەردانی عادل موراد-م دەکرد، کە ئەوکاتە بەرپرسی مەکتەبی ڕاگەیاندن بوو، چووم پەیوەندییەکانم زیندوو کردەوە. دواتر ڕێکخراوە دیموکراتییەکان، کە ئەوکات مەلا بەختیار لێپرسراوی بوو، دەیانویست وەک هاوکاریی پارە بۆ ژمارەیەک نووسەر و هونەرمەندی هەولێر بنێرن، باسی ئەوە کرا چۆن بینێرن و پێیان بگات، پێشتریش ناردبوویان، بەلاّم وەک پێویست نەگەیشتبووە دەست هەموویان، داوایان لە من کرد، ئەو ئەرکە بگرمە ئەستۆ، بە بیرمە لیستێکی سی و شەش کەسییان کرد، بیست و چوار نووسەر و ڕۆژنامەنووس و دوازدە


***"داوایان لە من کرد، ئەو ئەرکە بگرمە ئەستۆ، بە بیرمە لیستێکی سی و شەش کەسییان کرد، بیست و چوار نووسەر و ڕۆژنامەنووس و دوازدە هونەرمەند، وابزانم هەریەکە و سێ سەد، یان دووسەد و پەنجا دینار بوو، بۆیان دەناردن"***




لە دەستە ڕاستەوە: عەبدولرەحمان فەرهادی، سمکۆ عەبدولکەریم، کەریم دەشتی، عومەر فەرهادی، سەعدوڵلا پەرۆش، نازم دلبەند



عومەر فەرهادی لەکاتی خەڵاتکردنی لەلایەن قونسڵیەی ئەمریکا لە هەولێر

هونەرمەند، وابزانم هەریەکە و سێ سەد، یان دووسەد و پەنجا دینار بوو، بۆیان دەناردن.

**– هەموو ئەوانەی پارەیان بۆ دەهات حزبی بوون؟**

+ نەخێر هەندەکیان حزبی بوون، هەندەکیشیان وەکو من حزبی نەبوون، بەڵام لەسەر یەکێتی حیساب بووین، وەختی خۆی نانیان برابوو، هەندێکیان دوایی بوونە پارتی و پارەکەیان لێ برین، هەندێکیشیان خۆیان گوتیان نامانەوێ.

> ***من شێخی پەیامنێران بووم لەبەر ئەوەی لە هەموو پەیامنێرەکان بە تەمەن تر بووم، ئەو ناوەیان لێنام، وەک قەدر گرتن***

**– پارتی بەوەی دەزانی؟**

+ نازانم، بەڵام هەندێک برادەرم لەنێو پارتی هەبوون، دەیانگوت وەکی مام عومەر چووە سلێمانی ئەوە مەعنای وایە یەکێتی مەعاشی تەوزیع دەکا. حاکم شاکر رۆژبەیانی بەو دواییە بەخۆی دەیگێڕایەوە، دەیگوت وەکی (مام عومەر) دیار نەدەما، دەمانزانی چوویتە سلێمانی و مەعاشە.

**– هیچ جارێک بانگ کرایت و لێپرسینەوەت لەگەڵ کرا؟**

+ نەخێر بە هیچ جۆرێک دەستیان نەهێنایە رێم و بانگیش نەکرام.

**– کەی و چۆن بۆ یەکەم جار بوویتە پەیامنێری دەنگی ئەمریکا لە هەولێر؟**

+ ساڵی ٢٠٠٠ بۆ یەکەم جار کوردێکیان وەک سەرۆکی بەشی کوردیی دانا، چونکە لە ساڵی ١٩٩٢-وە تا ئەوکاتە، سەرۆکی ئەم بەشە ئەمریکییەک بوو. یەکەم سەرۆکی بەشی کوردیی عومەر دزەیی بوو. عادل موراد بە سوتفە لە ئەمەریکا دەبێت، عومەر دزەیی پرسی پێدەکات و دەڵێ دەمانەوێ لە سلێمانی، هەولێر و دهۆک پەیامنێر بۆ بەشی کوردیی دەنگی ئەمریکا دابنێین کێ باشە؟ ئەویش بۆ سلێمانی یەکسەر ناوی (لەتیف نێروەیی) دەداتێ. لە دهۆک-یش سەلام باڵایی، کە ناوەکەی (یووسف باڵایی) بوو دانرا. تەلەفۆنێکیش بۆ محەمەد ئەمین پێنجوێنی دەکات لە ئەڵمانیا، ناوی منی پێ دەڵێن، ئەویش دەڵێ لێگەڕێن من خۆم دەیناسم و قسەی لەگەڵ دەکەم. من و عومەر دزەیی لە ساڵی ١٩٥١ لە قوتابخانەی (اربیل ثانی) لە یەک پۆل بووین یەکدیمان دەناسی، تەلەفۆنی بۆ وریای برازای کردبوو، رایسپاردبوو، دواتر خۆی تەلەفۆنی کرد و رێککەوتین. لەمانگی ٤-ی ساڵی ٢٠٠٠ یەکەم راپۆرتم بۆ بەشی کوردیی رادیوی دەنگی ئەمریکا نارد.

**– ماوەی چەند لە وێ کارت کرد؟**

+ ماوەی پازدە ساڵ و شەش مانگ، لە مانگی ٤-ی ساڵی ٢٠٠٠ تاکوو مانگی ١٠-ی ٢٠١٥ لەو ماوەیش نزیکەی٢٥٤٤ راپۆرتم بڵاوبووەوە، هەمووشم ئەرشیف کردووە و ماوەمە.

**– دواجار بۆ وازت هێنا؟**

+ بەڕاستی تاقەتم نەما، تاقەتم چوو، شەکەت و ماندوو بووم.

**– کێ نازناوی شێخی رۆژنامەنووسانی لێنای؟**

+ شێخی رۆژنامەنووسان، ئەو شێخە، من نیمە، نەقیبی سەندیکای رۆژنامەنووسان شێخە، من شێخی پەیامنێران بووم لەبەر ئەوەی لە هەموو

پەیامنێرەکان بە تەمەن تر بووم، ئەو ناوەیان لێنام، وەک قەدر گرتن و ئیحترام.

**- لە ساڵی چەند خانەنشین کرایت؟**

+ لە ساڵی ١٩٨٨ خانەنیشن کرام، سێ ساڵی پێچوو ڕاپەڕین کرا، چەند ساڵێک مووچە نەما، دوایی گوتیان دەتوانن بچن لە پردێ خانەنشینەکەتان وەربگرن، دوای ڕووخانی ڕژێمی بەعس دامەزرامەوە، زیاتر لە ٣١ ساڵ خزمەتم هەبوو، دواتر جارێکی دی خانەنشین کرامەوە.

**- ئێستە بە چی خەریکی؟**

+ بەهیچ، ڕۆژانــە دەچـمـە (بـاخـی شـار)ی خانەنشینان، بەیانیان زوو دەچم ڕۆژنامەی (شرق الاوسط) وەردەگرم، سێ دووکاندار، عەلاقێک و ڕۆنگۆڕێک و ئەفسەرێکی خانەنشین لە نزیک ماڵمان هەن، ڕۆژانە ئەو ڕۆژنامەیان بۆ دەبەمەوە، ئەوانیش هەموو جارێک ڕەحمەت بۆ دایک و باوکم دەنێرن، منیش پێیان دەڵێم دە جارێکیش ڕەحمەتێکیش بۆ من بنێرن.

**- خۆت لەگەڵ خوێندنەوە چۆنی؟**

+ ماوەیەکە چاوم باش نییە، چاوم هیلاکە، هەست بە ماندوویتی دەکەم، هەتا لەرۆیشتن ئەو توانایەم نەماوە، ناوێرم بچمە دکتۆری، دەترسێم شتێکم بۆ بدۆزنەوە، کە پێم نەکرێ عیلاجی بکەم، نازانم بەو تەمەنی هەشتا و پێنج ساڵ و چوار مانگییەی بچم، نەچم.

**- لە ژیانتدا زیاتر بە چ نووسەر و هونەمەندێک سەرسام بوویت؟**

+ وەک گۆرانیبێژ بە (محەمەد عەبدولوەهاب) زۆربەی گۆرانییەکانی بە شیعرەکانیشیەوە



عومەر فەرهادی لەگەڵ کۆمەڵێک لە ئەدیب نووسەران - سلێمانی ٢٨/٤/١٩٩٨

بووبوون. ڕۆمانی (حمار الحكيم)ی توفیق حەکیم ناونیشانەکەیم زۆر لا سەیر بوو، دوایی زوو ئالودەی ئەو کتێبە عەرەبیانە بووم.

**- ڕات بەرانبەر ئەو کەسایەتی و شاعیرانە چییە؟**

**عەونی یووسف؟**

+ عەونی یووسف یەک لەو کەسە ناودارانەی شاری هەولێر بوو، کە خەڵکی فێری (ڕۆژباش) کرد، هیوایەتی ڕاوکردن بوو، تاژی بەخێو دەکرد، سواری ئەسپ دەبوو، کەسێک هەبوو ناوی ئەنوەر بوو ئەسپەکەی بۆ دەبرد، ئالیکی دەدایێ، بەخێوی دەکرد، دەیهێنا و دەیبرد.

ساڵی ١٩٤٨ کە باوکم گیرا ئەویش لەگەڵیان گیرا بوو، من پەیوەندی تایبەتیم لەگەڵ عەونی یووسف هەبوو، کە ماڵی لە بەغدا بوو هاتووچۆم دەکرد.

**پیرباڵ مەحموود؟**

+ پیرباڵ مەحموود، لە تەمەنەکی زۆر زوو ناسیم پێی سەرسام بووم، چونکە من خۆم زەوقی شیعریم هەبوو، ئێستەش شیعرێکی زۆری عەرەبیم لەبەرە. من پۆلی یەکی ناوەندی بووم، ئەو لە پۆلی دوو بوو، شیعری دادەنا، دوایش لە بەلەدییەش بە یەکەوە بووین، وەک موراقیب دانرابوو پێیان دەگوت (کەشاف) عەرەبی زانێکی زۆرباش بوو، هەستێکی شیعریی زۆر بەقوەتی هەبوو، باوەڕ بکە شیعری وای هەیە، لەوانەیە عەرەبەکی عەرەبیزان دەرچووی بەشی عەرەبیی نەتوانێت خۆی لە قەرەی بدات.

**سەعدوڵلا پەرۆش؟**

+ سەعدوڵڵا پەرۆش زیاتر دوای ڕاپەڕین پەیوەندییم لەگەڵی هەبوو، لەتەمەن برەک لێک دووربووین، کەسێکی دڵخۆش و خۆش بوو، دەتوانم بڵێم لە دۆست و برادەرە هەرە نزیکەکانم بوو، زۆر لێک تێدەگەیشتین، ئێستاکەش جێی دیارە، دەتوانم بڵێم هەندەک شوێن هەبوون، پێکەوە لێی دادەنیشتین، ماوەیەکی زۆرە، کە ئەو نەماوە، سەردانی ئەو شوێنانە ناکەم، دێتەوە بیرم، لەڕووی شیعر و ئەدەبیش هەستێکی ناسک و جوانی کوردەواریی هەبوو، پیاوێکی دەست و دەم پاک بوو.



عومەر فەرهادی، پیرباڵ مەحموود ٢٠٠١/١/٢٩

لەبەرمە. لە ئەدیبەکانیش بە پلەی یەکەم بە (جوبران خەلیل جوبران) زۆر سەرسام بووم ئێستەش زۆربەی شیعرەکانیم لەبەرە. شیعرەکانی (إبراهیم مازن و میخائیل نەعیمە) ئەوانە نووسەری زۆر گەورە بوون لە ڕۆماننووسەکانیش بە (نەجیب مەحفوز) سەرسام بووم، قوتابیی پۆلی سێی ناوەندی بووم، یەکەم ڕۆمانی ویم خوێندەوە، بە (١٢٠) فلس کڕی بووم، شەش ڕۆژ ڕۆژانەم خەرج نەکرد، ئەو کتێبەم پێ کڕی، برادەرێکم هەبوو ناوی (تەڵعەت نادر) بوو ئەو (نەجیب مەحفوز)ی پێ ناساندم، پێش ئەو هەر (یووسف ئەلسباعی، ئیحسان عەبدولقەدوس، توفیق حەکیم)م گوێ لێ

## تۆ بۆچی بە کوردی دەکۆکی

زیرەک دەبینێ میرزا کەریم بۆ زیرەک زۆر خەمبارە، دەڵی کاکە گوێ بگرە، ئەمن لەم جۆرە بەد بەختیانەم زۆر بەسەرهاتووە، لە تەوریز زیندانی بووم، ژاندرمەیەکی پیسکەی (عەجەم) هەبوو دەستی پێم فێر ببوو شەو بێری لێ نەدەکردم و بەهانەیەکی دەدۆزیەوە و دەیگرتم و تێری لێ دەدام! ڕۆژێک بۆ سەر ئاو ڕیزیان کرد بووین، من لە ڕیزا کۆکیم، ئاوری دایە و بۆم هات و بە تورکی گوتی: (ولان ئەی .......) من پێم نەگوتی بە کوردی قسە نەکەی؟! زیندانییەکان ئاوڕیان دایەوە، منیش زانیم دەیەوێ هەنجەتم پێ بگرێ و لێم بدات، لە دڵی خۆمدا گوتم: با بە دڵی ئەوان قسە بکەم؛ بەڵکو چیدی لێم نەدەن و بیدەمە لای بێعاری و وتم: کوا بە کوردی قسەم کردووە؟ وتی ئەی بۆ بە کوردی ئەکۆکی؟ منیش دەنگم هەڵبڕی و ڕووم کردە زیندانی و زیندانیانەکان و بە پێکەنینەوە وتم: کوا من بە کوردی کۆکیوم، ئەگەر بە کوردی کۆکیبام ئێستا تۆ حاڵی نەدەبووی! زیندانییەکان پێکەنین و ڕوویان لە ئاغا (شێر ئالی) کرد و گوتیان: توو خوا چیدی لە حەسەن مەدە حەسەن کوڕێکی چاکە! جا کاکە ئەگەر بڵێم بێ گوناه لێیانداوم و نیوەی عومرم هەر بە تێهەڵدان بردووتە سەر، لەوانەیە باوەڕ نەکەی! لە بەختی من هەزار هەندە! زیرەک هەندێک نهێنی هەبوو کە نەیدەتوانی بیدرکێنێ!

پیاوانی (زەدەی ئیتلاعات)ی ئەوسا کە ڕاویان نابوو، وەک خۆی ئەڵێ لە هیچ جێگایەک نەیان دەهێشت جێگای بێتەوە و بە ئاسوودەیی بژیێ! ئازاریان دەدا.

لێیاندەدا بۆ زیرەک وەک خۆی دەڵێ: نیوەی تەمەنم هەر لێیان داوم، زۆرجار بۆ خۆشم نازانم بۆ چی لێیانداوم!؟

## بۆیە لێمداوە چونکە زۆر ناودارە

مامۆستایەکی بەڕێز لە سلێمانی بۆی گێڕامەوە: لە سلێمانی سالانێک زیرەک لەسەر شەقام ساردی فرۆشتووە، گەنجێکی وەرزشکاری لە خۆبایی شەقاوەچی ڕۆژێک زیرەک دەداتە بەر بۆکس و هەموو سەروچاوی دەکاتە خوێن، کەسانێک بەو وەرزشکارە شەقاوەچیە دەڵێن: تۆ بۆچی لە زیرەک-ت داوە، بۆ خۆی لەم سەرشەقامە کاسبی دەکات و ساردی دەفرۆشێ، چ زیانێکی لە تۆ داوە؟ لە وەڵامدا کابرای شەقاوەچی دەڵێ: وەڵڵا بۆیە لێم دا ئەوە کەسێکی زۆر مەشهور و ناودارە، منیش لێمدا تا پێم بڵێن (...) لە کەسێکی ناوداری داوە!؟

## لەسەر گۆرانی گوتن لە بەندیخانە لە زیرەک دەدەن

دکتۆر سەرکەوت ئەمین۱۱ لە سلێمانیەوە بۆی گێڕامەوە گوتی: (خاڵۆم لە سلێمانی لە بەندیخانە بوو، هونەرمەند حەسەن زیرەکیش ئەوکاتە سجن بوو، گوتی شەوێک زیرەک لە گۆشەیەکی بەندیخانە ئەگری و ئەناڵێنێ، ئەوکات (کەمالی شەفیق) ئەویش سجن بوو، کە دەنگی زیرەک ئەبیسێ، ئەپرسێ چییە زیرەک بۆچی ئەگری چی بووە؟ زیرەک ئەڵێ هیچ نییە! بۆ جاری دووەم کەمالی شەفیق ئەپرسێ و ئەڵێ لەسەرچی لێیانداوی؟ زیرەک دەڵی لە سەر گۆرانی گوتن بە سێ چوار کەس لێیان داوم منیش لەوانم دایەوە، کەمال ئەپرسێ کێ بوون ئەوانەی لێیانداوی؟ زیرەک دەڵێ: لێیان گەڕێ با کێشەکە گەورەتر نەبێ! کەمال شەفیق وازناهێنێ و ناوی کەسەکانی لێ دەپرسێ؟ کە زیرەک دەڵێ ئەمانە بوون، سێ چوار کەس بوون؛ کەمالی شەفیق خۆی کەسێکی ئازاو نەترس بووە، ئەچێتە گیانی هەر هەموو ئەوانەی لە زیرەکیان داوە، لێدانێک لێیان دەدات بۆ زیرەک و هەموو کەسێکیان تەمبێ دەکات، جا بە زیرەک دەڵێ: بۆ خۆت لە مەودوا بە ئارەزووی دڵی خۆت شەو و ڕۆژ گۆرانی بڵێ؛ جا پیاوم دەوێ ڕێ لە گۆرانی گوتنی تۆ بگرێ! لێرە لەسەر ئەوە لێیانداوە چونکە زیرەک گۆرانی گوتووە! زۆرجاریش لێیانداوە، چونکە گۆرانی نەگوتووە!؟ ئەمەیە حاڵی زیرەکی هونەرمەند لەنێو حەوزێکی لێخن دا!

## زەدەی ئیتلاعات داوام لێدەکات کاریان بۆ بکەم

ئەو هەموو لێدانەی زیرەک لە لایەن کەسانی نادیار و دیارەوە دەبێتە مەرەق بۆ میرزا کەریم خۆشناو و دەڵی: دوای مردنی چاوم بە کاک (حوسێن زیرەک )ی برای کەوت پاش هەندێک دوان دەربارەی زیرەک و لە دوایی دا لێم پرسی و گوتم : ئەرێ کاکە خۆ (حەسەن زیرەک)ی خوا لێخۆش بوو خەراپەی کەسی نەبوو حەزیشی لە شەڕ و کێچەڵ نەبوو بۆچی تا لە بانە بوو دوو سێ جار لێیان دا؟ گوتی: ئێمە چەند جار پێمان گوت کاکە ئەتۆ تەنیا خۆت و براژنە (ڕابیعە)ی ژنت و ئارەزوو و ساکاریش لای دایکیانن، ئێمە زۆر چاک ئەتوانین بەخێوتان بکەین، یان وەرە ئێرە کاسبی بکە و ئێمەش یارمەتیت ئەدەین و چاویشمان لێت دەبێ کەسیش ناتوانی بێ خود شەڕت پێ بفرۆشێت.

پێکەنی و گوتی: باوکم خۆ منیش ئەوەی تۆ دەیڵێی ئەیزانم و زۆریشم بەلاوە چاکە بەڵام، ئێوە شتێک ئەزانن و منیش زۆر شت، من بەلاتان لێوە دوور دەخەمەوە!

منیش گوتم: بەلای چی کاکە ئەو هەموو مودەتە ئێمە ئاگامان لە مردن و ژینی یەکتر نییە! ئەو بەلایەی دێتە



**زیرەک لە بەندیخانەی سلێمانی لەگەڵ کەمالی شەفیق**

خوارەوە با ئێمەش شریکی غەم هەڵگرت بین خەمێکت بۆ بخۆین! تەمەشایەکی ئەولاو ئەم لای خۆی کرد و بەدەنگێکی نزم گوتی: حوسێن (زەدەی ئیتلاعات) ئەزیەتم دەدا و دەڵێ ئەبێ بچیتە ئەو دیو ئیشمان بۆ بکەی! چەندی دەڵێم باوکم ئەمن هی ئەو شتانە نیم و (سەوادیشم) نییە ئێوە چۆن ئیستیفادە لە من ئەکەن؟ ئەڵێن ئەتۆ بەماڵەوە برۆ بۆ عێراق ئێمە پارەیەکی زۆرت دەخەینە ئیختیار و خۆشمان خەڵکت بۆ دەنێرین تۆش هەرچی مەعلوماتت هەیە پێیان بڵێ و ئەوانیش بۆ ئێمەی دەهێننەوە! هەڵبەت خۆشت ئەزانی ئەم جۆرە شتانە بە من ناکرێت و ئەگەر پێشم بکرێت نایکەم با ساڵی دوو سێ جار تێم هەڵدەن بە فەقیریش ئەژیم و بەلام (ئەو کانیەی ئاوم لێخواردووتەوە هیچ کاتێک بەردی تێناخەم و خیانەت بە خاکەکەی عێرقیش ناکەم) لەنێو خەڵکیش سەر بەرز ئەژیم. لە دوایی بە شۆخیەوە پێکەنی و گوتی بەتەنیا بەربەرەکانی دەوڵەتیش ئەکەم- ب۲، ل۹۲)

**شاگردەکەم هاواری کرد وەرن زیرەکیان کوشت**

میرزا کەریم، ئەو میرزا کەریمەی زیرەک لە کاسێتە دەنگییەکەیدا دەڵێ: میرزا کەریم، ئەمڕۆ من لە ئێرانا لە سایەی ئەودا دەژیم! ئەو میرزا کەریمە بەردەوام گۆشەی نهێنی و تاریکی ژیانی زیرەکمان بۆ ئاشکرا دەکات و دەنووسێت: ڕۆژێک بە یانی ڕابیعە خانم هات بۆ ماڵی ئێمەو گوتی : کاکە ئێمە لێرە نامێنین لە گەڵ قسە کردنیشی دەستی کرد بە گریان! گوتم ئاخر چی بووە چی ڕوویداوە با منیش بیزانم؟
ڕابیعە خانم گوتی : کاکە وابزانم ئەگەر چیتر لێرە بمێنینەوە لەوانەیە شەوێک هەر بشمان کوژن۱۲ گوتم: ئاخر چی بووە چی ڕوویداوە با منیش بیزانم؟
ڕابیعەخانم گوتی ئەم شەو ئەوەندەیان بە لوولەی تفەنگ لە (زیرەک) داوە و هەرچی پولی هەشمان بوو هەموویان لێ ستاندووە، هیچمان نەماوە، منیش زۆرم پێ سەیر بوو، دیسان بۆ لە زیرەکیان داوە ئەبێ هۆی چی بێت، هەڵسام بە پەلە جلم گۆڕی و سواری ماشینەکەم بووم چووم بۆ(کانی مەلا ئەحمەد) دیم (زیرەک) لەسەر کورسی دانیشتووە، کە چاوی پێم کەوت زانی زۆر نارەحەتم و بە پەرۆشم بۆی هەڵسایەوە زەردەخەنەیەکی کرد و گوتی: ئەمە بە هاوارمەوە هاتووی؟
گوتم: ئەمە چیت لێ قەوماوە؟
دەستی بۆ کراسەکەی برد و هەڵیدایەوە و گوتی: سەیرکە؛ کاکە بزانە چیان بەسەر هێناوم! کە سەیری سینەو پشتیم کرد بەڕاستی موچرکە بە بەری پێمدا هات و لە تۆقی سەرمەوە هاتە دەرەوە، جێگای هەر لوولە تفەنگی لێیان دابوو وەک بلێی بە بۆیە شین ژمارە پێنج لەسەر سینگ و پشتی نووسرابێ وابوو، جێگای قۆنداغی تفەنگ بە پانی و درێژی قۆنداغەکە پشتی زیرەکی شین و مۆر کرد بوو.
گوتم: زیرەک ئەتۆ ئەوانەت ناسی؟
گوتی: نە بە خوا نەمناسین، بەلام کوڕە جحێلێکی بالا بەرزیان تێدا بوو زۆر لایەنگری لێوە کردم بە ڕاستی ئەو نەبووایە شپرزەیان دەکردم، زۆری تریش هەتیوێکی خرکەلەی چوار شانە شرۆری تێدابوو زۆر بەبێ وجدانی لێیدام ئەو هەتیوە پیسە هەر هاتوو غاریدایە ژوورەوە و شووشەیەکی ویسکی کوپەیی هەڵپچڕی نای بەسەردەمیەوە (...) وەک عەسابەی فلیمەکان فڕی لێ دەدا و جوێنێکی پێدەدام، ئاخیر من خۆم پێ نەگیراو گوتم: هەی ناپیاوی نائینسان، ئەتۆ دزی، یان ویسکی خۆری؟ دانیشە با خزمەتت بکەم! شووشەکەی داناو گوتی: هەی پیرە دایکت۱۳ ئەوە من بە پیاو نازانی، ئەم جارە بە هەردوو دەستی تێمبەر بوو ئەگەر ئەو کوڕە

بالا بەرزە نەبووایە بەخوا شری ئەکردم! گوتم هاتوونە سەرت و لێیان داوی و هەموو لەشیان شکاندووی سەرەڕای ئەم هەموو لێدانە مەتحیان دەکەی؟ گوتی: ڕاستە ئەو نەوعە کەسانە هی مەتح کردن نین، بەلام دەگوترێ ئەویان لە ئەوەی تر چاکترە، بەلام چاکیان تێدا نییە! گوتم: شکاتت کردووە؟ گوتی: لە پێش تۆ (ژاندارمە)کان لێرە بوون و (باز جۆیان) لێ کردم، ئێ خۆ ناشوێرم بڵێم وەک مەسەلەکەیە کابراش دەکوژن و لەگەڵ جەنازەکەی ئەڕۆن!

گوتم: زیرەک ئەتۆ ئەزانی بۆچی لێت ئەدەن، بۆچی بە من ناڵێی؟

بە دڵێکی پڕ باوەڕەوە سەیری منی کرد و گوتی: ناوێرم دەردی خۆم بۆ کەس دەربڕم، بەلام هەڵبەت شت لەتۆ ناشارمەوە، ئەگەر تۆزێک سەبر بگری و عەجەلە نەکەی تا وەختی خۆی دێت!

گوتم: یەعنی چی کاکە گیان قسە کردنیش سەبری دەوێ؟

گوتی: پێم نەگوتی وەزعی من وەزعێکی (مەعمولی نییە) ناوێرم دەردی دڵی خۆم لای هەموو کەس بکەم! بەلام ڕۆژێک دێت پڕ بەدەم هاوار بکەم و خەڵکیش حاڵی بکەم کە بۆچی نایەڵن لە هیچ شوێنێک بحەوێمەوە و هەر وەختێکی ئارەزووشیان لێ بێت ئەوە بەهانەیەکم بۆ ئەدۆزنەوەو تێروپڕ تێم هەڵدەدەن و دەڕۆنەوە!

سەرم لە وەزعی زیرەک سوڕما بوو هیچی لێ حاڵی نەبووم ناچار هیچی تر لێم نەکۆڵیەوە. دوو سێ ڕۆژ هێنایان و بردیان و دواجار پێیان گوت: کاکە تۆ چی دەکەی لەم چۆڵ و دوورە شارە، بە قسەی ئێمە دەکەیت بڕۆ جێگایەکی تر بۆ خۆت کاسبی بکە باشترە هەتاکو شەوێک نەشیان کوشتوی؟!

## گۆرانی خان باجی زیرەکی بە لێدان دا

دوا جاربە ناچاری کەل و پەلەکانی چایخانە هەراج دەکا و زیرەک سەرهەڵدەگرێ! میرزا کەریم بەردەوامە لە گەڕان بە دوایی زیرەک، گوتیان لە سابلاغە، چووم ماڵەکەم دۆزیەوە و لە خاوەن ماڵم پرسی کوا زیرەک؟ گوتی وەرە دانیشە تا بەسەرهاتی زیرەک-ت بۆ بگێڕمەوە! گوتی: لەگەڵ ڕابیعە خانم هاتنە ئێرە، من لێرە ژوورێکم پێدان، ئێوارەیەک زیرەک لەگەڵ هەندێک برادەر دەچێتە دەرەوە بۆ (ڕێستورانی – ئیپریم) برادەران سەرگەرم دەبن و داوا لە زیرەک دەکەن گۆرانییان بۆ بڵێ؛ زیرەک دڵیان ناشکێنێ و گۆرانی (خان باجی)یان بۆ دەڵێ و دانیشتوان گوێیان لەدەنگی زیرەک دەبێت دەست دەکەن بە چەپڵە لێدان و فیکە لێدان، بە جۆرێک دەنگیان دەگەیشتە خیابان، لە خیابانیش پۆل پۆل خەڵک دەهاتنە بەر دەرگای ڕێستوران و ئەوانیش دەستیان بە چەپڵە لێدان کرد، سابلاغیش هەمیشە لە ژێر چاودێری دابوو، لە ئیختیناق دا ئەژیان لە لایەن دەوڵەتی ئێرانەوە، ئەم شتە هەمیشە وابوو نەیاندەهێشت خەڵکی زۆر پێکەوە کۆ ببنەوە!

ئەفسەرێکی (شهربان) هەمیشە لە گەڕان بوو لەگەڵ چەند پاسەبانی چەکدار، ئەگەر نزیک ڕیستورانی ئیپریم ئەم هەموو شلۆقیە دەبینن، یەکسەر ڕوویان کردە ئەوێ، پاسەبانەکان یەکسەر لە ماشێن دابەزین و غاریان دایە سەر خەڵکە کە دەستیان کرد بە بەدەرکردن و بلاوکردن و پاڵدانی خەڵک، بەلام خەڵک ڕاهاتبوون لەولا پاڵ ئەدران و لەوسەر خۆیان پێدا ئەکردەوە.

ئەفسەرەکە چووە ژوورەوە دی جێی دانیشتن نەمابوو خەڵک بە پێوە چەپڵە لێ ئەدەن و گۆرانیەکە دەگێڕنەوە، ڕووی کردە زیرەک و هاواری کرد و لە سەرخۆبە ئەمە چیە ئەم جێگایەتان شلۆغ کردووە؟ کەس گوێی نەدایە ئەفسەرەکە و زیرەکیش گوێی نەدایێ تا گۆرانیەکەی تەواو کرد و گوتی جەناب سەروان گۆرانی گوتن قەدەغە نییە، ئەتۆ بۆ هاتی زەوقی ئێمە دەشکێنی؟

ئەفسەرەکە گوتی: ئەم شلۆغیە قەدەغەیە، ئەم شێوە گۆرانیە کە ببێتە هۆی کۆبوونەوەی خەڵک قەدەغەیە! زیرەک گوتی: کاکە بۆچی لای ئێوە گۆرانی ئەڵێن و ڕەقسیشی بە دەمەوە ئەکەن لەسەر ڕۆخی خیابان یان لەناو پارکێک زۆر لێرە شلۆغ ترە بۆچی بۆ ئەوان قەدەغە نییە، بۆ ئێمە کە لە ناو چوار دیواری ئەم ڕێستورانە تەنها یەک دەرگای هەیەو بێ پەنجەرەیە، بە گۆرانی دەردی دڵی خۆم بە با بدەم بۆ دەبێ مانعتان هەبێ؟

قسەیەک لە ئەفسەرەکە و قسەیەک لە زیرەک، ئەفسەرەکە یەک زڵلەی لە بنا گوێی زیرەک دا! زیرەکیش نەیکردە نامەردی و هەڵسایەوە پێوە و هەتا تێنی تێدا بوو زڵلەیەکی لەبن گوێی ئەفسەرەکە دایەوە و پشتاو پشت بەری دایەوە، خەڵکی دەوروپشتی دایان پەلۆسیە سەریەک و بوو بە شەڕێک لە هەموو ئێرانت نەیانتوانیوە ئاوا لە ئەفسەر و پاسەبان بدەن وایان لێ کردبوون خۆیان پێ لەسەر پێ ڕانەدەگیرا، یەک لە پاسەبانەکان هەلاتبوو خۆی گەیاندبووە شەهرەبانی و ئاگاداری کردبوونەوە ئەوا لە ڕێستورانی ئیپریم خەڵک لە ئەفسەر و پاسەبانەکان دەدەن فەوری دەبێ بگەنە فریامان.

ئەوەندەی پێ نەچوو دوو ماشێن پڕ لە پاسەبانی

چەکدار لە بەردەم ڕیستوران خۆیان فڕێدایە خوارەوەو غاریان دایە ژوورەوە دەستیان کرد بە لێدانی خەڵکەکە، ئەو جارە بووە بای پاسەبانەکان تۆڵەی ئەوانی تریان کردەوە، هەموویانیان خستە نێو ماشێن و بەتایبەت ئەفسەرە کە زۆری لە زیرەک دا و دوو دەستی لە پشتەوە بەستەوە لەبەرچاوی خەڵک دایە بەر شەق و سواری ماشێنی کرد، بەڵام، هەرچی لەشی ئەفسەرەکە بوو خوێنی پێدا ئەهاتە خوارەوە شەڕەکە کۆتایی هات و هەموویان بردن بۆ شارەبانی، خەڵک زۆر هەوڵیاندا بۆ بەردانی زیرەک، بەڵام ئەفسەرەکە هەموو خەڵکەکەی بەرداو زیرەکی هێشتەوە، بە هەردوو دەستی بەستراوە و خستیە نێو حەوزی حەوشەی شەهرەبانی، دەم نادەمیش لێی هەڵدەستا و بە شەق و زللە بەردە بووە گیانی زیرەک تا ماندوو دەبوو، ئا بەم شێوەیە زیرەک ئەم شەوەی بەم شکەنجە و ئازارەوە بەڕێ کرد تا وەختی بەیانی لە هۆشخۆی چوو خەریک بوو بمرێ؛ ڕەوانەی بیمارستانیان کرد، ئاغا (محیەدینی دۆستالی) بوو بە کەفیلی لە شارەبانی و زۆریشی هەڕەشە لە ئەفسەرەکە کرد کە چۆنت وا لە خاندەیەکی کورد کردووە بۆ لێت داوە بت دابایە دادگا بە چ حەقێک شەو تا بەیانی لێی دەدەی؟ خۆ بە خوا ئەگەر شتێکی لێبێت تا پایتەخت ڕاناوەستم هەموو کاربە دەستانی دەوڵەت تێدەگەینم  کە چ زوڵم و زۆرێک لێرە بە سەر ئەچێت بێ ئەوەی کەس بتوانێ قسەیەک بکات!؟ زیرەکی لەگەڵ خۆی بردەماڵەوە و زیرەک زۆر سوپاسی کرد و لە ماڵەوە کەوتە نێو جێگاو ڕۆژێک زیرەک گوتی: من لێرە دەڕۆم. منیش پێم گوت ئاخر بۆ دەڕۆی تاکەی دەی ماڵێ تۆ هەر بەسەر پشتی وڵاغەوە بێت با لە ناو ئێمەدا تۆزێک ئۆقرە بگری و بحەسێیتەوە، سەیری منی کرد و گوتی: ئەمن تازە ڕووم نییە لێرە بمێنمەوە پێنج و دوو ڕۆژێکم ماوە ئەچم بۆ شارێکی تر گچکە و نانێکیش هەردەبێ من و ڕابە سکمانی پێ تێر بکەین، لە قسەکانی دیاربوو زۆر دڵشکاو بوو-پ٢، ل١٠٦)

## بە ڕاستی ماندوو بووم هێندەی باسی لێدانەکانی زیرەکتان بۆ بنووسمەوە

ناچارم ئەوەش بنووسمەوە کە لە کاسێتی ناسراو بە کاسێتی ئەبوو سەباح، دەردە دڵی زیرەکتان بۆ بگوێزمەوە، زیرەک دەڵێ: ئومێدوارم پاکی نەکەیتەوە، ئاغاز ئاغاز تەمەشای قسەی ڕابە مەکە ئەوەی بەسەرم هاتیە پێت دەڵێم، دوایی دەردی دڵم هەیە! دوای ئەم گۆرانیە! ئەی هاوار ئەی هاوار من لە هیچا نەبووم، هەژدە مانگ لە ئێراقا گیرام! شەش مانگ لە ژێر شکەنجەی سازمانی ئەمنیەتی ئێراقا، ئەوەی بە سەریان هێنام هێنام، ئەوەی کە تەعزیب بوو کردیانم ئاخیری دەیانەویست بتڵێکی بیرە لە قینگم بڕن! (پێکەنینی دانیشتووەکان) تکایە ئێوەش پێمەکەنن! کوڕێکی خانەقینی پۆلیس بوو لەوێ گوتبووی ئەگەر هەرچیتان لێکردووە قەیدی ناکا من قبووڵم کردووە، ئەگەر ئەوەی لێبکەن ئەم ئەمنە بە یەکا ئەدەم، باشە ئەو خراپەی لەگەڵ کردم لەمنی دا کوشتمی! ڕۆژێک پێشتر مانگێک لێی دام ئەمما دوایی جغارەی بۆ دێنام. تا ئەو ڕۆژەی دەمرم مەمنوونیم، بۆ خاتری خوا کاکە من ڕۆژگاری خۆم ئاوا بردووەتە سەر، هێنامیانە سلێمانی، نە کەرکووک هێنامیانە کەرکووک نە بمبوورن! هێنامیانە کەرکووک لە کەرکووک بۆ موسڵ، بە قەراغ بە قەراغ هەولێری جوانا کە ڕۆیشتم ڕۆژانێکی خۆشم لێرە گوزەراندووە، ئەی هاوار کوردی هەولێر کەسی بە دەرەوە نییە، لە حاڵی من بپرسێ، کە تۆ کابرا چ کارەی؟ یا چی لێرە؟ لەم ناو قەفەسەی پۆلیسخانە چییەکەی؟ تەنیا نەفەرێک وەک خولە پیزەیان گرتبێ! بە هەژدە پۆلیسەوە منیان ئەگرت و ئەبرد. ئەی هاوار لەو ماڵە بووم لەم ماڵە بووم لێرە بووم، فایدەی نەبوو هەرچی تەمەشام دەکرد ئەو ماڵانە کە بووم، تەماشام دەکرد هەموو پەنجەرەکانیان دیار بوو قاپیەکانیان دیار بوو، ئەمما ئی زیرەک جگە لەم پێشهات و هەژاری و بێ کاریەشی وەختێ لە ڕادیۆ بە فەرمی کاری کردووە، چ لە ڕادیۆی بەغدا چ لە ڕادیۆی تاران و کرماشان، گەورەترین کار بەدەست و هونەرمەند لەم دەزگا و ڕادیۆیانە دژایەتی زیرەکیان کردووەو کاسێتیان ڕەش کردووتەوە و لێیان داوە و دوا جار بوونەتە هۆی دەرکردن و نانبڕانی و ئاوارەیی و کەوتنە بەندیخانە لە ئێران و لە عێراق! ئەی هاوار هاوار بەشەر تەبوو بڵێ حەسەن زیرەک بۆ کوێ ئەبەن؟ باوکم من خولە پیزەم؟ زیرەک بەم گێڕانەوە و دانپێدانانە دەیەوێ بە خەڵکی کورد بڵێ: براکانم ئاوا ژیاوم و لەنێو ئەم ژیانەشدا گۆرانیم بۆ گوتوون! ئەوەی کە تەعزیب بوو کردیانم ئاخیری دەیانەویست بتڵێکی بیرە لە قینگم بڕن! (پێکەنینی دانیشتووەکان) تکایە ئێوە پێمەکەنن!؟

## تاوانێک کە زیرەک بەرانبەر بە خۆی کردوویەتی

زیرەک بە هوشیاریەوە خۆی کرد بە قوربانی دوو شت (هونەرەکەی و کورد بوونەکەی) هەر لە کاسێتی ناسراو بە کاسێتی ئەبوسەباح دەفەرمووێ: (هونەر بۆ من کارێکی نەکرد بە دوایا بچم، چۆن کوردم و بە

لە کوردان دەکات، کە بوونەتە هۆی زۆرتر و گەورەتر بوونی ئازارەکانی بە دەست کوردانەوە، کە ئەم ئازارە چووەتە سەر ئازاری هەردوو دەوڵەتی ئێران و ئێراق، جێم نەبۆوە جێم نەبۆوە ئەی برای کوردم لە ئێراق و لە ئێران و ئازاری نێو بەندیخانەکانیان!؟ ئەمەش جۆرێکە لە گێڕانەوە و دانپێدانانی ئەو ئازارانەی، کە بەهۆی کوردبوون و هونەرمەند بوونیەوە دیونی! هەر بەم هۆیەوەیە زۆرجار لەنێو گۆرانییەکانیدا هاوار دەکات و بە حەسرەتەوە دەڵێ: چیم کرد لە خۆم!؟ دواجار پیاو سەری سووڕدەمێنێ کە (هونەرمەند حەسەن زیرەک) لەنێو ئەم ژیانە دۆزەخیەدا ئەم دەنگە بەهەشتییەی لە کوێ هێناوە!؟

**ئەنجام:**

١- لەم لێکۆڵینەوەیەدا دەردەکەوێت، کە زیرەکی هونەرمەند، یەکێ لەو کوردانەیە، کە زۆر زوو و بە هۆشیاری و ئازایەتییەوە پێش هەمووان دانپێدانان دەکات.

٢- زیرەک لەم دانپێدانانە لە گوتنی هیچ بابەتێک ناپەنگێتەوە و بە دەنگی بەرز و بە ئاشکرا دەڵێ: دەیانویست بتڵێکی بیرە لە قینگم ببڕن! دەڵێ: لێیان دام و دایکیان گام و لە قوزی دایکیان دەبردم! دەڵێت: ساواک داوام لێ دەکات بچمە ئێراق و کاریان بۆ بکەم!؟

٣- هەر لەم لێکۆڵینەوەیەدا دەردەکەوێ ئەوانەی لە زیرەک دەدەن، ساواک و ئیتلاعات و زەدەی ئیتلاعات-ن، واتە دەوڵەت خۆیەتی، چۆن لە ڕادیۆش دەریانکرد؟!

٤- لەم لێکۆڵینەوەیەدا دەردەکەوێت، کە دەوڵەت ئامانجی کوشتنی زیرەکە، ئەوەتە ڕۆژێ کە لە زیرەک دەدەن ڕابیعە خانم دەچێتەماڵی میرزا کەریم و دەگری و دەڵێ: دەبێ لەم شوێنە بڕۆین دەنا ڕۆژێ دەشمان کوژن! لە ژاندارمەری شکات دەکەن، لە جیاتی پاراستنیان بە زیرەک دەڵێن: لێرە برۆ با ڕۆژێ نەشتان کوژن!؟ زیرەک خۆشی دەڵێ: خەڵکیش دەکوژن و لەگەڵ جەنازەکەشی دەچنە سەر قەبران! دواجار زیرەک دەڵێ: هێندەم نەماوە (بمرم – بمکوژن) و بچمە ژێر گڵ!؟

٥- لەم لێکۆڵینەوەیەدا دەردەکەوێت، کە لە ڕۆژی دەرکردنی زیرەک لە ڕادیۆی تاران و کرماشان، ساواک بە دوایەوەتی و لێناگەڕێ لەهیچ کارێک سەرکەوێ و لەهیچ شوێنێک بحەسێتەوە و بگیرسێتەوە، هەربۆیە بەردەوام لە گۆرانییەکانیدا دەڵێت: جێم نییە تیا بسرەوم خاکم بەسەر بێ لانە خۆم!

زیرەک لەنێو گۆرانییەکانیدا زۆرجار باسی دەربەدەری



زیرەک بەندیخانەی کرماشان

کوردی قسەدەکەم) هەر لە بارەی کوردبوونەوە دەڵێ: (بۆی بڕوام بەکورد نییە! ... هێندەم نەماوە بمرم و بچمە ژێر گڵ و بە شەری کورد نەبینم)

لێرە زیرەک بە گلەییەوە باسی هونەر دەکات و لەگەڵ ئەوەی بەم هونەرە بەرزە و ئەم هەموو خزمەتە مەزنەی بە هونەری کوردی کردووە، ئەوەتە ئێستە لەنێوان دوو شاخێک چایخانەیەکی پەڕپوتم هەیە و کاسبی تێدا دەکەم، هونەر وای نەکرد لەسایەی هونەردا بژیم و بە هونەرەکەم بژیم! ئەوە حاڵمە و هەر جارەی دوو سێ ساواکی دێن و لە خوێندا سوورم دەکەن!

لە بارەی کورد بوونیشەوە دیسان گلەیی دەکات، کە هونەرمەندانی کورد ڕێزیان نەگرتووە و ئازاریان داوە و نانیان بڕیوە و لە ڕادیۆ دەریان کردووە! بۆیە دەڵێ بڕوام بە کورد نییە و پێمخۆشە بمرم و بچمە ژێرگڵ و بەشەری کورد نەبینم! کەچی لەسایەی خزمەت بە هونەری کوردی ئەوەتە حاڵم و ئەوانەی، کە لێم دەدەن و کێشەم بۆ دروست دەکەن زۆربەیان کوردن!

زیرەک لە کوردبوون و هونەرمەندایەتی کورد پەشیمان نییە! ئەو گلەیی لە بەشێک بەناو هونەرمەندان و بەشێک

و ئاوارەیی خۆی دەکات، بەڕێز عومەری سوڵتانی دەنووسێت: کە چووینە کانی مەلا ئەحمەد زیرەک زۆر بێ تاقەت بوو، کە لە مێزەکەی ئێمە دوورکەوتەوە، سەری بۆ ئاسمان هەڵبڕی و گوتی: خودایە ئەم جارە بۆ کوێندەر هەڵبێم؟ میرزا کەریم دەنووسێت: لەم دواییەدا ساواک سەراودووی زیرەک-ی نابوو لە هەموو جێگایەکەوە بە دوایەوە بوون و لێ نەدەگەڕان لەهیچ جێگایەک بحەوێتەوە!؟

## سەرنج و تێبینییەکان:

١- ڕۆژێک میوانی مامۆستا باکووریی هونەرمەند بووین، کە باس هاتە سەر زیرەک ئەم باسەی گێڕایەوە.
٢- مامۆستا محەمەدی ڕەمەزانی نووسەر و وەرگێڕی ناسراوی کورد لە ڕۆژهەلاتی کوردستان، ئەم باسەی لە فەیسبووک بڵاکردۆتەوە.
٣- مامۆستا بێستون پێشەوا لە فەیسبووکەکەی خۆی باسی سەرۆک جاشێک دەکات، کە پێشمەرگەی کوشتووە و خەڵکی بە گرتن داوە، لەم دواییە چووەتە لای یەکێ لە قوربانییەکانی، داوای لێ کردووە خەریکە دەچێتە حەج هاتووە گەردنی ئازابکات! ئەمە دانپێدانانی جاشێکی کوردە!؟
٤- چاوپێکەوتنێکی گرنگی مام عەلی یاسەمەنی هەیە، کە مامۆستا محەمەدی ڕەمەزانی لەگەڵی کردووە، لەساڵی ١٩٩٦ مام عەلی خزمێکی نزیکی هونەرمەند حەسەن زیرەک-ەو ڕەفیقی منداڵییەتی و بابەتی گرنگ باس دەکات، سپدی ئەو چاوپێکەوتنە، مامۆستا محەمەد ڕەمەزانی گەورەیی کرد و وەک دیارییەک پێی بەخشیم، سوپاسی دەکەم.
٥- زیرەک وا باس دەکات، کە پاش شۆڕشی ١٤ ی گەلاوێژی ١٩٥٨ گەڕاوەتەوە ئێران، کەچی هەواڵی ئەوەش هەیە، کە پێش شۆڕش بە چوارمانگێک گەڕاوەتەوە!
٦- ڕۆژێک باسی زیرەک-مان دەکرد، بەڕێزێک گوتی: دایکی مێردی کردووتەوە، بەتانەوە ئەمەی گوت. منیش گوتم خۆزگە هەموو ئەوانەی دایکیان شووی دەکردەوە حەسەن زیرەکێکیان لێ دەردەچوو، جا ئەوسا با شووکردنەوە خراپ بووایە!
٧- من لام وایە پاش دەرکردنی زیرەک لە ڕادیۆی تاران، چووەتە کرماشان، بەڵام کە کتێبی (چریکەی کوردستان چاپ دەکات) لە لایەن ساواکەوە فەرمانی گرتنی دەردەچێت، ئەوسا هەڵدێ و دێتەوە عێراق.
٨- بەداخەوە ئەم لیژنەیە چ لیژنەیەک بووە، کە جەسارەتیان کردووە بە زیرەک بڵێن، دەنگت بۆ ڕادیۆ ناگونجێ! خۆزگە دەناسران.
٩- گفتوگۆیەکی زۆر و لێک جیا هەیە سەبارەت بە گەڕانەوەی زیرەک بۆ ئێران پاش شۆڕشی ١٩٥٨، زیرەک لە ژیاننامەکەشی دەنووسێت: مەخلەس (٥٨) ماڵم بەجێ هێشت، هیچم نەهێنا بە عەزمی خوێ چێشت و هەردەڵێ دوای شۆڕشی ١٩٥٨ گەڕامەوە ئێران.
١٠- زیرەک باسی شاگردێکی دەکات، لە کانی مەلا ئەحمەد و لە میوانخانەی سەقزیش زیرەک چەند شاگردێکی هەبووە، ئەو بەڕێزانە دەتوانن زۆر شت لە بارەی زیرەکەوە باس بکەن، هیوادارم لە ژیان مابن و یادگارییەکانیان لەگەڵ زیرەک بگێڕنەوە.
١١- دکتۆر سەرکەوت ئەمین نووسەر و هونەرمەندێکی لێهاتووە و ئەرشیفێکی دەوڵەمەندی هەیە و کاری زۆر و جوانی لەسەر ژیان و هونەریی زیرەک کردووە.
١٢- لەکاتی لێدانەکانی زیرەک لە لایەن ساواکی و ئیتلاعاتییەکان و زەدەی ئیتلاعاتەکان، زۆرجار ژاندارم و ئەفسەرەکان بە زیرەک دەڵێن: (لێرە برۆ با ڕۆژێ نەشتانکوژن) جگە لە لێدان و شەڕ پێفرۆشتنەکان وشەی نەشتانکوژن) بەردەوام بۆ زیرەک دووبارە دەبێتەوە، ئەمە ئەوە دەردەخات، کە دژایەتیکردنی زیرەک لە لایەن دەوڵەت و ساواکەوە بۆ کوشتنی زیرەک بووە، هەر ئەوەش بوو، دواجار ژەهر خواردوویان کرد!
١٣- دڵنیام زیرەک قسەی ساواکییەکانی وەک خۆی گێڕاوەتەوە، کە بە زیرەک-یان گوتووە: (هەی دایکت بگێم ..) چۆن زیرەک دانپێدانانەکانی وەک خۆی گێڕاوەتەوە، بەڵام میرزا کەریم دڵی ناهاتووە ئەمە بنووسێت.


**سەرچاوەکان:**

١- چریکەی کوردستان چاپی دووەم، ١٣٧٦ خورشیدی، سازمانی انتشاراتی بورەکەیی
٢- حەسەن زیرەک و هەندێک لە بەسەرهاتەکانی، نووسینی میرزاکەریم خۆشناو، بەرگی یەکەم، ١٩٨٤، هەولێر
٣- حەسەن زیرەک و هەندێ لە بەسەرهاتەکانی، نووسینی میرزا کەریم خۆشناو، بەرگی دووەم ،١٩٨٦، هەولێر
٤- ساواک بۆچی حەسەن زیرەک-ی کوشت؟ مەولود ئیبراهیم حەسەن- هەولێر - ٢٠١٢
٥- چاوپێکەوتنی مام عەلی یاسەمەنی خزمی نزیکی هونەرمەند حەسەن زیرەک و هاوڕێی منداڵی و تەمەنی، چاوپێکەوتن نووسەر و وەرگێڕی ناسراوی کورد مامۆستا محەمەد ڕەمەزانی لە ڕۆژهەلاتی کوردستان لە ساڵی ١٩٩٦ ز.

# خوێندنەوەی کتێب

- چەند سەرەقەڵەمێک .. ئینسکلۆپیدیای پێشمەرگە دێرینەکان- پارێزگای هەولێر

د. ئەحمەد حەمەدئەمین



## چەند سەرەقەڵەمێک

# ئینسکلۆپیدیای پێشمەرگە دێرینەکان پارێزگای هەولێر

دوای نسکۆی شۆڕشی ئەیلوولی ساڵی ١٩٧٥، یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان جارێکی دیکە بڕیاری جۆشدانەوەی خەباتی چەکداری دا. لەو چوارچێوەیەدا لە ١ی حوزەیرانی ١٩٧٦ تا ڕاپەڕینی بەهاری ساڵی ١٩٩١، هەزاران پێشمەرگە لە دەوری بەرنامەی یەکێتیی کۆبوونەوە و لە خەباتکردن بەردەوام بوون.

ئەگەرچی تاوەکو ئێستاکە لە دوو توێی یادداشت و بیرەوەرییەکان، کتێبە مێژووییەکانی تایبەت بەو قۆناغە، نامە و تێزە زانکۆییەکانی لەبارەی ئەو قۆناغە مێژووییە نووسراون، ناوی ژمارەیەک لەو پێشمەرگە و سەرکردانە هاتوون، کە بەشداریان لەو قۆناغە مێژووییە لە بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی گەلی کورددا کردووە، بەڵام بەشێکی بەرچاوشیان ناو و مێژوویان باس نەکراوە و وەک سەربازێکی ون وان، لا لە ژیان و خەبات و تێکۆشانیان نەکراوتەوە. لەو سۆنگەوە کۆکردنەوە و نووسینی مێژووی ژیانی ئەو پێشمەرگانە و پەیوەندییکردنیان بە هێزی پێشمەرگەی کوردستان و ئەو شەڕ و داستانانەی بەشداریان تێیدا کردوون، گرنگیی و بایەخی خۆیان هەیە.

لەبەر ڕۆشنایی ئەو گرنگ و بایەخەی ئاماژەمان بۆ کرد، دەتوانرێت بگوترێت ئامادەکردنی (ئینسکلۆپیدیای پێشمەرگە دێرینەکان- پارێزگاری هەولێر) لەلایەن حەیدەر مەنتک و لە چاپدانی لە دوو توێی سێ بەرگدا، مایەی دەستخۆشییە، چونکە لە کارەکەیدا لای لە مێژووی ژیان و پێشمەرگایەتی (٦٨٦) پێشمەرگە کردۆتەوە و ئەو مێژوویەی لە ونبوون ڕزگارکردووە.

ئەو کارەی حەیدەری مەنتک ئەنجامی داوە لە توانا و ئەرکی تاکەکەسی بەدەرە، بەڵکو پێویستی بە کاری گروپ و لێژنەی تایبەت هەیە، بەڵام وەک خۆی دەڵێت بە هۆی پەرۆشییان شانی داوەتە بەر ئەو ئەرکە و کارەکەی کردووە.

کتێبی (ئینسکلۆپیدیای پێشمەرگە دێرینەکان- پارێزگای هەولێر) جیا لە پێشەکی ئامادەکاری کتێبەکە، کە تێیدا باسی لە چۆنییەتی هەنگاوەکانی کارکردن و هۆکاری ئەنجامدانی کارەکەی کردووە. هەر یەک لە ئارێز عەبدوڵڵا و دکتۆر دانا سەعید سۆفی، هەریەکەیان بە وتارێک (وردەکارییەکانی مێژووی شۆڕشی نوێ) و (سووتەمەنییەکانی شۆڕش و قەیرانی بەهاکان) بەشدارییان لەو کتێبەدا کردووە و باسیان لە نرخاندنیان بۆ کاری لەو شێوەیە کردووە.

وەک ئاماژەمان بۆ کرد، ئەو کتێبە لە سێ بەرگ پێکهاتووە، بەرگی یەکەمی بریتتە لە (٤١٩) لاپەڕە، کە تایبەتە بە پێشمەرگەکانی نێو شاری هەولێر و دەشتی هەولێر، تێیدا ئاماژە بە مێژووی ژیانی (١٥٧) پێشمەرگە کراوە، لە پاڵ ئەوانیشدا ژیانی (١٥) پێشمەرگەی کەرکووک، کە لە سنووری هەولێر پێشمەرگە بوونە لە



د. ئەحمەد حەمەدئەمین

کۆتایی ئەو بەرگەدا تۆمار کراون.

بەرگی دووەمــی لە (٣٦٠) لاپــەڕەدا (١٣٣) پێشمەرگەی سنووری کۆیە، لا لە مێژووی ژیان و پێشمەرگایەتیان کراوەتەوە.

بەرگی سێیەم، تایبەتە بە سنووری سۆران، تێیدا ژیانی مێژوویی پێشمەرگایەتی (٣٨١) پێشمەرگە نووسراونەتەوە.

لە پاڵ ناو و ژیانی پێشمەرگەکاندا لە کۆتایی هەر بەرگێکدا ئەلبومێکی وێنە دانراوە، پاشان نـاوی (٤٤) پێشمەرگە هـاتووە، کە بە دەنگ داواکــاری حـەیـدەر مەنتک نـەهـاتوون و هـاوکاریـان پێشکەشی نـەکردووە تـا ئــەوەی نـاویـان بخرێتە نێو ئینسکلۆپیدیاکەوە.

لـەگـەڵ ئـــەوەی هـەنـگـاوەکـەی حـەیـدەر مەنتک لە ئامادەکردنی ئەو ئینسکلۆپیدیایەدا گرنگیی و بایەخی خۆی هەیە، بەڵام کارەکەی چەند وردە سەرنج و تێبینییەک هـەڵـدەگـرێت، کـە دەکـرێـت بۆ چاپەکانی داهاتوو سوودییان لێ وەربگرێت.

ناونیشانی کتێبەکە لەسەر بەرگ و لە نـاوەوە وەک یـەک نییە، بۆ نموونە لەسەر هەر سێ بەرگەکە نووسراوە:

یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان

ئینسکلۆپیدیا

پێشمەرگە دێرینەکان – پارێزگای هەولێر

کـەچـی لـە نـــاوەوەی بـەرگـی یەکەم نووسراوە (ئینسکلۆپیدیای پێشمەرگە دێرینەکان «هەولێر – دەشتی هەولێر) لە بەرگی دووەم نـووسـراوە ( ئینسکلۆپیدیای پێشمەرگە دێرینەکان «کۆیە») و لـە بـەرگـی سێیەم نـووسـراوە (ئینسکلۆپیدیای پێشمەرگە دێرینەکان «سۆران»).

کە نەدەبوو هەڵەی چاپ لەسەر بەرگی چاپەکە بەسەریان تێپەڕیبووایە، لە کاتێکدا وشەی ئینسکلۆپیدیا بەبێ (ی) مانای ناونیشانەکە بە تـەواوی بـەدەسـتـەوە نـادات، نووسینی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لەسەرەوەی ئینسکلۆپیدیاکە دیسانەوە مانای تەواو بـەدەسـتـەوە نادات،



بۆیە ناونیشانی کتێبەکە بەڕای ئێمە دەبوو بەم شێوەیە بوایە: (ئینسکلۆپیدیای پێشمەرگە دێرینەکانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لە سنووری پارێزگای هەولێر) لەبەر ئەوەی بەم شێوەیە مانای تەواو و ئامانجی کارەکەی دەگەیاندا. ئەوە لە کاتێکدایە حەیدەر مەنتک لەو پێشەکییە نووسیویەتی خۆشی هەمان ئەو ناونیشانەی نووسیوە، بەڵام دواتر کێ دەستکاری کردووە و چۆن کراوە، ئەوەیان ڕوون نییە؟!

حەیدەر مەنتک لە پێشەکی کتێبەکەیدا نووسیویەتی کارەکەی لە دوو توێی دوو بەرگ ئامادەکردووە، بەڵام دواتر چۆن و کێ کردوویەتی بە سێ بەرگ ئەوەیان بۆ خوێنەر ڕوون نییە؟! ئەوەشی نووسیوە، کە لە ڕاستی و دروستی ناوەرۆکی زانیارییەکان بەرپرسیار نییە، چونکە ڕاستەوخۆ لە کەسایەتییەکان وەری گرتوون، بەڵام لەبەر ئەوەی ناوبراو زانیارییەکانی جێگیرکردوون دەبوو هەندێک بە وردەکاری زانیارییەکاندا بچووبایەتەوە.

ژمارەیەک زانیاری لەو شێوەیەی تێدایە، کە لە ناسنامەکەیدا ئاماژە بە ساڵێک کراوە، وەک ساڵی پەیوەندی کردن بە هێزی پێشمەرگە، کەچی لە نووسینەکەدا ساڵێکی جیاوازتر نووسراوە، لەوەدا خوێنەر نازانێت کامە ساڵیان ڕاستترە، ئەگەر ویستی لە کارێکدا وەک سەرچاوەیەک پشتی پێ ببەستێت.

ئامادەکاری ئینسکلۆپیدیای پێشمەرگە دێرینەکان، دەبوو لە پەراوێزدا ڕوونکردنەوەی لەبارەی ناوی ئەو پێشمەرگانەی بنووسیایە، کە تا ڕاپەڕینی بەهاری ساڵی ١٩٩١ تەمەنی نەگەیشتووتە (١٨) بۆ ئەوەی بۆ خوێنەر ڕوون بێت، ئەوانە بە هۆی خانەوادەکانیان لە تەمەنێکی بچووکدا دەستیان داوەتە خەباتی پێشمەرگایەتی.

ڕەنگە خەڵکانێک هەبن دوور و نزیک ئاگاداری ئەوە بن، دوو پۆلین بۆ پێشمەرگەکانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لەو قۆناغە مێژووییەی (١٩٧٥ – ١٩٩١)دا هەن، پێشمەرگە دانەبڕاوەکان و پێشمەرگە دێرینەکان. ئەوەی یەکەمیان ئەوانەن، کە تا ڕاپەڕین خۆیان ڕادەست نەکردۆتەوە و لەخەباتی پێشمەرگایەتی شاخ بەردەوام بوونە. دووەمیان ئەوانەن، کە گەڕاونەتەوە نێو شارەکان و خۆیان ڕادەست کردۆتەوە. لێرەدا ئەوەی ئێمە درکمان پێکرد، حەیدەر مەنتک لە کارەکەی خۆیدا لەسەر یەکەمیان هەڵوەستەی کردووە، بەڵام بە بۆچوونی من دەبوو ئەوە لەبەرچاو بگیرایە، کە خەڵکانێکی زۆر هەن دوای قۆناغی ئەنفالەکان و کشانەوەی سەرکردایەتی بۆ سەر سنوور لەسەر داواکاری و بە ئاگاداری سەرکردایەتی، خۆیان ڕادەست کردۆتەوە و هاتوونەتەوە نێو شارەکان. بۆیە ئامادەکار دەبایە ئەوەی بۆ خوێنەر ڕوون بکردبوایەوە، بۆ ئەوەی نەکەوێتە بەردەم پرسیاری ئەوەی بۆ ناوی ئەوانەی تێدا نییە.

حەیدەر مەنتک دەبوو ئەوەشی ڕوونکردبوایەوە، کە ئەوانەی لەو کتێبەدا ناویان هاتوون، تەنیا ئەوانەن، کە لە ژیاندا ماون، یاخود شەهیدەکانیش دەگرێتەوە؟ لەبەر ئەوەی ئەوەندەی من ئاگادار بم حەیدەری مەنتک جگە لە دوو بەرگی ئینسکلۆپیدیای شەهیدانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لە هەولێر، بەرگی سێیەمیشی بەدەستەوەیە، کەواتە بۆچی ناوی هەندێک شەهیدی لێرە هێناوە و بۆ بەرگی سێیەمی هەڵنەگرتوون، کە تایبەتە بە پێشمەرگە شەهیدەکان

سەبارەت بە (ناوەرۆک) لە سەرەتای بەرگەکانی کتێبەکە دانراوە، لە هەندێکیان لەگەڵ ناوەوەی کتێبەکە وەک یەک نایەتەوە، لەوەشدا دەبوو چ لە ناوەرۆک و چ لە ناوەوەی کتێبەکەدا ناوی سیانی کەسەکە و نازناوەکەی بە تەک یەکەوە بهاتایە، نەک لە ناوەرۆکدا بە ناوی سیانی و لە ناوەوەی کتێبەکە بە نازناو، یان پێچەوانەکەی ئاماژەیان بۆ کرایە.

تێکرایی ئەو تێبینیانەی ئاماژەمان بۆ کردن لە سەنگ و قورسایی کارەکەی حەیدەر مەنتک کەم ناکانەوە، بەڵکو خزمەتی بە ئایندەی هەنگاوەکانی دەکات.






**د. ئەرسەلان بایز**

**(٢١) و کۆتایی**

دوای کیمیاباران کردنی شارۆچکەی هەڵەبجە و هەندێک ناوچەی دیکەی کوردستان. بڵاوبوونەوەی دیمەنی دڵتەزێنی ژەهراوی بوونی هەزاران ژن و منداڵ و پیری سەر شەقام و کۆڵان و ژێر زەمینەکان، لە شاشەی تەلەفزیۆن و لاپەڕەی ڕۆژنامەکان، لە سەرانسەری جیهان ویژدانی ڕای گشتیی دەوڵەتان و مرۆڤایەتی هەژاند. بەشی هەرە زۆری وڵاتان و ڕێکخراوە شارستانی و خێرخوازەکانی دونیا بە توندترین شێوە ئیدانەی بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی قەدەغەکراویان کرد، کە ڕژێمی عێراق بەسەر کوردی وڵاتەکەی خۆیدا ڕشتبووی.

لە بەرانبەر ئەو تاوانە دڕندەیە سەرجەم حزب و گرووپ و پێکهاتەکانی گەلی کورد، ڕووبەڕووی ڕژێمی خوێنڕێژی عێراق وەستانەوە و دەنگی هاوار و ناڵەی دایک و زامدارەکانیان گەیاندە ئەو سەری دونیا، بە تایبەتی کوردە ئاوارەکانی وڵاتانی ئەورووپا. دەیان کۆڕ و کۆبوونەوە و چالاکیان ئەنجامدا و ڕای گشتیی گەلانی ئەورووپایان بەلای مەسەلەی کورددا ڕاکێشا. ئیدی هەڵەبجە چووە پاڵ شارەکانی (ناکازاکی و هیرۆشیما)ی یابان کە لە دووەمین جەنگی جیهانیدا ئەمریکاییەکان بە چەکی ئەتۆم بۆردومانیان کرد. دەبێ ئەو ڕاستیەش بگوترێت کە (مام جەلال) وەکو دەروێشێکی گەڕۆک هەر ڕۆژە و لە وڵاتێک کیمیابارانی هەڵەبجەی بە دونیا دەناساند.

لە بری ئەوەی ڕژێمی بەعس دوای تاوانە گەورەکەی، کە لە دژی مرۆڤایەتی ئەنجامی دا هەڵوەستەیەک بکات و بە خۆیدا بچێتەوە، ڕق ئەستورتر بوو. ئەمجارەیان بە شێوەیەکی دی پەلاماری گەلی کورد و شۆڕشەکەی دا. ئەمجارەیان (سورەتی ئەنفال)ی کردە دروشمی هێرشکردنە سەر کوردستان. شاڵاوی قەتل و عامی ئەنفالەکان بە چەند قۆناغێک دەستی پێکرد. لە سەرەتادا ئەنفالی یەکەم لە دەشتە کاکی بە کاکییەکانی گەرمیانەوە دەستی پێکرد. بێ دەست پاراستن، زۆر بێ بەزەیی و دڕندانە ڕەشبگیر منداڵ و پیرو ژن و گەنج و پیاویان دەخستە پشتی زیلە سەربازییەکان، بەو قرچە پرۆکێنەرە گەرما هاوینەی ناوەڕاست و خوارووی عێراق، بە پای پەتی بێ نان و ئاو. زاق و زیقی ژن و منداڵەکان، دەست پانکردنەوەی ڕیش سپیەکان بۆ ئاسمان، شین و شەپۆڕی دایکان، دوعا و نزا و پاڕانەوە، هیچ کامێک دادی نەدان و هەموویان بە جل و بەرگەوە بە زیندوێتی خرانە ژێر گڵ. دەبێ چ تاوانێک لە دونیادا هێندەی زیندە بە چاڵکردنی منداڵی ساوا و دایکی سکپڕ، پیری پەک کەوتە گەورەتر بێت....؟ مەگەر (هۆلۆکۆستی) جولەکەکان لەلایەن نازییەکانەوە.

ڕاستییەکەی ئەوەیە حکومەتەکانی عەرەب و تورک و فارس هیچ بەزەییەکیان بە کورد نایەتەوە و هەریەکەیان بە جۆرێک قەتل و عامی کورد دەکەن. خوا هەڵناگرێ کورد خۆشی بەزەیی بە خۆیدا نایەتەوە. حزبە کوردییەکانیش بە شێوەیەکی دی قەتل و عامی یەکدی دەکەین. دەست لەگەڵ دوژمنەکانمان تێکەڵ دەکەین و شەڕی یەکدی دەکەین.

بەڵام...! خۆ بێ حیکمەت نیە هەموو گەلانی ناوچەکە بوون بە خاوەنی دەوڵەتی خۆیان. بەڵام ئێمەی کورد سەدان ساڵە لە دواوەی دواوە تەپەمان دێت و نابین بە هیچ.

\+ \+ \+

له بری ئەوەی ڕژێمی عێراق دوای تاوانەکانی کیمیاباران کردنی خەڵکی مەدەنی بە خۆیدا بچێتەوە و گوێ لە ڕای گشتیی جیهان بگرێت. رق ئەستورتر بوو، ئەمجارەیان بە شێوەیەکی تر پەلاماری بارەگاکانی سەرکردایەتی (ی.ن.ک) و خەڵکەکەی دا. هێزێکی یەکجار زۆری کۆکردەوە و لە سێ قۆڵەوە (کارێزە و شاخی قەیوان، سورداش، دوکان) پەلاماری دۆڵی جافایەتی دا. تۆپخانە و فرۆکە جەنگییەکانی سوپای عێراق ڕۆژانە ئاگر بارانی سەنگەرەکانی پێشمەرگە و گوندەکانیان دەکرد (ی.ن.ک)یش لە بەرانبەردا هێزێکی گەورەی پێشمەرگەی کۆکردەوە و قارەمانانە بەرگری کرد. بۆ ماوەی سێ مانگی ڕەبەق شەڕ بەردەوام بوو. لە سەرەتادا بە هۆی ئەوەی (مام جەلال) لە دەرەوە بوو (کاک نەوشیروان) سەرکردایەتی شەڕەکەی دەکرد. دواتر ڕادەستی (کاک کۆسرەت و مولازم عومەر)ی کرد. هەموو بارەگاکانی پێشمەرگە و ژمارەیەکی زۆر لە خێزانە گوندییەکان ڕۆژانە سەرقاڵی ئامادەکردنی خواردن بوون بۆ بەرەکانی جەنگ.

یەکێ لە ڕۆژەکان (کاک نەوشیروان) ناردی بە دوای (ئەو)دا و پێی گوت: ئەوە دەبینی سەرباری قارەمانێتی پێشمەرگە، ڕۆژانە دوژمن پێشڕەوی دەکات. دەزگای ڕاگەیاندنیش قورسترین دەزگای شۆڕشە، بۆیە پێم باشە خۆتان کۆبکەنەوە و بگوازنەوە بۆ (دۆڵە کۆکە) دۆڵە کۆکە دۆڵێکی سەختی هەزار بە هەزاری سەر سنووری کوردستانی ڕۆژهەڵات بوو (ئەو)یش لە وەڵامدا گوتی: (کاک نەوشیروان) دەنگی ڕادیۆکە بەشێکە لەو شەڕە قورسە و بۆ ڕاگرتن و بەرزکردنەوەی ورەی پێشمەرگە و خەڵکەکە زۆر پێویستە. من پێشنیاز دەکەم یەکێ لە ئامێرەکانی پەخشی ڕادیۆکە لەگەڵ ژمارەیەک لە (فن)ییەکان بڕۆن لەوێ ڕادیۆکە دابمەزرێنن. هەر کاتێک ئێرەمان جێ هێشت ئەوان یەکسەر ڕادیۆکە بخەنەکار. خۆشم لەگەڵ ستافەکەی دی لەگەڵ ئێوە دەمێنمەوە. خامۆش و بێدەنگ بوونی دەنگی ڕادیۆکە کاریگەریی سلبی لەسەر ورەی پێشمەرگەکان دروست دەکات. سەرئەنجام پێشنیازەکەی (ئەو) پەسند کرا. ژمارەیەک لە پێشمەرگەکان لەگەڵ خێزانەکانیان چوونە دۆڵە کۆکە و لەوێ ئامێری ڕادیۆکەیان دامەزراند و تاقیشیان کردەوە.

پاش چەند ڕۆژێک، جارێکی دی (کاک نەوشیروان) ناردی بە دوای (ئەو)دا. ئەمجارەیان داوای لێکرد ئەرکی لێپرسراوی دارایی شەڕەکە بگرێتە ئەستۆ (ئەو)یش لە وەڵامدا گوتی: من سەرودەر لە کاروباری دارایی دەرناکەم، لە ژیانیشمدا کاری وام نەکردووە. دەترسم دواتر شەرمەزار بم. دوای گفتوگۆیەکی زۆر لەسەر ئیلحاحی (کاک نەوشیروان) ڕازی بووم. بەڵام بەو مەرجەی تەنیا بە نامەی (کاک نەوشیروان) پارە خەرج بکرێت. ئیدی تا تەواو بوونی شەڕەکە وا بوو.

***خۆ بێ حیکمەت نیە هەموو گەلانی ناوچەکە بوون بە خاوەنی دەوڵەتی خۆیان. بەڵام ئێمەی کورد سەدان ساڵە لە دواوەی دواوە تەپەمان دێت و نابین بە هیچ***

ڕۆژ لە دوای ڕۆژ شەڕەکە قورس و خوێناویتر دەبوو، ئابلوقەی سەر بارەگاکانی (ی.ن.ک) و دۆڵی جافایەتی بەرتەسکتر دەبۆوە. سوپای عێراق لە دیوی دۆکانەوە لە ڕێی دابەزاندنی سەربازەکانی بە کۆپتەر گەیشتە سەر بەرزاییەکانی گوندی (سێدەر) لە دیوی کارێزەشەوە گەیشتنە نزیک گوندی (مالومە) سەر لە ئێوارەیەک بەرەبەری خۆراوا دوو فرۆکەی جەنگی ڕژێم بە خەستی بەرگەلوویان بۆردوومان کرد (کاک کۆسرەت، ملازم عومەر و کاک قادری حاجی عەلی) و چەندین لە هەڤاڵانی سەرکردایەتی و پێشمەرگە خۆیان خستە لا پاڵی تاشە بەردەکانی ئەوێ، بەڵام فرۆکەکان ناوچەکەیان کێڵا. خۆشبەختانە زیانی گیانی نەبوو. ڕۆژانە دەیان خێزان ڕوویان لە دیوی ئێران دەکرد. دەنگی تۆپبارانی هەردوو

دەوڵەتیش گوێی ئاسمانی کەڕ دەکرد، واتە لە هەموو لایەک ئاگر باران بوو. لەو شەڕانەدا گەورەترین چەکی پێشمەرگە (دۆشکاو ئاربی جی) بوو لە بەرانبەر نوێترین تانک و زرێپۆش و فڕۆکەی جەنگی رووسیا و فەرەنسا. بەڵام پێشمەرگە خاوەن هەق و ئیرادە و دوژمنیش داگیرکەر. کێشەی (ئەو) چۆنیەتی ڕزگارکردنی (شارا)ی هاوسەری و (لاسک)ی کچی تەمەن سێ ساڵە بوو، لەو ڕۆژەدا بە هۆی سەرقاڵی شێخ دارای حەفیدی خەزووریشی بە بەرەکانی شەڕ (نەخشین) خانی خێزانی کاک داراش لە ماڵی ئەوان بوو لە بەرگەلوو. هەر وەکو دەڵێن (نەجارڕ بنوو بێ خەم و خەیار، خودا یەکەو دەرگای هەزار) (ئەو)یش دەرفەتێکی باشی بۆ هەڵکەوت جارجارە کۆپتەری ئێرانی دەهاتە ناوچە بۆ کاروباری خۆیان. خوا وای ڕێکخست شاراو نەخشین خان و لاسک بە کۆپتەرەکە

**ژمارەیەک لە پێشمەرگەکان لەگەڵ خێزانەکانیان چوونە دۆڵە کۆگە و لەوێ ئامێری ڕادیۆکەیان دامەزراند و تاقیشیان کردەوە**

گەیەندرانە سنووری ئێران، لەوێشەوە خۆیان بەرەو شاری سەقز ڕۆیشتبوون، کە کەسانێکی زۆر لە خزمەکانی بنەماڵەی حەفید لەوێ دەژین، بەڵام کێشەیەکیان بۆ دروست ببوو پێش ڕۆشتنەکەیان (د.ئەدیب) ناسراو بە (د.هەڵۆ) ڕادیۆیەک و فەرهەنگێکی پزیشکی هێنابووە ماڵیان تاکو شارە لەگەڵ خۆی بۆی ڕزگار بکات. لە ڕێگەدا جانتاکەیان تەقی بوو. هەموو جل و بەرگ و کەل و پەلەکانی ناو جانتاکە بڵاوبووبوونەوە، لەو کێشمە کێشم و پەلە پەلیە ڕادیۆو فەرهەنگە پزیشکیەکە ون ببوون. دواتر (د.هەڵۆ) زۆر عاجز بوو. ناهەقیشی نەبوو چونکە ئەو فەرهەنگە پێویستی ڕۆژانەی دکتۆر بوو، لەلایەکی دیکەیشەوە شاراش گوناهی نەبوو. چونکە لەو پەلەپەل و نێو جەرگەی شەڕە هەر هێندەی توانی بوو، خۆی و کچە منداڵەکەی دەرباز بکات. دواتر (ئەو) ڕادیۆیەکی نوێی خۆی بە (کاک د.هەڵۆ)دا. بەڵام فەرهەنگەکەی قەرەبوو نەدەکرایەوە.

بۆ ئەو ڕۆژو ساڵانە ڕادیۆ لە بری تەلەفۆن، تەلەفزیۆن، مۆبایل و کۆمپیوتەر بوو. لەو شاخە ڕادیۆ تاکە ئامێری پێوەندی بوو بە جیهانەوە. بۆیە ئەوەی ڕادیۆیەکی باشی ببوایە وەکو ئەوە وابوو باشترین کۆمپیوتەری هەبێت.

\+ \+ \+

دوای سەد ڕۆژ بەرگری دوای دەیان شەهیدو بریندار هێزەکانی ڕژێمی عێراق زۆر هاتنە پێشەوەو مەترسی گەورە کەوتە سەر گیانی سەدان پێشمەرگە، بۆیە سەرکردایەتی (ی.ن.ک) بڕیاریدا دۆڵی جافایەتی چۆڵ بکات و بەرەو سنووری ئێران پاشەکشە بکات. سەعاتی (سفر)ی پاشەکشە دیاری کرا. دەزگای ڕاگەیاندن ئەوەی مابووەوە لەگەڵ خانووەکان، کتێبخانەکان، کە سەدان کتێبی بە نرخی تیادا بوو ئاگردران. ئاخر لەوە ناخۆشتر چییە بە دەستی خۆت نەوت و بەنزین بەسەر ماڵەکەی خۆتدا بڕێژی بە دەستی خۆت شخارتە داگیرسێنی و ماڵی خۆت بسووتێنی، بەڵام بیروباوەڕ و ڕێبازی سیاسیی، بڕوا و قەناعەتی ئەو سەردەمە، مەسەلەی نەتەوە و نیشتمان لە سەرەوەی هەموو شتێک بوو. ئەو ساڵانە مرۆڤەکان گیانی خۆیان و ماڵ و منداڵیان دەکردە قوربانی خاک و سەروەری گەل. بە هەزاران ژن و منداڵ و گەنج و پیر لە زیندانەکانی (ئەبو غرێب) و (فزێلیە) ئاخنرابوون. سەدان منداڵ لە زیندانەکان لە دایک بوون. ئەو ساڵانە کێ باکی پارەو ماڵ و منداڵی بوو، خەمی گەورە خەمی کوردستان بوو. خەمی هێنانەدی مافەڕەواکانمان بوو. بە دەگمەن ئەگینا کەسێک خاوەنی سەد دینار نەبوو. ژیانی ئەو ساڵانەی شۆڕش بخۆ و برۆ بوو.

\+ \+ \+

دەزگای ڕاگەیاندن، سەرجەم ئەو کادیر، ئەندازیار، نووسەر و پێشمەرگانەی، کە مابوون ئامادەی ڕۆیشتن بوون. لەگەڵ بانگی خۆراوابوون دوا ماڵاواییان لە بارەگا و ماڵ

و یادەوەری پێنج ساڵە کرد و بە حەسرەتەوە بەرەو گوندی چاڵاوە بەڕێکەوتن. ئەگەرچی ئەوە سێیەم گۆزە گۆز و گواستنەوە بوو لە هەوار، بەڵام گواستنەوەی ئەمجارەیان جیاواز بوو، چونکە ئاسۆی ئایندەی وەکو ڕابردوو، هاتنەوە نێو قوڵایی خاکی کوردستان نەبوو، بەڵکو دوورکەوتنەوە بوو لە زێد و خاک و نیشتمان بەرەو سنووری ئێران. هەر هێندە دوو سەد مەترێک لە بەرگەڵوو دوور کەوتنەوە زنجیرە تۆپێک ناوچەکەی هەژاند، هەموو خۆیان دایە پەنا تاشە بەردەکان. دوای چەند خولەکێک دەستیان بە ڕۆیشتن کردەوە.

گوندی (چاڵاوە) کە نزیکەی سی ماڵێکی تیا دەژیا. گوندێکی بێ ئاو بوو، لە بناری شاخی (ژیلوان) خەڵکەکەی بە مەڕومااڵت و گیا کیویلەکانی بەهاران دەژیان، بەڵام کاتێک ئەوان گەیشتنە نێو دێیەکە بۆنی خوێنی لێ دەهات. خامۆش، بێدەنگ نە باعە باعی کارژۆڵە و بزن و مەڕ، نە بۆڕەی جارانی مانگا. نە دەنگی زەڕینی کەر نە دەنگی کەڵەشێر و گارە گاڕی مریشک، هەر وەک بڵێی ئەم دێیە ساڵەهایە چۆڵ کراوە و کەسی تیا نەژیاوە. بۆیە جۆرێک ترسی لە دڵی ڕێبوارەکان دەچاند، نیشانەی ڕووداوو کارەساتی نەخوازارو بوو.

وردە وردە بە شاخە کورەکەی ژیلوان هەڵگەڕان. یەک بە دوای یەک، بە هۆی قورسی کۆڵە پشتەکانیان جارجارە پشوویەکیان دەدا. بلاچە و نرکەی تۆپی شەڕی عێراق-ئێران و هێرشی سوپاش بۆ سەر بارەگاکانی (ی.ن.ک) گوێی ئاسمانیان کەڕ کردبوو. هەندێک جاریش ڕووناکییەکەی یارمەتیدەر بوو بۆ خۆ پاراستن لە کۆسپ و هەڵدێر و گاشە بەردی شاخەکە. دوای دوو سەعات هەڵزنان بە شاخەکە گەیشتنە سەر کانیاوەکانی (سیرە مێرگ) لەوێ پشوویان دا، ئەو کانیاوە لە هاویناندا جێ هەواری ڕەوەندەکان بوو، دەیان خێزانیش هەر لەو شوێنە بارو بارخانەیان خستبوو پشویان دەدا.

ئەو پێشمەرگە و ماڵانەی پێش ئەوان گەیشتبوون، ئاگرێکی گەورەیان کردبووەوە. هەندێکیان بە دیارییەوە گرۆمۆڵەیان کردبوو و خۆیان گەرم دەکردەوە. هەندێکی دیشیان بە هۆی هیلاکی بە دەوری ئاگرەکەوە ڕاکشابوون. ئەوانیش، کە گەیشتن وەکو ئەوان بە هەمان جۆر دوور و نزیک بە دەوری ئاگرەکە دانیشتن. بە هۆی ئەوەی لە مەترسی ئابلوقەی سوپای دوژمن دەرباز ببوون. بۆیە هەتا شەبەقی لەوێ مانەوە. ئەو پشووە تەنیا بۆ حەسانەوەی ماندوبونی هەورازە کورەکەی (ژیلوان) بوو، ئەگینا نرکەی تۆپ نەیدەهێشت تەنیا بۆ ساتێکیش چاویان بچێتە خەو.

لەگەڵ شەبەقی، تاریک و ڕوونی بەیانی، خۆیان کۆکردەوە و بە ڕێکەوتنەوە. دیمەنی دڵڕفێنی ئەو کوێستانانە، گوڵە مێلاقە، حاجیلە و بەیبون لەگەڵ نەرمە بای ئەو بەیانیە بەنازەوە

**جارجارە کۆپتەری ئێرانی دەهاتە ناوچەکە بۆ کاروباری خۆیان. خوا وای ڕێکخست شاراو نەخشین خان و لاسک بە کۆپتەرەکە گەیەندرانە سنووری ئێران**

سەمایان دەکرد. دەنگی قاسپەی کەو و بولبولی کوێستانەکان لەگەڵ خوڕەی قەڵبەزی تاڤگەکان مرۆڤەکانی مەست دەکرد. بەڵام چونکە ئەوان دڵشکاو و دوور خراوەی زادەی خۆیان بوون، بۆیە وەکو جاران چێژیان لەو دیمەنانە نەدەبینی.

دوای سێ سەعاتێک ڕۆیشتن بەو باریکە ڕێ و هەوراز و نشێوانە گەیشتنە سەر کانیاوێکی دی بە ناوی (خەندەکە) لەوێ پشووێکی تریان دا. ئەو پێخۆرانەی لە کۆلە پشتەکانیان بوو دەریان هێنا، کە هەندێک نانی ڕەق و قووتووی پەنیر و گوێز بوو، بە ئاوی سازگاری کانیەکە قاوەڵتیان کرد. هەندێک دار و چلیکەشیان خستە سەر یەک و بە کتلیە ڕەشەکە چایەکیان لێنا، هەریەکە و پەرداخێک چایان خواردەوە. سەر لە نوێ کەوتنەوە ڕێ، دوای سەعاتێک ڕۆیشتن کەوتنە

نێو هێزەکانی پاسداران. بەڵام چ هێزێک هەموویان بێ جل و بەرگ، پاسداری وا بوو تەنیا دوو یەدەگی کلاشنکۆف یان (ژێ سێ)ی پێبوو، ئەوان سەریان سووڕمابوو لەو شەڕە، پۆشتەو پڕ چەکی ڕژێمی عێراق و بێ بەرگی پاسداران، کەچی ئەو شەڕەشیان دەکرد. بەبەر چاویانەوە پاسداری کوژراویان دەخستە نێو پیکابە سەربازییەکان و دەیان گواستنەوە بۆ پشتی بەرەکانی شەڕ.

نیوەڕۆ لایاندایە یەکێ لە ئۆردوگاکانی پاسداران، زۆر ڕێزیان لێگرتن و چەندین نان و قووتووی (معلب)یان دانێ لەگەڵ هەندێ (نۆشابە) ئیدی بە سکی تێرەوە بەڕێکەوتنەوە. بەرەبەری ئێوارە گەیشتنە گوندی (شاناخسێ) کاتێک گەیشتنە ئەوێ ژمارەیەکی زۆر لە پێشمەرگەی لێبوو، هەر یەکە و دەستەیەک لە شوێنێک دامەزران. لێپرسراوی ناوچەکەش بەهانایانەوە هات بۆ دامەزراندن.

(د. کەمال خۆشناو) بە ڕەچەڵەک لە میرەکانی قەزای شەقڵاوە بوو. بۆ خوێندن چووبووە وڵاتی (یۆگسلاڤیا)ی جاران. لەوێ دکتۆرای لە بواری کشتوکاڵ وەرگرتبوو، پێشتر ماوەیەک (ڕاگری کاروباری خوێندکاران) بوو لە زانکۆی سلێمانی. دوای هەڵگیرسانەوەی شۆڕشی نوێ پێوەندی بە شۆڕشەوە کردبوو. هەر لە گەنجێتییەوە دۆستی (مام جەلال) بوو. ڕێبازی سیاسیی ئەویشی پەسند کردبوو. ماوەی چەندین ساڵ ئەندامی (م.س) (ی.ن.ک) بوو. ماوەیەکیش لێپرسراوی مەڵبەندی هەولێر بوو لە شاخ، کە بارەگاکەی لە گوندی (بالیسان) بوو. ئەوساتەی ئەوانیش گەیشتنە شاناخسێ (د.کەمال) نوێنەری (ی.ن.ک) بوو لە ئێران. بارەگاکەی لە شاری (سەقز) بوو (د.کەمال) بە پیکاب خواردن و خواردنەوەی بۆ پێشمەرگەکان دەهێنا. نەخۆش و بریندارەکانیشی بۆ نەخۆشخانەکانی ئێران دەگواستەوەو چارەسەری دەکردن.

(بەکر فەتاح) گەنجێکی دەرچووی کولێژ بوو. لە ساڵەکانی شۆڕش ماوەیەک ڕابەری سیاسیی هێزەکانی شارباژێڕ بوو، لە شەڕەکان پەنجەیەکی سەقەت ببوو. هەر لە شارباژێڕ دڵی چوو بووە کچێک بە ناوی (کەژاڵ) کەژاڵ خان مامۆستا بوو. هەتا بڵێی کچێکی ڕێزدارو بە ورەو ئازابوو (بەکر فەتاح و کەژاڵ) هاوسەرگیرییان کردبوو هەر لە گوندی شاناخسێ ژوورێکیان وەکو ماڵ پێکەوەنابوو (ئەو) لەگەڵ چەند برادەرێک چوونە لایان و نیوەڕۆ خوانێکی باشیان خوارد.

دوو ڕۆژ دواتر کاتێک سەدان پێشمەرگە و خێزانی دۆڵی جافایەتی، شێنکایەتی و شارباژێر لە دەوروبەری گوندی (شاناخسێ) کۆبوونەوەو چاوەڕوانی دوا بڕیاری سەرکردایەتی (ی.ن.ک)یان دەکرد. سەرکردایەتی یەکێتی-ش لە گفتوگۆدا بوو لەگەڵ ڕژێمی ئێران بۆچوونە ناوەوەی خێزاندارەکان و دروستکردنی بارەگای پێشمەرگە لەسەر سنوورەکانی هەردوولا. لە پڕ ڕۆژێک چەند فڕۆکەیەکی مەرگ چێنی ڕژێمی عێراق لە ئاسمانی شاناخسێ دەرکەوتن. دیسان بێ بەزەییانە ڕق و کینەی کیمیاوییان بەسەر ئەو هەموو ژن و منداڵی پێشمەرگانەدا ڕشت ساتە وەختێکی دژوار ئەگەر خۆت بە چاوی خۆت نەتدیبێ نازانی چ ساتە وەختێکی ترسناک و مەرگ چین بوو. دووکەڵی شین بەری ئاسمان و زەوی ناوچەکەی داپۆشیبوو. پێشمەرگەو ژن و منداڵە دێهاتییەکان پێشتر ئاسودە لێی دانیشتبوون. هەرگیز چاوەڕوانی سەر لە نوێ تاوانێکی قەتل و عام نەبوون. بەڵام ئەوە ڕژێمی مەرگ چێنی فاشی بەعسییەکان بوو دەستیان لە هیچ کەسێک نەدەپاراست. هەر هێندەت دەدیت. خەڵکە و لەوێ کەوتووە. خەڵکەو بەرەو کانیی و ئاوەکەی ئەوێ ڕادەکات و دم و چاوی خۆی دەشوا. لەو کیمیابارانە چەندین پێشمەرگە و ژن و منداڵ بە ژەهری ئەو بۆردوومانە گیانیان لە دەست دا. ئێستەش کاتێک بیر لەو ساتە وەخت و ڕۆژانە دەکەیتەوە موچڕک بە هەموو گیانت دادێت. خوا هەڵناگرێ تیمی ئەمبولانسی ئێرانیش هاوکاری بەرکەوتووەکانیان کرد لە گواستنەوەیان بۆ نەخۆشخانەکانی ئێران.

\+ + +

چەند ڕۆژێک دواتر ئێران ڕێگەی بە خێزاندارەکان دا بچنە دیوی سنوور. پێشمەرگەکانیش لەسەر سنوورەکان بۆ خۆیان بارەگایان دروست کرد (ئەو) یش وەک هەر خێزاندارێک چووە دیوی ئێران و لە سەقز چووە نێو خێزانەکەی خۆی.

---

**• لێرە دووا بەشی کتێبی (شەو لە کیوان) تەواو دەبێت. ئەگەر تەمەن یار بێ ژیان و گوزەران و ئۆتاغی ئاوارەیی و ژیانی پەنا هەندەییش دەچێتە دوو توێی کتێبێکی تر.**

# وێستگەی دیوان

- (١) پرسیار (حەمە ڕەئوف کەرکووکی)
- دیوانی هەولێر (بۆنی کەبابی محەمەد کەبابچی کۆیی و تایەر تۆفیق)

نازم دڵبەند

- گۆشەی دیوان (ئاسیا تۆفیق وەهبی)

وەرگێڕانی نەوزاد عەلی ئەحمەد

- یەکەم (نەژاد عزیز سورمێ)

ئا: قەڵەندەر

- لە دەفتەری نەمریدا (عەبدولکەریم شێخانی)
- دیدارێکی بڵاونەکراوە عەبدولکەریم شێخانی

ئارام ساڵح

- لە دەفتەری نەمریدا (شوکر خەیات)
- سینەما فیلم (پیانۆ ژەنەکە)

ئا: پەروەر

- ساڵۆنی لاپەڕە (٩)

# (۱) پرسیار

# چیرۆکی گۆرانیی پەری چییە؟

من کاتێک ئاشنای ئەو شیعرە بووم ئەو دەمەی، کە بەدەنگی هونەرمەندانی کۆچکردوو مامۆستا کەریم کابان و مامۆستا حەمەجەزا بەشێوەی مەقام دەوترا، من زیاتر لەدەنگی کاک کەریمەوە، کە بەشێوەی مەقام دەیگوت، ئاشنا و شەیدای شیعرەکە بووم.

جارێکیان گوێبیستی گۆرانییەکی هونەرمەندی خوالێخۆشبوو عەلی عەزیز (ئەی شەوەکەی بێ تروسکەی دڵتەنگی) بووم، ئەویش زۆر سەرنجی ڕاکێشام و شەیدای شیعرەکەی بووم، ئەوە وایکرد بە بەدوای دیوانەکانی کاک جەمال شارباژێریدا بگەڕێم و شیعرەکانی بخوێنمەوە.

ناسینی من بۆ شاعیری گەورەی کۆچکردوو مامۆستا جەمال شارباژێری بۆ سەردەمی لاویەتیم لە شاری کەرکووک دەگەڕێتەوە، ئەودەمە من هەر سەرقاڵی شیعر خوێندنەوە بووم، زۆر شیعری کاک جەمال-یشم خوێندبوونەوە، دەتوانم بڵێم لەدوای ساڵی نەوەدەکان و دوو هەزارەکان، ئاشنایەتی تەواو لەگەڵیدا پەیداکرد.



ئەوکاتە من دوکانێکی بەرگدروویم لەبازاری خەفافەکان هەبوو، چەند جارێک هات بۆلام و چەند دیوانێکی خۆیشی پێشکەش کردم، کە ئەم شیعرەی (پەری)یشی تێدابوو، شیعرەکەم خوێندەوە گوتم ئەوان بەمەقام گوتویانە، بیرم کردەوە بەڵکو بتوانم میلۆدییەکی بۆ دروست بکەم و ئەمجارە بەشێوەی ئاواز بیڵێم.

لەگەڵ هونەرمەندی هاوڕێم کاک خەلیل عەبدوڵڵا، کە هونەرمەندێکی زۆر بەتوانایە شیعرەکەم پێیدا و گوتم حەزدەکەم تۆ ئاواز بۆ ئەو شیعرە دابنێیت، ماوەیەک لای بوو، دواتر توانی ئەو ئاوازە جوانەی بۆ دابنێت، موزیکەکەش هەر خۆی دایڕشت، دواتر تۆمارمان کرد.

سەبارەت بە چیرۆکی شیعری پەری، ئەویش ڕووداوێکی ڕاستەقینەیە، ئەوەندەی من بیستوومە نەک لە کاک جەمال خۆی، بەڵکو لەنێو خەڵکدا بیستوومە و خوێندوومەتەوەش، کاک جەمال شەیدای ئەو پەری-یە بووە دەتوانم بڵێم لەساڵانی هەرەتی لاویەتیان حەزیان لەیەکدی کردووە، بەڵام هەر زوو لەگەڵ بنەماڵەکەی تووشی کێشمەکێش بوونە، ئیدی بەداخەوە بۆ یەکدی نەبوونە و بە یەک نەگەیشتوونە، دواتر ئەو پەریخانە هاوسەرگیریی کردووە، بەڵام کاک جەمال شارباژێری، دیارە عیشقی بۆ ئەو پەری-یە هەر بەردەوام بووە، چەندین شیعری جوانیشی بۆ نووسیوە، ئەمەشیان، کە من لە ساڵی ٢٠١٠ کردوومەتە گۆرانیی یەکێکە لەو شیعرانەی، بۆ ئەوی نووسیوە.

***لە زۆر کەس وایە من ئیتر کەوا مەیلی پەری ناکەم***
***درۆیە تاکو من مابم لە ئەو خۆم بێ بەری ناکەم***
***هەزار حۆری و فریشتەی جوان بە چاوێکی پەری نادەم***
***بە دڵ گرتوومە تا مردن بە هیچ جۆرێ بەری نادەم***
***هەزار تانە و پلار بێت بۆم بە هیچ ناچێ بە خۆڕایی***
***درۆیە خۆشەویستی من بگاتە مەرگی کۆتایی***
***ئەگەرچی بێ وەفاش دەرچوو بەڵام من بێ وەفا نیم بۆی***
***لە باغی هەست و سینەمدا وەکو خۆی ماوە ڕەنگ و بۆی***
***بەهاری عومری لاویم و بەهەشتی بەختی یاریمە***
***گوڵی دەستی دەمی مەستی ژیانی هەرزەکاریمە***

**حەمە ڕەئوف کەرکووکی**

ئازم دلبەند

# بۆنی کەبابی محەمەد کەبابچی کۆیی و تایەر تۆفیق

هەموو سەربردە، گێڕانەوە و عیشق و یەکدی خۆشویستن تا دەگاتە بۆنی کەباب خۆشبوو، بەتەنێ بۆنەکەی هەر لەدوورەوە بڕی برسێتی تۆی دەشکاند، لەو گوندانەی دەشتی شەمامک، مرکیە، بەحرکە، ڕەشوان و مامخالان، هەر ئەو چێشتانەی پەستەکانیان دەگەیشتە (گەراجی تەنەکە) و لای حاجی باقی دارفرۆش لە شێخەڵلای نزیکی جادەی فیتەران ئەو خەڵکە دەشتەکییە دڵپاکانە مەنجەڵی ماست، پەنیر، تۆڵکە و کەنگریان بەکۆڵی دادەدا بەرەو ئەو دوکانانەی مەعمیلیان بوون، لەوێ کاکی دوکاندار بەراستگۆیی و دەستپاکییەوە بۆی ساغ دەکردنەوە، ئەوانیش پێویستیان بەهەرچی شتێکی وەکو (شەکر، چا، سابونی ڕەقی، پشیلە و ڕۆن... هتد) هەبوایە، دەیانخستەوە نێو ئەو تێرکەیەی سبەینێ شتەکانیان تێدا هێنابوو، لەگەڵ جامە بەتاڵەکان و پەڕۆ بەنەکانی سەر مەنجەڵە ماستەکان، کاتیش دەگەیشتە نوێژی نیوەڕۆیێ، ئینجا بۆ مزگەوتی شێخەللا و خانەقا و ئاڵتی بەرماغ-ی، کە لە نوێژیش تەواو دەبوون، ووردە ووردە، بەدوو بۆنی کەبابی دادەچوونە کەبابخانەی مەجید کەبابچی و عەبدوللا کەبابچی نزیکی چایخانەی سەید سەلیم-ی، هەندێکیش بۆ کەبابخانەی محەمەد کەبابچی لای دەلاڵخانەی نزیکی مزگەوتی خانەقایێ، لەوێ تێرووپڕ کەبابیان بە ماستاوە کوڵکنە دەخوارد، ئەو کاتیش کەبابێک چەند فلسێکی تێنەدەپەڕاند، بەلام ئەوانەی لەلای بەحرکە و ڕەشوان و مامخالان و زرارەتی دەهاتن، زیاتر بارگە و بنەیان لە جادەی تەیراوە دادەنا، دوای تەواو بوونیان لە مزگەوتی شێخ مەلا ڕەشید و حاجی عەبدوللا-ی نوێژەکانیان دەکرد و ڕوویان لە کەبابخانەکەی مام وسوی مەموند دەکرد، کە کەوتبووە بەرانبەر تەجنیدی کۆن، کە تەواویش دەبوون دەستیان بەسەر و سمێڵان دادێنا، هەتا بۆنی کەبابیان لێنەڕوا و کە چوونەوە گوندیش هەموو خەڵکی گوندی بزانن ڕەحمان لەهەولێرێ کەبابی خواردیە ئەوجا هاتیتەوە.

محەمەد کەبابچی کۆیی ناوی تەواوی محەمەد مستەفا عەلی-یە پیاوێکی باڵا بەرز، بەویقار، ئەهلی دانیشتن و گۆرانی و موزیک و دۆستی ڕۆحی هونەرمەند تایەر تۆفیق لەساڵی ١٩٢٠ لەشاری کۆیە لە دایکبووە، لەبنەڕەتەوە دەگەڕێنەوە بۆ عەشیرەتی زەرزا باوکی لەساڵی ١٩١٨ لە سەروبەندی شەڕی یەکەمی جیهانیی، لە ڕۆژهەلات، لە شاری شنۆ-وە


خوالێخۆشبوو محەمەد کەبابچی لە کەبابخانەکەیدا

هاتوونەتە ئێرە و لەشاری کۆیە گیرساونەتەوە، دوو خوشک و دوو برای بەناوەکانی مەحموود و عەلی هەبووە، هەر لەهەرەتی گەنجێتیەوە بۆ پەیداکردنی بژێوی ژیان چووەتە نێو کار و کەسابەت، لای وەستا حەمەدەمین گۆجەی کەبابچی بۆتە خەلفە. شارەزاییەکی تەواو لەکاری کەبابچێتی پەیدا دەکات و فێرە کەباب لێدان دەبێت، دوکانێکی تایبەت بەخۆی لەگەڕەکی (هەواوان) لەکۆیە کردەوە، لەدواییدا چووەتە مەیدانی سەرەوە لەنزیک دوکانەکەی وەستا ڕەسووڵ کەبابچی دوکانێکی کردووەتەوە، بەڵام لەساڵانی (١٩٥٤ - ١٩٥٥) بەهۆی کزبوونی ئیشوکاری کەبابخانە، چووەتە شاری ڕانیە، چونکە ئەوکات لەڕووی کەسابەتەوە، ئەوی شارێکی زیندوو بووە، بەهۆی ئەوەی، کە وێستگەی پشکنینی توتن-ی تێدابووە و جوتیارانی ئەو دەڤەرە بەبەردەوامی هاتوچۆیان پێداکردووە و بەرهەمی توتنیان هێناوە بۆ پشکنین، ئەمەشیان زۆری نەبردووە بەهۆی ئەوەی خاوخێزانەکەی لەوێ نەحەواونەتەوە و خۆیان بەغەریب زانیوە، دووبارە گەڕاونەتەوە شاری کۆیە ساڵی ١٩٥٧ جارێکی دی لە کۆیە بەرانبەر مزگەوتی جومعە دوکانێکی تازەی داناوە، بەڵام ئەمەشیان زۆری نەخایاندووە، دیسان لەساڵی ١٩٥٨ گەڕاوەتەوە ڕانیە و هەستی کردووە لەوێ کاری باشترە بۆیە لەوێ ماوەتەوە.

محەمەد کەبابچی کۆیی خاوەنی (١٠) منداڵ بووە (٧) کوڕ بەناوەکانی (ئەمیر، جهانگیر، جیهانبەخش، شێردڵ، نەهرۆ، مژدە، ڕزگار، (٣) کچیش بەناوەکانی (شادیە، ڤیان، ژیان) کە لەژیاندا ماون.

ئەم پیاوە هەمیشە کەسێکی قسەخۆش و خۆش مەشرەب و دەنگخۆش بووە، هەر لەساڵانی ١٩٤٠-ەوە هاوڕێی نزیکی هونەرمەند تایەر تۆفیق بووە، لەهەموو دانیشتن و گەشت و پیاسەکانیاندا پێکەوە بووینە و لاسایی گۆرانییەکانی ئەوی دەکردەوە، هەموو ئێوارانیش دەچوونە ڕەزی هۆمەر خوچان و کانیلە لەکۆیە لەگەڵ هاوڕێ دێرینەکانی خۆیان وەک مامە عەبدولڕەحمان ڕووتە، ساڵح قەساب و وەستا محەمەد قەساب، کە ناسراو بوو بە سەرەخۆرە) ئەمەش وایکردووە زۆرینەی ژیانی بەخۆشی و پێکەنینی هاوڕێیانە و گەشتوگوزار بەسەر بەرێت، بەبێ ئەوەی دابینکردنی بژێوی ماڵ و منداڵی فەرامۆش بکات.

محەمەد کەبابچی کۆیی ساڵی ١٩٦٦ بەیەکجاری ڕانیەی بەجێهێشتووەو ڕووی کردووەتە شاری هەولێر و لەبەرانبەر قەڵاتی هەولێرێ نزیک دەڵاڵخانە کەبابخانەیەکی بەناوی کەبابخانەی بەهار کردووەتەوە، هەر زووش نێوبانگی پەیدا کردووە، لەبیریشمە، کە لە چایخانەی مەچکۆ دەهاتیە ئەولایە دەیانگوت: ئەوە بۆنی کەبابی محەمەد کەبابچی هات.

لەگەڵ هاتنی بۆ هەولێر، دیسان بەدیداری هونەرمەند تایەر تۆفیق شادبۆوە، کە ئەودەم فەرمانبەر بوو لە موتەسەرفیەتی هەولێر، سەرلەنوێ وەکو جاران دانیشتنە تایبەتییەکانی خۆیانیان ڕێکخستەوە چ لەماڵی خۆیان و چ لە گەشتەکانیاندا بۆ هاوینەهەواری شەقڵاوە و پیرمام لەهەمووشی خۆشتر و مانەوە وەکو مێژوو، تۆمار کردنی ئەو گۆرانیانەن، کە لەلایەن هەردوو کوڕەکەی (ئەمیر و جیهانبەخش) لەسەر ڕیکۆردەری گروندیکی ئەڵمانی TK٢٠ و TK٣٠ پارێزراون و تا ئێستەش بڵاونەکراونەتەوە، کە زیاتر لە (١٠) سەعاتە.

محەمەد کەبابچی دوای ئەوەی بەهۆی لەدەستدانی نەهرۆ-ی کوڕی، کە موزیکژەنێکی بەتوانا بوو، لەکاتی گەڕانەوەی لە ڕۆژانی پرۆڤەکردندا لە (١٩٧٨/١٠/٢) لەلایەن چەند کەسێکی تاوانکاری سەر بەرژێم ڕێگەی لێگیراو جوانە مەرگیان کرد، وازی لەو کەیف و سەفایەی ڕابردووی هێنا و هەمیشە بەدەردی جەرگ سوتانەوە دەتلایەوە، لەگەڵ ئەوەشدا لەگەڵ شێردڵی کوڕی بەردەوام بوو لەکاری ڕۆژانەی کەبابچێتی، تا لە (٢٠٠٥/٩/١٥) ماڵاوایی لەهەمووان کرد. درووود بۆ ڕۆحی.


محەمەد کەبابچی و هونەرمەند تایەر تۆفیق

# ئاسیا تۆفیق وەهبی

گۆشەی دیوان

ئەو یەکێکە لە دامەزرێنەرە دیارەکانی یەکێتیی ژنانی عێراق، ئەمەش دوای ئەوە دامەزرا، کە حکومەتی عێراق وەفدێکی لە ژنان پێکهێنا بۆ قاهیرە، بە مەبەستی نوێنەرایەتیکردنی عێراق لە یەکەمین کۆنگرەی ژنانی عەرەبی، کە لە ١٣ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٣٩ سازکرا.

وەفدەکە لەم ژنانە پێکهاتبوو: سەبیحە یاسین هاشمی، مونیبە عەبدوللەتیف ثنیان، ڕەفیعە ئەلخەتیب، و ماری عەبدولمەسیح وەزیر.

ئاسیا تۆفیق وەهبی ساڵی ١٩٠١ لە بەغدا لە دایک بووە، باوکی بازرگانێک بوو، بە ناوی ڕەزا ئەلریزلی، برای دکتۆر عەبدولجەبار ئەلریزلی. دوای ئەوەی شوو بە سیاسەتمەدار و توێژەری کوردی ناسراوی عێراقی لیوا تۆفیق وەهبی دەکات، وەکو عورفێکی

نوێ نازناوی هاوسەرەکەی وەردەگرت.

ئاسیا لە قوتابخانەکانی بەغدا خوێندوویەتی، هەر لە سەرەتاوە لە کاروباری گشتی کاریکردووە، بەلام دوای ئەوەی هاوسەرگیریی لەگەڵ توێژەری گەورە تۆفیق وەهبی دەکات چالاکتر دەبێت و هانی دەدات لە کاری کۆمەلایەتی گشتی کاربکات بۆ خزمەتی ژنانی عێراق، کە ئەوکاتە بە دەمارگیریی و نەزانی دەورە درابوون.

پێش چلەکان چەندان کۆمەڵەی بچووکی ژنان هەبوون، پشتیوانیکی گشتییان نەبوو، تا یەکێتیی ژنانی عێراق بە سەرۆکایەتی ئاسیا وەهبی ساڵی ١٩٤٥ بە پشتیوانی دەوڵەت دامەزرا.

ئاسیا توانی سیاسییانە کار بکات، تا ژنانی عێراق تێکەلاو بە کایەی سیاسی ببن و مافی دەنگدانیان هەبێت بۆ هەڵبژاردنی ئەندامانی ئەنجومەن، هەروەها ساڵی ١٩٤٩ گۆڤاری یەکێتیی ژنانی دەرکردووە، کە پاش ماوەیەک داخرا، پاشان لە ساڵی ١٩٥٢ جارێکی دیکە دەستی بە دەرچوواندنی گۆڤارەکە کردۆتەوە، داوای داخوازییەکانی ژنانی عێراقی دەکرد، لە مافە کۆمەلایەتییەکانی میرات و ئازادیی و هەڵبژاردنی هاوبەشی ژیان، دژی چەوساندنەوەی ژنانی گوند بوو لە هاوسەرگیریی ژن بە ژن و هاوسەرگیریی لە جیاتی خوێن، بەلام ئەمەیان بە تەواوی نەهاتەدی، چونکە پێویستی بە ڕای گشتی هەبوو بۆ پشتیوانیکردن.

ئاسیا وەهبی لە لقەکانی یەکێتیی ژنان، لە لیواکانی عێراق، مەڵبەندی کۆمەلایەتی بۆ فێرکردنی دوورمان و هونەرەکانی چێشت لێنان کردەوە، هەروەها سەرپەرشتی هەڵمەتە تەندروستییەکانی لە شار و گوندەکانی عێراق دەکرد، ئەمە و موحازەرات و وەرزە ڕۆشنبیرییەکانیشی ڕێک دەخست.

ئاسیا وەهبی کاری بۆ ئەوەش دەکرد، لەگەڵ کۆمەڵە هاوشێوەکانی خۆیان لە دونیای عەرەبی و ولاتانی دیکە پەیوەندی ببەستێت، هەروەها تێدەکۆشا بۆ سەرکەوتنی مافی ژنان لە خاوەندارێتی ئازاد و میرات، ئەمەش دوای ئەوەی سیستەمی وەقفی الذری ڕەتکرایەوە (پێشتر میرات تەنیا بۆ پیاو بوو، بەمەرجێک نەیفرۆشێت) ئەو تێدەکۆشا بۆئەوەی لەکاتی جیابوونەوەی ژن و مێرددا بۆ کامەیان گونجاو بوو منداڵەکە بەخێوبکات.

خانم ئاسیا لە ساڵی ١٩٤٥دا سەرۆکایەتی لقی ژنانی، بۆ کۆمەڵەی پاراستنی منداڵان دەکرد، لەگەڵ چەند چالاکوانێکی وەک خۆی لە کاروباری کۆمەلایەتیدا (کۆمەڵەی پاراستنی دەردە کۆمەلایەتییەکانی) دامەزراند، بۆ خەباتکردن دژ بە نەزانی و هەژاریی و نەخۆشی، ئەمەش لە ڕێگەی کردنەوەی مەڵبەندەکانی نەهێشتنی نەخوێندەواری بۆ هەردوو ڕەگەزەکە، لە ڕێگەی کۆکردنەوەی کۆمەک بۆ یارمەتیدانی ئەوانەی لەژێر هێلی هەژارین، لەگەڵ چەندان چالاکی دیکە.

ئاسیا وەهبی ڕۆڵێکی کاریگەریی هەبووە لەسەر گۆڕەپانی عەرەبی و نێودەوڵەتی، لە کۆنگرەی یەکێتییەکانی ژنانی نێودەوڵەتی لە لاهور لە هیند ساڵی ١٩٥٣، لە لەندەن، ئەمریکا، دیمەشق و بەیروت چالاک بوو، ساڵی ١٩٥٣ کۆنگرەیەکی گەورەی بۆ ژنانی عەرەب لە بەغدا ڕێکخستووە.

سەرەڕای هەوڵە گەورەکانی خانم ئاسیا، ساڵی ١٩٥٨ چالاکییەکانی لە عێراق وەستا، ئەمەش دوای ئەوەی، کە یەکێتیی ژنان داخرا و ئەویش بۆ لەندەن سەفەری کرد، لەوێش لەسەر چالاکییە گشتییەکانی بەردەوام بوووە، تا ساڵی ١٩٨٥ کۆچی دوایی کردووە، لەسەر وەسیەتی خۆی تەرمەکەی بۆ بەغدا گوێزرایەوە و لە نزرگەی قادریە نێژرا- ڕەحمەتی خوای لێ بێت- ئەو بۆ ولاتەکەی ڕۆڵێکی پێشەنگی گێراوە.

**نووسینی: باسم عبدالحمید حمودي**

**وەرگێرانی: نەوزاد عەلی ئەحمەد**

**سەرچاوە: بين نهرين، جريدة ثقافية اسبوعية تصدرها شبكة الاعلام العراقي، العدد ٩٣، الخميس ٤ تشرين الاول ٢٠١٨، ص٢٢**




(یەکەم) گۆشەیەکی گۆڤاری دیوانە، تییدا هەرجارەی یەکەم بابەت، یان یەکەم کتێبی نووسەرێک، یان شاعیرێک، یان هونەرمەندێک دەخەینەڕوو، بە مەبەستی ئاشناکردنی خوێنەران بە سەرەتا و یەکەم بەرهەمیان

**ئا: قەڵەندەر**




**ئەم هۆنراوانە**

**خوێنەری خۆشەویست!**

لە رووی روخسار و هەڵبژاردنی بابەتی ئەم هۆنراوانەوە، من لەو باوەڕەدام، کە تا زیاتر هەڵگێڕ و وەرگێڕیان بکەم، هەر ناگەمە ئەو لووتکەیەی خۆم مەبەستمە! زیاتر لەمەش بە باوەڕی من چێژی وێنە ئەزەلیەکەشیان وون دەکەن، کە لە کات و شوێن و قۆناخی تایبەتی دا موعاناتیان دەگەڵ کراوە و هاتوونەتە بەر ڕووناکی بۆیە بڕیاری بڵاوکردنەوەیانم دان.

لە لایەکی ترەوە، هۆنراوەی دیکەشم، کە تا ئێستا لە گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا بڵاو کردوونەتەوە ئێستا دەگەڵ ئەم کۆمەڵەیەدا نین. گەر بلوێت لە دەرفەتێکی تردا بڵاویان دەکەمەوە. هەر لەو شیعرانەش کە چەنددانێک وەگەڵ ئەم کۆمەڵەیە کەوتوون سووکە دەسکاریەکی فۆرمەکانیانم کردووە. لە کۆتایی دا چاوەڕوانی تێبینی و ڕەخنە بە پێزەکانتانم و بژین.

نەژاد عزیز سورمێ

بەغدا/ تشرینی یەکەمی/ ١٩٧٦

*The Nights*
*I Can't Sleep!*

*Kurdish Poems*

*By*
*Nazhad Aziz Surme*
*1977*

---

* وەزارەتی ڕاگەیاندن ڕێگای لە چاپدانی داوە.
* لە کتێبخانەی نیشتمانی ـ بەغدا ـ ژمارە ( ١٧٧ ) ی ساڵی ١٩٧٧ی دراوەتێ.

داوای بە (٢٠٠) فلس

# عەبدولکەریم شێخانی:
# مام جەلال هەموو جار دەی گوت تۆ دەبی بە ئەدیب

ئارام سالح

– **سەرەتای ئاشنابوونت بە دونیای ئەدەب و نووسین دەگەڕێتەوە بۆ کەی و بە چی دەستت پێکرد؟**

+ لەو سەردەمەدا دوو گۆڤاری کوردی هەبوون (گەلاوێژ) کە مامۆستا برایم ئەحمەد دەری دەکرد و (دەنگی گێتی تازە) کە باڵیۆزخانەی بەریتانیا لە بەغدا دەری دەکرد و (تۆفیق وەهبی و حوسێن حوزنی) سەرپەرشتیان دەکرد. ڕۆژنامەی (ژین) لە سلێمانی دەردەچوو، من (گەلاوێژ) و (دەنگی گێتی تازە)م دەست دەکەوت، ئەمە حەزی خوێندنەوەی لا چەکەرە کردم. کە چوومە ناوەندی، خوێندن بە عەرەبی بوو و ئێمەش عەرەبیمان نەدەزانی، مامۆستاکان، تەنانەت کوردەکانیش هانیان دەدایین کتێبی عەرەبی بخوێنینەوە، تا فێری عەرەبی ببین.

من زۆرم دەخوێندەوە، بەتایبەتی ڕۆمان و چیرۆک، چونکە هەم ناوەڕۆکەکەیان تام و چێژی هەبوو، هەم شێوازەکەشیان ئاسان بوون. لە پۆلی دووەم ئیدی باش تێدەگەیشتم و مام جەلال-ی خوالێ خۆش بوو هەموو جار دەی گوت تۆ دەبی بە ئەدیب. یەکەم نووسینیشم لە ساڵی ١٩٥٤ بەناوی (خەونێکی بۆش) لە گۆڤاری (هەتاو) بڵاوکردۆتەوە.

کە لە پۆلی شەش بووم، کاک کەمال خورشید ئاغا حەوێزی من و حەوێز وەهاب-ی گرتە خۆ و فێری کوردایەتی کردین و لێرەدا ئارەزوویەکمان بۆ پەیدا بوو بۆ شیعر نووسین، من نازناوی شیعریم (غەمگین) بوو، حەوێزیش نازناوەکەی (هەژار) بوو، ئیدی شیعری منداڵانەمان دەگوت، من لە شیعرەکانی ئەو سەردەمەم تەنیا یەک دێڕ شیعرم لە بیرماوە:

بەسیە غەمگین بەس ببە غەمگین بە غەمگینی و بە غەم نابی ئازاد میلەتت، لاناچی کووکە و کارەسات.

(کووکە) واتا مسیبەت و ڕووداوی ناخۆش، کە لە سێی ناوەندی دەرچووم ساڵێک دەوامم نەکردو لە خوێندن دواکەوتم. دوو کچی مەسیحی موسڵاوی، خوشک بوون، ژوورێکی بەلاوەیان لە ماڵی دڵدار بەکرێ گرتبوو، کە هی خزمێکیان بوو (جولێت) و (کلێمانتین) جولێت حەزی بە خوێندنەوە دەکرد، بە پێچەوانەی خوشکەکەی، من و جولێت ڕکەبەری یەکترمان دەکرد بە نووسین، جارێکیان هەریەکەمان گوتارێکمان نووسی بەناوی (ایها الفلس) و گوتاری دووەم بەناوی (السفور والحجاب) ڕۆژانێکی خۆشبوون و پڕ جوانی، بەلام بەداخەوە دزێوی و ناشیرینی ئەمڕۆ زاڵن.

> **لە وەرگێڕان ڕەچاوی ئەوە دەکەم کە وشە بە وشە وەرنەگێڕم، بەڵکو بیخوێنمەوە و ماناکەی تێبگەم و بە کوردی چۆن قسەدەکەم، ئاوا وەریبگێڕم**

– **لە کەیەوە دەستت بە وەرگێڕان کردووە،**

**مەرجەکانی وەرگێڕانی سەرکەوتوو چین؟**

+ بۆ وەرگێڕان ئەگەر بڵێین (بەرچڤە) ڕەنگە لە گەلێک وشەی دیکە باشتر بێت کە ئەمڕۆ بە زۆر لە زمانی کوردی دە ئاخاڤن و نە گونجاویشن. لە پۆلی چواری ئامادەیی حەزم بە وەرگێڕان کردووە و ڕەنگە هەندێک شتم وەرگێڕا بێ، بەڵام نەم گەیاندوونەتە ئەنجام، چونکە نە کوردیەکەم زۆر باش بوو، نە عەرەبییەکەم، بەڵام دواتر هەوڵم داوە، کە دەست بە وەرگێڕان بکەم، چونکە هەردوو زمانەکەم تا ڕادەیەک باش بوو، لە وەرگێڕانیش ڕەچاوی ئەوەم دەکرد کە وشە بە وشە وەرنەگێڕم، بەڵکو بیخوێنمەوە و ماناکەی تێبگەم و بە کوردی چۆن قسەدەکەم، ئاوا



وەریبگێڕم، وەرگێڕ دەبێ هەردوو زمانەکە باش بزانێ، هەروەها ئەگەر ئیدیۆم و پەند هاتە پێش، ئەمانە وەرنەگێڕێت، بەڵکو هەوڵ بدات شێوەی ئەوان لە زمانی دووەم دا بدۆزێتەوە.

**- کامانەن ئەو بەرهەمانەی کە تا ئێستا وەرتگێڕاون و بە چاپت گەیاندوون؟**

+ جگە لە ڕۆمانی برا کوژی کازانزاکی و (ماسیە ڕەشە بچکۆلە) سەمەدی بیهرەنگی چەندان چیرۆکی نووسەری تورک عەزیز نەسینم لە فارسیەوە وەرگێڕاوە، هەروەها ڕۆمانێکی نووسەری عەرەب (محەمەد عبدالحلیم عبدالله) کە ماوەیەکە وەرمگێڕاوە، ئێستا لە چاپخانەیە و بەو ئومێدەی لەو نزیکانە تەواو ببێت و بکەوێتە کتێبخانەی کوردیەوە.

**- لەگەڵ کام لە ئەدیب و نووسەرانی شاری کۆیە هاوسەردەم بوویت، نزیکایەتی و تێکەڵاویت لەگەڵ کێهەیاندا زیاتر بووە؟**

+ بە دڵنیاییەوە پێت دەڵێم لەگەڵ زۆربەیان هاوسەردەم بووم، بەڵام هاوتەمەن نەبووم، بۆنموونە (دڵدار و دلزار)م لە نزیکەوە دەناسی، بەڵام هەردووکیان لەمن زۆر گەورەتربوون و هەروەها (عەونی، وردی، ڕۆستەم، عوسمان خۆشناو) و گەلێکی دیکەش. ئێستاش ئەدیب و نووسەر هەن هاوسەردەممن، بەڵام لە خۆم بچووکترن، هاوسەردەمەکانم (عبدالخالق علاء الدین و عبدالرزاق بیمار و عوسمان پشکۆ) بوون، خوا لێیان خۆشبێت.

**- بیرت لەوە نەکردۆتەوە کە بیرەوەریی و گەشتی ژیانی خۆت بنووسی؟**

+ بەڵێ، بیرم لێکردۆتەوە و هەندێکیشم نووسیوە و ناوبەناویش هەندێک شت لەو بیرەوەریانە لە (خرتکەو پرتکە) دەخزێنم و پێشتریش هەندێکم لێ بڵاوکردونەتەوە، بەڵام هەندێک جار گرفتم بۆ پەیدا دەبێ و دەستێ لێ هەڵدەگرم، خوا یاربێ هەر باری تەندروستیم باش بێ، تەواوکردنی بیرەوەریەکانم لە پێش

هەموو شتێکی دیکەوەن.

**- ڕەوتی ئەدەبی و ڕۆشنبیریی لە ئێستای شاری کۆیە چۆن هەڵدەسەنگێنیت؟**

+ من ناتوانم ڕەوشی ئەدەبی و ڕۆشنبیری کۆیە لە کوردستان و تەنانەت عێراقیش بە لای کەمەوە داببڕم، چونکە ئەوەی لە عێراق ڕوو دەدات لەم ڕووەوە لە هەموو شارێکی کوردستان، بەڕادەی کەم یان زۆر ڕوودەدات، بەڵام هەندێک شار دابەزینی ئاستی ڕۆشنبیرییان زیاتر پێوە دیارە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ گەلێک هۆکار، کە یەکێکیان زیاتر خۆ خەریک کردنە بە فەیسبووک و ئینتەرنێت، ئەمە جگە لەوەی، کە ئاستی خوێندەواریی خوێندکار و قوتابیانی ئەم سەردەمە بەڕادەیەک نزمە، دەتوانم بڵێم نازانن ناوی خۆیان بنووسن، بەداوای لێبووردنەوە، ئەم کەم زانینەش لە پرسیاران دەردەکەوێ کە لە فەیسبووک هەندێک کەس دەیکەن، پیاو ئارەقەی تەریق بوونەوە بە ڕووخساری دا دێتە خوارێ.

**- هیچ یادەوەریت لەگەڵ هونەرمەندانی مەقامبێژ (سێوە و مەلا ئەسعەد و تایەرتۆفیق) هەیە؟**

(سێوە)م نەدیوە گۆرانی بڵێ، بەڵام (مەلا ئەسعەد)م زۆر دیوە لە خوێندنەوەی مەولودان مەقامی گوتون و بۆ بەستەی ئەو مەقامانە سێ کەس بە زۆری بەشداریان دەکرد، چونکە ئەدای گوتنی بەستەکەیان باش بوو، ئەوانیش وەستا حەمەدەمینی کەبابچی (گۆجە) کاک قادر (قالە کەچەڵی شیکپۆش) فەراشی نفووس بوو، لەتیفاغا فەراشی تەجنید بوو، بەڵام سەبارەت بە کاکە تایەر، ئەو ئامۆزای باوکمە و خزمێکی نزیکی منە. بەڵام هەر هەموویان زۆر لەمن گەورەتر بوون بە تایبەتی سێوە، کە لە باوکیشم گەورەتر بوو.

**- زمانی ڕاگەیاندنی کوردی دوای ڕاپەڕین چۆن هەڵدەسەنگێنیت؟**

+ ئەوەی مایەی خەمبارییە تێکچوونی زمانی ڕاگەیاندن و ڕۆشنبیریی بە گشتی، من چەند جارێکی دیکەش گوتوومە، ئەو کەسانەی خۆیان خزاندە ئەو بووارانە، یان بەزۆر خزێنرانە ئەو شوێنانە بۆ پڕکردنەوەی نەبوونی کادری ڕاگەیاندن بوو، وەک فەرمانبەر، نەک وەک ڕاگەیەندکار و زمانزان، چونکە زۆری کەناڵی ڕاگەیاندن وای دەخواست، کە کادریان بۆ پەیداکەن، ئی خۆ مەکینەی کادر هەڵهێنان لەجیاتی جووجەڵە بەردەست نەبوو، لەبەرئەوە زۆر کەسی ناشایستە و نەزان هاتنە ناو بوارەکە، بە تایبەتیش هەندێک لە دەرچوانی کۆلێژی ئادابی کوردی کە بەداخەوە هەموو شتێکیان دەزانی، کوردی نەبێ، ئیدی جێی خۆیان لەو کەناڵانەدا کردەووە، بەتایبەتی تیڤییەکان و هەندێکیان بەهۆی ڕێکخستنی حزبەوە دەسەڵاتیشیان پەیداکرد و سەرئەنجام بوونە میری سەربڕ و تەنانەت ئەکادیمیای کوردیشیان هەڵپەسارد، قوڕبەسەرییەکە لەوەدایە، کە زمانی کوردییان تێک دا و ئەوەی بەدڵیان نەبوو گۆڕییان و شتی نافرەجا و ناشیرینیان هێنایە کایەوە، کە تەنیا هەر خۆیان بەکاری دێنن، دەشیانەوێ نووسەران ناچاربکەن داهێنانە ڕووخسار تێکچووەکانی ئەوان بەکاربێت. من بەش بە حاڵی خۆم، خەڵکی زۆری دیکەش لەم ڕەوشە تێکدەرە نارازین، بەڵام دەسەڵاتی نەزان پشتگیرییان دەکات.

> (دڵدار و دڵزار)م لە نزیکەوە دەناسی، بەڵام هەردووکیان لەمن زۆر گەورەتربوون

**- لەم دوایانەدا چەند دەقێکی شیعری شاعیرانی عەرەبت وەرگێڕا بۆ کوردی، تا چەند خۆت بەسەرکەوتوو دەزانیت لە وەرگێڕانی ئەو دەقانەدا؟**

+ بەڵێ زۆرم وەرگێڕاوە، هەر شیعرێکی عەرەبییم بەدڵ بووبێ کردوومە بە کوردی، چەند کۆپلەیەکی (الطلاسم، لست أدري)ی (ئیلیا أبو ماضي)ی، چەند کۆپلەیەکی (أين حقي)ی شاعیر (محمد صالح بحر العلوم، الأطلال) دوو چامەی لامەرتینی فەرەنسەیی، کە بە پەخشان کرابوون بە عەرەبی و گەلێکی دیکەش، کە خوێنەران لێیان ڕازین.



# پیانۆ ژەنەکە

ئامادەکردنی: زەردەشت نەوزاد

ڕۆمان پۆلۆنسکی دەرهێنەری فیلمەکەیە. چیرۆکی فیلمەکەش لە ڕوداوێکی ڕاستەقینە وەریگیراوە، باس لە ژەنیارێکی پیانۆ دەکات بەناوی سپیلمان لە سەردەمی کۆمەڵکوژی جووەکان لەلایەن نازییەکان لە پۆڵەندا.

سپلیمان دوای کۆتایی هاتنی جەنگ نووسویەتی، کە ژەنیارێکی کلاسیکی پیانۆی بووە، لەگەڵ خێزانەکەی لە شاری وارسۆی پۆڵەندا دەژین، فیلمەکە باس لە ڕزگاربوونی سپیلمان دەکات، لە دەستی نازییەکان و کۆمەڵکوژیی.

دەرهێنەر ڕۆمان پۆلۆنسکی خۆی یەکێک بووە لە ڕزگاربووانی کۆمەڵکوژیەکە، بەیارمەتی باوکی توانییویەتی لە کەمپی گیراوەکان ڕابکات و تا کۆتایی هاتنی جەنگ بە تەنیا لە شەقامەکانی وارسۆ گوزەر بکا، بەڵام باوکی ڕزگاری نەبوو، ئەوەی، کە فیلمەکە نیشانمان دەدات لە سەرەتای فیلمەکە سپیلمان دەبینین، خەریکی ژەنینی شۆبانە لە ڕادیۆی وارسۆ، لەوکاتەدا یەکەم بۆمبی ئەڵمانییەکان بەر ئەوێ دەکەوێت، بەڵام سپلیمان بە متمانە بەخۆبوونێکی زۆرەوە خەریکی ژەنینەکەی دەبێت و ناوەستێت، تا بۆمبەکە بەر ڕادیۆکە دەکەوێت.

هەر لە دەست پێکەوە ژیانی خێزانی سپیلمان و کۆمەڵگەی جووەکان گۆڕانیان بەسەردا دێت، قۆناغەکانی ژیانی ئەوانمان نیشان دەدا، دوای سەرکەوتنی نازییەکان لە داگیرکردنی پۆڵەندا، دوای ماوەیەک لە بەسەر بردنی ژیانێکی زۆر ناخۆش، دەسەڵاتدارانی نازی بڕیار دەدەن هەموو جووەکان لە شوێنێکی تایبەت کۆبکەنەوە، بە ئامانجی کۆمەڵکوژ کردنیان، بە ڕێگەی سوتاندن.

ژمارەیان سەرو ملیۆنێک جوو دەبێت، بەر لە سواربوونی سپیلمان بۆ سەر ئەم شەمەندەفەرەی، کە جووەنیان پێی دەگواستەوە، بە یارمەتی کەسێکی نزیکی خۆی توانی ڕزگاری ببێت، کە تاکە کەس بوو لەنێو خێزانەکەی توانیویەتی ڕزگاری ببێت.

دوای ئەوە دووبارە زنجیرەیەک ڕووداوی ناخۆش بەسەر سپلیمان دێت، یەکێک لەو شتانەی فیلمەکە نیشانمان دەدات، پشت تێکردی هەندێک لە جووەکانە لە خەڵکی خۆیان، لە کاتێکدا زۆرێک لەوانەی کە مەسیحی بوون، یاخود جوو نەبوون، لە مرۆڤایەتی خۆیان نەوەستان و دەستی یارمەتیان بۆ جووەکان درێژ دەکرد، لەو کاتەدا یارمەتی دانی جووەکان سزاکەی مردن بوو.

فیلمەکە لە ڕوی داهات و خەڵات سەرکەوتنێکی چاک بەدەست هینا. توانی ببێتە براوەی خەڵاتی چلە خورمای ڤیستیڤاڵی کان، ئەکتەر ئەدریان برۆدی، کە ڕۆڵی کەسایەتی سپێلمانی دەگێڕا توانی ببێتە براوەی خەڵاتی ئۆسکار بۆ باشترین ئەکتەر. بووە براوەی خەڵاتی باشترین دەرهێنەر و باشترین سیناریۆ، پاڵێوراوی چوار خەڵاتی دیکەی ئۆسکار. توانی ببێتە براوەی خەڵاتی بافتا بۆ باشترین ئەکتەر و دەرهێنەر. توانی ببێتە براوەی خەڵاتی سیزاری فەرەنسی، بەبێ ئەوەی یەک وشەی فەرەنسی لە فیلمەکەدا هەبێت.

ئەم فیلمە توانی بچێتە نێو لیستی بی بی سی بۆ باشترین سەد فیلمی سەدەی بیست و یەک. ئەکتەر ئەدریان برۆدی توانی ١٤ کیلۆگرام لە کێشی دابەزێنێت بۆ باشتر گێڕانی ڕۆڵەکەی. توانیشی خۆی فێری ژەنینی پیانۆ بکات.

فیلمەکە لە قۆناغەکانی بەر لە بەرهەم هێنانی دابوو کاتێک سپلیمان کۆچی دوایی کرد.



# سالۆنی لاپەڕە (٩)

ئا: ڕەوەست نەوزاد

**لە درێژەی کۆڕەکانیدا سالۆنی لاپەڕە ٩ی ناوەندی هەولێری یەکێتیی نیشتمانیی کوردسان لە ماوی ٢٠٢٣/٧/٢٩ تا ٢٠٢٣/٨/١٩ ئەو کۆڕانەی ڕێکخست:**

## ٢٠٢٣/٧/٢٩




مەڕاسیمی ناساندن و دابەشکردنی کتێبی ( ڕاگەینراوی ڕۆژنامەوانیی، توێژینەوەیەکی زانستییە، تایبەت بە هونەرەکانی نووسینی ڕاگەیەنراوی ڕۆژنامەوانیی) لە نووسینی مەسعوودی مەلا هەمزە

## ٢٠٢٣/٨/٥

کۆڕێک بۆ شێروان عەولا خورشید بەڕێوەبەری گشتیی ڕاگەیاندن و چاپ و بڵاوکردنەوە لە وەزارەتی ڕۆشنبیریی و لاوان بە ناوونیشانی (ڕێنمایی ژمارە ١ـی ساڵی ٢٠٢٣ـی وەزارەتی ڕۆشنبیریی و لاوان، تایبەت بە کاری میدیایی لە هەرێمی کوردستان)

## ٢٠٢٣/٨/١٢



جوانە

مەڕاسیمی ناساندن و دابەشکردنی کتێبی (چیرۆکی جوانە) لە نووسینی  خاتوو کنیر جەمیل

## ٢٠٢٣/٨/١٩






کۆڕێک بۆ تێکۆشەری دێرین (سەلاح شێخ شەرەف)  لە بارەی کتێبی (بیرەوەریی ژنە جولەکەیەکی کۆیی)

# ئایا فەرهاد پیربالْ هیچی پێدەکرێت بۆ گۆڕینی کۆمەڵگە؟

شوان عوسمان

کـۆمـەڵـگـەی کـوردیـی لـە قـەیـرانـی بیرکردنەوە و ڕۆشنبیریی دایە، کێشەی لەگەڵ ئەو دەسەلات و پارە و سیاسەتە سەقەتە هەیە، ئەوەی ئەو هەلومەرجە نەخوازیار و ناویستە بەرەو شوێنێکی سەلامەت و تەندروست باشدا دەبات؟ ڕۆشنبیریی و گۆڕانی هۆشمەندی تاک و بە کۆمەڵی بواری ڕۆشنبیرییە، نەک سیاسەت و پارە و دەسەڵات.

بەرلە هەموو شتێک دەبێت بزانین ڕۆشنبیر کێیە، یان پێناسەی ڕۆشنبیریی چییە؟

ڕۆشنبیر ئەو کەسەیە، کە بەردەوام لە فێربون و گەڕان و گۆڕان دابێت، ڕۆشنبیر نابێت وەکو خەڵکی سادە بیربکاتەوە ،بەڵکو خەڵک دەبێت چاو لەو بکەن و لەو فێر بن، ڕۆشنبیر نابێت پاشکۆی هیچ کەس و خەڵک و هۆشمەندییەکی لە خۆی دواکەوتووتر بێت، جا دەتوانێت شەڕ بۆ ئازادیی و ئازادیی خۆی بکات، کەسێک کە خۆی ئازاد نەکردبێت، چۆن دەتوانێت لە بیرکردنەوەی نا ئازاد و کۆنەخواز سەربەخۆ بێت، یان جێگەی متمانەی خەڵکی ناسەربەخۆ بێت.

فەرهاد ڕاستە نووسەرێکە جیاواز و ماندووە، نوسەر و مامۆستایەکی بەهرەدارە، بەڵام ئەو کەسە نییە، کە بتوانێت کۆمەڵگە بەرەو ئاقارێکی تەندروست و سەربەخۆ و باشتر لە ئێستە ببات.



لـەبـەرئـەوەی ئـەو خـۆی وابـەسـتـەیـە بـە ناسنامەیەکی کـۆنـەخـواز و هۆشمەندیەکی چەقبەستووی سیاسیی و کۆمەلایەتی نێو کۆمەڵگە، کە ڕێگەی لە هەموو شێوازێکی گۆڕان و گەشە و بەرەو پێشچونێک گرتووە. ئەو هەرجارێک شتێک دەکا و شتێک دەڵێت، ستایشێکە بۆ دەسەلات و فرەوانخوازی کەسێتییەکان ئەوانەی بوونەتە هێزێک و بەربەستێکی نائاسایی لەبەردەم پێشکەوتنی کۆمەڵگەی کوردیی، لە قازانجی ئەوانیش قسە دەکات.

ناسەربەخۆ بوونی فەرهاد و خۆ تێکەڵاوکردن و خۆبەستنەوەی بە هەندێک بـەرژەوەنـدی نـادروسـت و کـەسێتی نـەخـوازراو، سیمای ئازادخوازیی و ڕۆشنبیریەتی زیاتر لێ دووردەکاتـەوە، وابەستە و بە کۆیلەبوونی ناهۆشمەندییەکەی زیاتر لێ تۆخ دەکاتەوە. ناسنامەی ڕۆشنبیریی و پێشکەوتنخوازیی لە فەرهاد دەستێنێتەوە، جا با فەلسەفەی هەبێت و فەیلەسووفیش بێت.

زانـا و ڕوونـاکـبـیـر، دەبـێـت بـەر لـە کـەسـە ئـاسـاییـەکـان، خـاوەنـی بیرکردنەوەیەکی ڕووناک بێت، چونکە باش بیرکردنەوە، ژیانی ئازادیی و تێزەکانی باشتر دەکات.

فەرهاد لە ڕووی بیرکردنەوە و ڕوانینی دوور و نزیک کەسێکی تەندروست باش نییە، بۆیە چۆن دەتوانێت گۆڕانکاریی گەورە و پێویست بکات؟

فەرهاد وەکو هەولێرییەک، یان وەکو مامۆستا و نوسەرێکی ڕۆشنبیر چی پێ دەکرێت؟

پێموایە تا بە شێوازە کۆنەکەی هەڵسوکەوت بکات هیچی پێناکرێت. باشترین شتیش ئەوەیە خۆی بگۆڕێت، ئینجا بیر لە گۆڕانکاریی بکاتەوە، ئەو تا ئێستە وەک کەسێکی ئازاد نەناسراوە، خۆی ئەو پاشاگەردانییەی بەسەر خۆیدا هێناوە، نەک دەسەلات، بۆیە بەر لە هەر شتێک دەبێت خۆی ئازاد بکات.

فەرهاد بەرلەوەی قوربانی هیچ حزب و دەسەلاتێک بێت، ئەو خۆی کردووەتە قوربانی بەرژەوەندییە تایبەتەکانی، تا ئێستەش شتێکی نەگوتووە، کە ئاماژە بێت بۆ خۆ گۆڕین، ئەو گەمە بە سۆزی خەڵک و نارەزایەتییەکان دەکات، ئەو هەرگیز ناتوانێت بەو شێوە کۆنە، هیچ خزمەتێک بە ئازادیی و ئەدەب و ڕۆشنبیریی و خەڵک بکات، کۆمەڵگەی کوردیی ڕۆشنبیرییەکی تەندروست باش و ساخ و سەلامەت و سەربەخۆی گەرەکە، نەک شتێک بکات لە قازانج و هێشتنەوەی ڕەوتی کۆن و متمانەی دەسەلاتی کۆنەخوازدا بێت.

• **سوپاس بۆ کاک سمکۆ عەبدولکەریم و نوسینەکەی ئەو نوسینەی لەلا دروست کردم.**

# فۆتۆچیرۆک ژنە چاو سەوزەکە




سالّی ١٩٨٤ (ستیف ماکوری)
وێنەگری ئەمریکی لە گۆڤاری ناشیونال
جوگرافیک چووە پاکستان، بۆ ئەوەی لە ڕێگەی وێنەوە،
ئەو ململانێ و شەڕەی ئەودەمی نێوان شۆرشگێرانی ئەفغانیی و
یەکێتی سۆڤیەت بگوازێتەوە.
لە کاتی سەردانی کردنی بۆ یەکێ لە چادرگەکانی پەنابەرانی ئەفغانیی لە باکوری پاکستان، کچێکی بچکۆلانە سەرنجی ڕادەکێشێت، کە تەمەنی نزیکەی ١٤ سالّێک دەبوو، باوکی بە هۆی بۆردومانێکی فرۆکەکانی سۆڤیەت بۆ سەر گوندە بچووکەکەیان کوژرا بوو، بە شێوەیەکی هاکەزایی کچە بچکۆلانەکە پێدەلّێ: وێنەیەکم دەگریت؟ ستیف بە خەیالّیدا نەهاتووە وێنەی ئەم کچە جیاواز دەبێت لە هەموو ئەو شتانەی، کە وێنەی گرتوون.
دوای بلاّوکردنەوەی لە بەرگی گۆڤارەکەی ناشیونال جوگرافیک لە سالّی ١٩٨٥ بە شێوەیەک لە ناوەندەکانی ڕاگەیاندن بە کچە ئەفغانییەکە ناسرا.
بە درێژایی ١٧ سالّ، ناوی ئەم کچە بە نەناسراوی مایەوە، تا ئەو ڕۆژەی تەلەفزیونی ناشیونال جیوگرافیک لە مانگی (ینایر)ی سالّی ٢٠٠٢ بڕیاریدا جارێکی دیکە ستیف بنێرێتەوە ئەوێ، بۆ بەدواداگەڕانی ئەو کچە چاو سەوزە بەمەبەستی زانین و ئاگاداربوون لەوەی ڕووداوەکانی ئەفغانستان چیان بەسەر هێناوە.
دەستیان بە گەڕان کرد بەنێو دانیشتواندا بۆ ناسینەوەی خاوەنی ئەم وێنەیە، هاولاّتییەک پێیان ڕادەگەیێنێ ئەوە (شربات گۆلا)یە لە سالّی ١٩٩٢-وە گەڕاوەتەوە گوندەکەی خۆی، چوونە گوندە بچووکەکەی و گەیشتنە ئەو ژنە، کە مێردی کردووە و خاوەنی سێ کچە، ڕوخساری بە هەمان کچە بچووکەکە دەچێت، ستیف ماکوری دەلّێ: کە بینیم بە ڕوونی دیار بوو هەمان کچ بوو، دوای ئەوەی ئەم ژنە وێنەکەی خۆی دەبینێ گوتی: پێشتر ئەم وێنەیەم نەبینیوە، بەلاّم بە دلّنیایەوە ئەمە وێنەی منە.

**سمکۆ**

# DÎWAN

Govarêkî Manganey Edebî w Roşinbîrî Giştiye - Nawendî Hewlêri Mektebî Rageyandinî Y.N.K Derîdekat
Jimare (27) – Gelawêjî 2723




دەستکردی هونەرمەند
**گرفتار کاکەیی**